# یورگن تۆدنهۆفەر

لە فارسییەوە: ئەحمەد تەها نارێنی

# دە ڕۆژ لەگەڵ داعش

## لەناو دەوڵەتی ئیسلامیی





یورگن تۆدنهۆفەر



# دە ڕۆژ لەگەڵ داعش

# لەناو دەوڵەتی ئیسلامیی





دەزگای رۆشنبیریی جەمال عیرفان ٢٠١٧

بەڕێوەبەری دەزگا: سیروان حەمەسەعید

**ناوی کتێب: دە ڕۆژ لەگەڵ داعش لەناو دەوڵەتی ئیسلامیی**

**نووسینی: یورگن تۆدنهۆفەر**

**لە فارسییەوە: ئەحمەد تەها نارێنی**

**دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی**

**دیزاینی ناوەوە: ئومێد محەمەد**

**چاپی یەکەم: ٢٠١٧**

**تیراژ: ١٠٠٠دانە**

**نرخ: ٧٠٠٠ دینار**

**چاپ: چاپخانەی پیرەمێرد**

**لەبەڕێوەبەرێتی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی ( ١٥٧٢ )ی ساڵی 2016 پێدراوە**

Tel: 0533202936 07502216705

email: jamalerfan99@gmail.com

facebook: Jamal Erfan's Library

www. jamalerfan.com

ناونیشان: سلێمانی - کاسۆ مۆڵ - بەرامبەر مزگەوتی گەورە - نهۆمی چوارەم

**سەرچاوەی وەرگێڕانی ئەم کتێبە:**

ده روز با داعش –از درون دولت اسلامی-يورگن تودنهوفر-
برگردان:علی عبداللهی-زهرا معين الدين، نشر كتاب كوله پشتی،
چاپ دوم/ ١٣٩٤

## ناوەرۆک


پێشەکیی وەرگێڕ.......... ٧

**بەشی یەکەم**
لەدایکبوونی دەوڵەتی ئیسلامیی (داعش).......... ١١

**بەشی دووەم**
ئامانجەکانی ڕۆژئاوا.......... ٢١

**بەشی سێیەم**
(گەڕان بەدوای حەقیقەتدا).......... ٤١

**بەشی چوارەم**
ڕۆیشتن بەرەو سەنگەری داعش.......... ٤٧

**بەشی پێنجەم**
چات لەگەڵ تیرۆریزم.......... ٥٧

**بەشی شەشەم**
دایکی ئەبوقەتادەی جیهادی.......... ١٤٣

**بەشی حەوتەم**
ڕێککەوتن و بەدیهاتنی سەفەرەکە.......... ١٥١

**بەشی هەشتەم**
سەفەر بۆ قەڵەمڕەوی "دەوڵەتی ئیسلامیی" /داعش/.......... ١٨٣

**بەشی نۆیەم**
نامەیەکی کراوە بۆ خەلیفەی دەوڵەتی ئیسلامیی.......... ٣١١

**بەشی دەیەم**
دواوتە بۆ جۆن جیهادیی.......... ٣٢٣

**ڕوونکردنەوەی وێنە و بەڵگەنامەکان**.......... ٣٢٧

## پێشەکیی وەرگێڕ

ئەم کتێبەی بەردەستتان یەکێکە لە کتێبە بابەتییەکانی ئەم چەند ساڵەی دوایی کە بە ویژدانەوە لەبارەی داعش و پەیوەندییەکانی ڕۆژئاوا بە جیهانی ئیسلامییەوە نووسراوە. هەر ئەمەش وایکرد ببێتە یەکێك لە پڕفرۆشترین کتێبەکانی ئەڵمانیا لە دوای بەرواری دەرچوونییەوە .

یورگن تۆدنهۆفەر [1] نووسەری ئەم کتێبە، ڕۆژنامەنووسێکی ئەڵمانییە، لە ١٢ـی نۆڤەمبەری ١٩٤٠ لە شاری ئوفنبرگی ویلایەتی بادن فرتربنرگی ئەڵمانیا لەدایك بووە. باوکی لە دادگا قازی بووە و خۆشی خوێندکاری بەشی یاسا بووە، ئەو لە زانکۆکانی میونیخ وبیون و فرایبرگ لە ئەڵمانیا و پاریس لە فەرەنسا وانەی خوێندووە، لە ساڵی ١٩٦٩ لە زانکۆی فرایبرگ بڕوانامەی دکتۆرای بەدەست هێناوە، هەروەها لە ساڵی ١٩٨٧ کاری ڕۆژنامەوانی لە بڵاوکراوەی (بوردا) دەست پێکردووە و پێشتر وەکوو نوێنەری پەرلەمان بەناوی حیزبی دیموکراتی مەسیحییەوە سەرقاڵی ئیشکردن بووە دەربارەی بابەتەکانی گەشەپێدان و چاودێریی چەکدارکردنی لاوان و نەوجەوانان .

تۆدنهۆفەر یەکێکە لە ڕۆژنامەنووسە دیارەکانی جیهانی ڕۆژئاوا، کە زۆر ڕاستگۆیانە و بەویژدانەوە باس لە کێشەکانی نێوان جیهانی ئیسلام و ڕۆژئاوا دەکات، بە دیدێکی میانڕەو و بابەتییەوە لە کێشەکان دەکۆڵێتەوە، یەکێکە لەو ڕۆژنامەنووسانەی کە لە جیهانی ئیسلامدا زۆر ناوبانگی هەیە، بەتایبەت بەهۆی نووسینەکانییەوە دەربارەی کێشە گەورە نێودەوڵەتییەکان. ئەو بۆ نووسینی بابەتەکانی سەردانی شوێنی ڕووداوەکان دەکات و لەگەڵ ئەو کەسانە قسە دەکات، کە لایەنێکی سەرەکیی کێشەکەن، ناویان لێ دەنێت (لایەنەکەی تر). ئەو بۆ سەلماندنی بۆچوونەکانی پێی خۆشە گوێ لە بۆچوونەکانی هەردوو لایەنی ناکۆك ڕابگرێت و دواتر باس لە کێشەکان بکات. هۆفەر بۆ قسەکردن لەگەڵ گرووپە توندڕەوەکان سەردانی زۆرێك لە وڵاتەکانی کردووە، لەوانە

---

1-JURGEN TODENHOFER

سەردانی جەزائیر و ئێراق و سووریا و ئەفغانستان و مۆزەمبیق و لیبیا و... هەروەها لەگەڵ ئەو گرووپانەدا گفتوگۆی کردووە و هەوڵی داوە تاڕادەیەك ئاشتەوایی لەنێوان هەردوولایەنی ناکۆك بخوڵقێنێت، تا لە ڕێگەی دانووستانەوە کێشەکانیان چارەسەر بکەن، چونکە ئەو پێی وایە پەنا بردنە بەر شەڕکردن، ماڵوێرانی و کاولکاریی زۆر بەدوای خۆیدا دەهێنێت، هەروەها لە چەند ڕوانگەیەکیشەوە ڕەخنەی توند ئاڕاستەی سەرانی ڕۆژئاوا دەکات لەبەر هەڵوێست و لوتبەرزی و بەرژەوەندخوازیی ئابووری و ستراتیژییان، بە تایبەت ئەمریکا لەبەرانبەر جیهانی ئیسلامی دا. هەربۆیە ئەم نووسەرە چەند جارێك لە ڕۆژئاوا ڕووبەڕووی تانەوتەشەر و هەڕەشە بووەتەوە، چەندان نازناو و ناوناتۆرەی خراپیان لێ ناوە، لەوانە: خیانەتکاری شارستانییەتی ڕۆژئاوا، ئەندامی ترسناك، دۆستی دیکتاتۆرەکان، دۆستی بەغدادی و... بڕێکی تر.

تۆدنهۆفەر خاوەنی چەند بەرهەمێکی شاکارە، کە بەداخەوە هیچیان وەرنەگێڕدراونەتە سەر زمانی شیرینی کوردی، هەر بۆیەش خوێنەرانی کورد لە نووسینە شیرینەکانی ئەم پیاوە بێبەشن. هۆفەر خاوەنی ئەم بەرهەمانەیە: (بۆچی دەکوژی زەید؟)، (کێ بەسەر تانیا و عەبدولدا دەگری)، (ئاندی و مەروە.... دوو منداڵ کە جەنگ کۆی کردنەوە)، (تارماییەکانی دژی تیرۆر)، لەم چوار کتێبەدا نووسەر باس لە جەنگ و وێرانکارییەکانی ئەمریکا دەکات لە ناوچە عەرەبی و ئیسلامییەکان، هەروەها لە کتێبی یەکەمدا باسی گەنجێکی ئێراقی دەکات کە بەهۆی چەند فاکتەر و پاڵنەرێکەوە چووەتە نێو یەکێك لە گروپە توندڕەوە ئێراقییەکانەوە. کتێبەکەی ئاندیش باسی سەربازێکی ئەمریکی دەکات، کە لە ئێراقدا کوژراوە، مەروەش کچێکی ئێراقییە و لاقێکی بڕاوە و خوشکێکیشی لە شەڕی ئەمریکییەکاندا دژی ئێراق کوژراوە. هەروەها لەو کتێبانەدا باس لە ناکامی ئەمریکییەکان دەکات لە جەنگی ئێراق و ئەفغانستاندا، کە ئەمریکا بە ناوی ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆرەوە ئەنجامی دا و جگە لە کوشتنی خەڵکی بێگوناه و داماو، هێندەیتر بووە مایەی تووڕەکردنی تیرۆریستان و زیادبوونی ژمارەیان لە ناوچەکەدا. ئەم نووسەرە بڕێك لەدەستکەوتی کتێبی (بۆچی دەکوژی زەید؟)ی وەکو یارمەتییەك

پێشکەشی منداڵە ئاوارەکانی ئێراق کرد، هەروەها پرۆژەیەکی لە قودس بۆ ئاشتەوایی نێوان ئیسرائیلیی و فەلەستینییەکان دامەزراند .

تۆدنهۆفەر لەم کتێبەدا، کە تایبەتە بە دەوڵەتی ئیسلامیی (داعش) دیسان لەگەڵ تیرۆریزم گفتوگۆ و چاوپێکەوتن دەکات و سەردانی دەوڵەتی ئیسلامی دەکات تا دوور لە کاریگەربوون بە میدیا ڕۆژئاواییەکان و میدیاکانی دژی داعش، بە چاوی خۆی ڕاستییەکان ببینێت و بڵاوی بکاتەوە، ئەو ڕەخنەی توند ئاراستەی داعش دەکات و پێی وایە هیچ پاساوێك نییە بۆ کردەوە تیرۆریستییەکانیان و پێیان دەڵێت بۆتان نییە وتەکانی خوا وەکوو پاساوێك بۆ سەربڕین و کوشتنی خەڵك بهێننەوە، هەروەها کۆمەڵێك پاڵنەری بابەتی و واقیعی لە ئێراقدا دەخاتە ڕوو، کە دەبنە مایەی دروستبوونی ڕێکخراوی داعش، لەوانە پشتگوێخستنی سوننەکان دوای ڕووخانی سەدام و بێبەشکردنیان لە شانۆی سیاسیی ئێراق، هەروەها بەشێك لە کێشەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو کێشمەکێشە مێژووییەی کە لەنێوان جیهانی ڕۆژهەڵات و جیهانی ڕۆژئاوادا هەیە. ئەو پێی وایە تیرۆر تەنها تایبەت نییە بە موسڵمانانەوە، مرۆڤی بێ ئایینیش دەتوانێ دڵڕەقترین و تیرۆریستترین مەخلوق بێت، بەڵگەشی بۆ ئەم قسەیەی هەیە. دیسان ڕەخنە لە ئەمریکا و سەرانی ڕۆژئاوا دەگرێت بەوەی کە سیاسەتێکی نارێکیان دژی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهانی ئیسلامی گرتۆتەبەر، چونکە ئەنجامی کارەکانیان وا لە ئێستادا دەبینرێ، کە نەك هەر تیرۆریان بنبڕ نەکردوە، بەڵکوو بوونەتە مایەی هاندان و زیادبوونی ژمارەی تیرۆریستان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

هۆفەر دوای ئەوەی لە ڕێگەی سکایپەوە لەگەڵ چەند چەکدارێکی داعشدا قسە دەکات، هەوڵی ڕێکخستنی سەفەرێك دەدات بۆ دەوڵەتی ئیسلامی (داعش). دوای مشتومڕێکی زۆر دواجار هەوڵەکەی بە سەمەر دەگات. داعشەکان لە ڕێگەی پێدانی بەڵێننامەیەکی ئەبوبەکر بەغدادییەوە هۆفەر بۆ دەوڵەتی ئیسلامی بانگهێشت دەکەن. دیارە ئەم بانگهێشتکردنەش بۆ چەند مەبەست و ئامانجێکی دیاریکراو بووە. دواتر هۆفەر لە ڕێگەی تورکیاوە بە قاچاغ خۆی دەگەیەنێتە ئەو وڵاتە و دە ڕۆژێك لەوێ دەمێنێتەوە

و پاشان دەگەڕێتەوە. دواتر لەم کتێبەدا ماجەرای خۆی لە ماوەی ئەو دە ڕۆژەی کە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بووە، دەگێڕێتەوە. لەوێ لەگەڵ چەند بەرپرسێکی داعشدا چاوپێکەوتن دەکات. هەروەها لەگەڵ قازی و بەڕێوەبەری پۆلیسی موسڵ و یەکێك لە پێشمەرگە دیلەکان¬ و چەند کەسایەتیی تردا چاوپێکەوتن دەکات...

شەڕی داعش دژی کورد زیانێکی گەورەی بە ڕەوش و ژیانی کوردان گەیاند، ئاوارەبوون و سەربڕین و ڕفاندن و قەیران و زەرەروزیانی ماڵی و دارایی و سەربازیی و... لەو جۆرە کێشانە بوون کە داعش لەگەڵ خۆیدا بۆ میللەتی کوردی هێنان، هەر بۆیە لەم کەینوبەینەدا، ئێمەی کورد زیاد لە هەموو میللەتەکانیتر لەم شەڕەدا زەرەرمەند بووین، چونکە ئێمەی کورد زۆرتر لەگەڵ داعش ڕووبەڕوو بووینەتەوە، هەربۆیە ئێمە زیاتر لە میللەتانیتر پێویستمان بە خوێندنەوەی کتێبی لەم شێوەیە. لەم سۆنگەیەوە پێم باش بوو و بە ئەرکی خۆم زانی ئەم کتێبە وەربگێڕم و ئەرکی وەرگێڕانی ئەم کتێبە بخەمە ئەستۆی خۆم، پێم حەیف بوو کتێبێکی وەها شیرین و ڕەوان لە خوێنەری کورد مەحروم بێت. ئامانج لەم کارە، شکاندنی دوو نیشانەیە بە تیرێك، یەکەم: بۆ ئەوەی ئەم کارە خزمەتێك بێ بە کتێبخانەی کوردی و خوێنەری کورد، دووەم: بۆ ئەوەی خوێنەرانی کورد بە نووسەرێکی بیانیی بەناوبانگ ئاشنا بکەم، کە نووسینەکانی شایەنی خوێندنەوە و هەڵوەستە لەسەرکردنن. هیوادارم بەم کارە بتوانم خزمەتێکی بچووك بە هاوزمانەکانم بکەم لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە بۆشاییەك لە پێویستیی خوێنەرانی زمانی شیرینی کوردی پڕبکەمەوە.

ئەحمەد تەها نارێنی
کەلار / بەهاری ٢٠١٦

# بەشی یەکەم

## دروستبوونی دەوڵەتی ئیسلامی (داعش)

گومان دەبرێ دەوڵەتی ئیسلامی یان داعش یەکرا لە نێو جەرگەی تاریکی مێژووەوە سەری دەرهێناوە و خەریکە لە ناوەندی سیاسەتی جیهانیدا ڕۆڵ دەگێڕێت، بەڵام بەو جۆرە نییە، بەڵکوو ماوەیەکی زۆر بەسەر دروستبوونیدا تێپەڕ دەبێت. داعش منداڵی شەرشی ٢٠٠٣ی عێراقە. لە مانگی ٨ـی ٢٠٠٧ بۆ یەکەم جار لە ناوچەی ڕومادی لەگەڵ یەکەمین شەڕکەری داعش چاوپێکەوتنم کرد. ڕامی خوێندکارێکی شەرمنی بیستوحەوت ساڵان بوو، ئەو لە بەشی مێژوو دەیخوێند و لەبەر ئەوەی هێزەکانی جی ئای ئێس (GIS) لە کاتی پشکنینی ماڵبەماڵدا دایکیان بە فیشەك کوشتبوو، تازەیی پەیوەندیی بە گروپە تیرۆریستییەکانەوە کردبوو. هێزە داگیرکەرەکان، دایکیان لە پێش چاوی ئەو خەڵتانی خوێن کردبوو. لە کاتی گفتوگۆکردندا تێگەیشت کە من لە ئازار و قوڵایی برینەکەی تێنەگەیشتووم و ئەوەندەی پێویستە لە بڕیاری ئازاردەری تێناگەم، بە تاڵییەکەوە لێی پرسیم: "ئەگەر تۆ لە جێگەی من بان، چیتان دەکرد؟" گرتنەبەری هەڵویستی شەرەفمەندانە لەبارەی بەرگری و تیرۆریزم و لەو کاتەی کە خودی مرۆڤ لە خۆشگوزەرانی و ئاشتیدا دەژێت، کارێکی سادەیە. ئایا بە پێی پێویست لەم بابەتە ڕاماوین، کە چی لە ناخی ئەو مرۆڤەدا قەوماوە، کەوا پشتوێنی خۆتەقاندنەوە لە خۆی دەبەستێت و خۆی هەلاهەلا دەکات؟ کاتێك من بێدەنگ دەبم، گەنجەکە بەردەوام دەبێت لە قسەکردن و دەڵێت: " ئەگەر ئێوە کەلوپەلی هێرش و سووکایەتی پێکردنتان کۆبکەنەوە و کۆتایی پێبێنن، ئەگەر ئێوە سەرزەمینی ئێمە بە جێ بهێڵن، ئەوکات ڕێکخراوی قاعیدەش لێرە نامێنێت و دەتوێتەوە".

گەشەکردنی ڕێکخراوی قاعیدە وەك فاکتەرێکی نێو گەمە سیاسییەکانی ژینگەی قەیراناویی ئێراق، چوار ساڵ پێشتر، واتە ساڵی ٢٠٠٣ دەستی پێ کردبوو. هەر لەو

کاتەدا کەسێکی سوننیی مەزهەب بە نێوی ئەبو موسعەب زەرقاوی بە ڕەگەز ئەردەنی و تەمەن سیوحەوت ساڵە، دەبێتە کەسی یەکەمی ڕێکخراوەکە لە ئێراق. ئەم پیاوە پێشتر دەیوویست لەگەڵ "حیزبی تەوحید و جیهاد"ـی خۆیەوە، دەسەڵاتی شانشینی ئەردەن بڕوخێنێت، بەڵام لەپڕا داگیرکردنی ئێراق لەلایەن ئەمریکاوە بوارێکی تەواو جیاوازتری خستە پێش زەرقاوی. ئەو سەرئەنجام بڕیاری دا لە دژی ئەمریکا خەبات بکات و لەدژی شیعەکانی ئێراق ئاڵای جیهاد بەرز بکاتەوە،کە لە دیدی زەرقاوییەوە شیعەکانیش بە خەڵکانێکی خۆفرۆش و بەکرێگیراو بەرانبەر بە ئیسلام لەقەڵەم دەدران. ئەوان دوای ڕووخانی سەدام حوسێن دەسەڵاتێکی زۆر و بێ ئەندازەیان بەدەست هێنابوو و سوننەکانیان کە پێشتر دەسەڵاتی زۆریان هەبوو، بە شێوازگەلێکی توندوتیژ لە گۆڕەپانی سیاسی عێراق بەدەرنا.

زەرقاوی، کەمێك پاش داگیرکردنی ئێراق هەندێك لە شەڕکەرە ناڕازییەکانی ئێراقی لە دەوری خۆی کۆکردەوە و گروپێکی پێکهێنا. هەروەها ژمارەیەکی کەم لە شەڕکەرە عەرەبەکانیتریش چوونە نێو ڕیزەکانیانەوە، پاشان زەرقاوی ئەم گروپەی لەگەڵ قاعیدەدا وێکخست و لە ڕێگەی سووریاوە ڕەوانەی ئێراقی کردن. بەشێوەیەکی گشتی زەرقاوی زیاتر لە دوو هەزار شەڕکەری ئامادە و نائاسایی کاریگەری هەبوو. هەزاریان نیشتەجێی پارێزگای ئەنبار بوون. باقی هێزەکانی زۆرتر لە دەوروبەری دیالە و هەندێك لە ناوچە سوننەنشینەکانی بەغدا چالاکییان دەکرد. زەرقاوی توانی زۆرترین سوود لە ناڕەزایی و توڕەبوونی سوننەکانی ئێراق وەربگرێت. قوربانی ئامانجی کردەوەکانی دەستی زەرقاوی زیاتر و بە پلەی یەکەم پۆلیس و سەربازە ئێراقییەکان و بە تایبەتتر شیعەکان بوون. بەگوێرەی ڕاپۆرتی ئەمریکییەکان، پیاوەکانی زەرقاوی لە مانگی ئۆگۆستی ٢٠٠٣، مزگەوتی (ئیمام عەلی)یان لە شاری نەجەف تەقاندەوە. شەپۆلی هێرشە خوێناوییەکان یەك بەدوای یەك و پەیتاپەیتا دەستی پێ کرد.

ئەمریکییە داگیرکەرەکان بە بەخشندەیی خۆیان کەم تا زۆر هەر تەقینەوەیەك لە هەر قوژبنێکی ئێراقدا ڕووی بدایە، دەخستە ئەستۆی زەرقاوی. ڕۆڵی دیاری زەرقاوی لە

پێشهات و ڕووداوەکانی ئێراقدا، گرنگی بونیادیی ئەوی زیاتر کرد. بەڵام ئەم بابەتە کە شان بەشانی قاعیدە، هێزێکی بەرهەڵستکاری مەدەنی بەتوانا و بەرفراوان دژی داگیرکەرە ئەمریکییەکان بوونی هەبوو، بە نهێنی مایەوە. وەك بڵێی هەژمکردنی مەسەلەیەکی لەم جۆرە بۆ بەرەی نیشتمانیی ناوخۆیی دەوڵەتی ئەمریکا سەخت و گران بووە. ڕابەرانی ئەمریکا و سەرانی ئەو وڵاتە لە پاش ڕووخاندنی سەدام حوسێن پێویستیان بە دروستکردنی دوژمنێکی شەیتانی و ترسناك بوو، بۆ ئەوەی لە پێش چاوی دەنگدەرانیان ڕەوایەتیی بە شەڕە بێکۆتاییەکانی ئێراق بدەن، هەروەها لە پێناو مانەوەیان بۆ ماوەیەکی زیاتر لە ئێراق پێویستیان بە مەسەلەیەکی لەم جۆرە هەبوو، بۆ ئەوەی وێنەیەکی بە ڕواڵەت پەسەند بۆ خۆیان دابتاشن. لەلایەکی تریشەوە زەرقاوی پێی خۆش بوو وەکوو بکەرێکی تیرۆریستیی، کە لە هەموو سوچێکی ئێراقدا ڕۆڵ دەگێڕێت، ناوبانگ دەر بکات.

زەرقاوی لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی گرتەی ڤیدۆیی سەربڕینی بارمتە ڕۆژئاواییەکانەوە ناوبانگێکی جیهانی پەیدا کرد. لە ساڵی ٢٠٠٤ گرتەیەکی ڤیدیۆیی لەلایەن گروپەکەیەوە بڵاوکرایەوە بە نێوی "زەرقاوی ئەمریکییەك سەردەبڕێت." لەو گرتەڤیدیۆییەدا پیاوەکانی زەرقاوی نیکۆلاس برگی ئەمریکایی سەردەبڕن، ئەم کارەشیان وەکوو پەرچەکردارێك بوو دژی ئەو سووکایەتییە ناشرینانەی کە لە ئەبوغرێب کران. نیکۆلاس برگ و قوربانییەکانی دواتریش هاوشێوەی زیندانییەکانی نێو ئەبوغرێب لە کاتی سەرەمەرگدا ،جلێکی نارنجیی(یاخود پرتەقاڵیی)یان لەبەردابوو. تۆمارکردنی گرتەی ڤیدیۆیی سەربڕینەکان، هەڵبەت بێ بڕین و مۆنتاژکردن، بە شێوەیەکی جیاوازتر لە سەربڕینەکانی ئەمڕۆی قەڵەمڕەوی داعش" بڵاودەکرایەوە. بەڵام لە چەند ڕوویەکیشەوە شێوازەکانی ئەبوبەکر بەغدادیی بە ئاشکرا لە زۆرێك لە گرتەڤیدیۆییە دڵڕەقانەکاندا، وەبیرهێنەرەوەی شێوازەکانی زەرقاوییە.

له پاییزی ٢٠٠٤دا زەرقاوی بە شێوەیەکی فەرمی لەگەڵ ڕێکخراوی قاعیدەدا یەکی گرت. بە پێی سرووشت ئەمریکاییەکان حەزیان لەم مەسەلەیە بوو. لەو ساتەوەختە بەدوا گروپە تیرۆریستییەکەی زەرقاوی لە میدیا و تۆڕە گشتییەکاندا بە ناوی "ڕێکخراوی قاعیدەی ئێراق"[3] ناوبانگی پەیداکرد. ڕێک لەم ئانوساتەشدا ئەبوبەکر بەغدادیی خەلیفەی داعش لای ئەمریکییەکان زیندانیی بوو. زەرقاوی لەو ماوەیەدا بێ پشوودان سەرقاڵی مرۆڤکوشتن بوو. دڵڕەقی ئەو گەیشتە ڕادەیەك، ئەیمەن زەواهیری نوێنەری بن لادنی ناچار کرد لە نامەیەکدا نیگەرانیی خۆی لە دژی کردەوەکانی زەرقاوی پیشان بدات، بەهۆی ئەوەی لە هێرشە خۆکوژییەکانی زەرقاویدا زیاد لە پێویست خەڵکی بێتاوان قوربانیی دەبوون. زۆربەی قوربانییەکانی دەستی زەرقاوی شیعەکان بوون نەك ئەمریکییەکان. بن لادن و زەواهیری - لە شێوازێکی تەواو جیاواز لە زەرقاوی - لە هەوڵی ئەوەدا بوون، جۆرێك ئاشتی لە نێوان سوننەکان و شیعەکان بهێننە ئاراوە. بەڵام زەرقاوی دەستهەڵگر نەبوو، لەپەسا غاری دەدا و سڵی لە هیچ شتێك نەدەکردەوە. لە هەر کوێیەکی ئێراق سەروکەللەی پەیدا دەبوو، بەهۆی بێڕەحمی و دڵڕەقی و سەختگیریی لە شەریعەتی ئەلقاعیدەی عیراق، ڕووبەڕووی پرسیار و ڕەخنە دەبووەوە و بەرهەڵستی دەکرا. تەنانەت ئەگەر دەیتوانی شەریعەتی خۆی لە ناوچەیەکی سنووردارادا جێبەجێ بکات، کومەڵەیاسایەکی سەخت و توند و نەگۆڕی دەهێنایە گۆڕێ. بۆ نموونە جگەرەکێشان و خواردنەوەی ساردەمەنی و گوێگرتن لە مۆسیقا قەدەغە و حەرام دەکرا.

شێوازە بێبەزەیی و توندڕەوانەکەی زەرقاویی لە زۆر ڕووەوە لە یاسای وەهابییەکانی دووسەد ساڵی ڕابردووی نیمچەدورگەی عەرەبی دەچوو. یاساکانی زەرقاوی شێوازی خەواریجەکان و ڕەفتاری بکوژانی حەزرەتی عەلی (ئامۆزا و زاوای پێغەمبەر)یان لە زیهندا زیندوو دەکردەوە، ئەوانەی هەزاروسێسەد ساڵ پێش لەدژی ئیمامی عەلی خەلیفەی موسڵمانان ڕاپەڕین. لەو سەردەمەدا هەر کەس تۆزقاڵێك لە بیروڕای سەخت و ڕێبازە وشکەکەیان لایبدایە، بە شێوەیەکی بێبەزەییانە و خوێناویی ڕووبەڕووی دەستگیرکردن و سزا دەبوویەوە. بۆیان گرنگ نەبوو ئەو کەسە ژن یان پیاو بێت، منداڵ یاخود پیر بێت. ئەمڕۆ توندڕەوەکانی سەدەی بیستەمیش بە خەواریجی مۆدێرن ناودێنن.

---

3- AQI

لــه مــانگی ٦ـــی ٢٠٠٦، هێزەکــانی ئــەمریکا لــه هێرشــێکی ئاسمــانیی بەرنامــه بۆدارێـژراودا توانیـان لـه بەعقوبـه بـه دوو بـۆمبی ٥٠٠ پـاوەن، زەرقـاوی لـەناو ببـەن. بەهەرحاڵ ئەمریکییەکان لە ئێراقدا پێویستییان بە سەرکەوتنێك هەبوو.

هەر جۆرێك بوو، شەڕی هێزەکانی قاعیدە بـەردەوام بـوو. دوای جێگیربـوونی گروپـه جۆراوجـۆرە بەرگرییـەکان[٣] ، "قاعیـدەی ئێـراق"[٤] لـه ئۆکتۆبـەری ٢٠٠٦ نـاوی خـۆی بۆ"حکومەتی ئیسلامی ئێراق" گـۆڕی. شۆڕشـگێڕێکی میسـری بـەناوی "ئـەبو ئـەیوبی میسری" بۆ سەرکردەی نوێی گروپەکە دەستنیشان کـرا. هـەروەها پیـاوێکی ئێراقـی بـه نـاوی ئـەبو عەبـدوڵلا ڕەشـید بەغـدادی وەك ئـەمیری مەعنـەویی گروپەکـه دیـاری کـرا. مەبەست لەم بەغدادییـە ئەبوبـەکر بەغدادی ئێسـتا نییـە. بـوونی واقیعـی و گرنگـی ئـەو ئەمیرە مەعنەوییە تاکوو ئێستاش وەکوو شتێکی شاراوە و نادیـار ماوەتـەوە. هـەتا ئـەو کاتە چەکدارەکانی حکومەتی ئیسلامیی ئێراق دەوروبەری دوو هەزار چەکدارێك دەبـوون. بـەهۆی سیاسـیەوە، لـەوە بـەدواوە میـدیا ڕۆژئاواییـەکان تـەواوی هێرشـەکان، تەنانـەت هێرشـی گروپـەکانی دیکەشـیان بـه کـاری حکومـەتی ئیسـلامیی ئێراق/قاعیـدە دەهێنـا ئەژمار.

لەم کەینوبەینەدا هێزە ئەمریکییەکان بەهۆی زیادبوونی ڕەوتی بەرگریکاری لە ئێراق، تا دەهات زیـاتر ڕووبـەڕووی هێـرش و پـەلامار دەبوونـەوە و لـەتاو شـەڕکردن شـەکەت و ماندوو بوون. لێرەولەوێ هیچ شتێك لەسەر چەکە کۆمەڵکوژییـەکانیش نەدۆزرایـەوە، ئـەو شتەی کە ئەمریکییەکان بۆ هێرشکردنە سەر ئێراق کردبوویانـە بەهانـە. ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ ژمارەی کوژراوان و ئاماری زەرەروزیانی هێزە داگیرکـەرەکان زیـادی دەکـرد. لـەمڕووەوە هێزە ئەمریکییەکان ستراتیژی خۆیان گۆڕی. وای لـێ هـات فـەردە پـارە و جانتـا پـڕ لـه دۆلارەکـان زیـاتر ڕۆڵیـان دەبـینی و کارەکانیـان پـێ جێبـەجێ دەکـرا. سـەرئەنجام ئەمریکییەکان بە پێدانی برە پارەیـەکی خـەیاڵیی و سەرسـوڕهێنەر، توانیـان ڕێکـەوتنێك لەگـەڵ عەشـیرەتە سـوننەکان ببەسـتن، ئـەو عەشـیرەتانەی کـە تووشـی لـێکترازان و هەڵوەشانەوە هاتبوون. لـەپاش ئـەم بارودۆخـە ئەنجوومـەنی بێـداریی دامـەزرا و گروپـی

---

[٣] مقاومت

4 -ISI

نیمچەچەکداری سوننە سەریهەڵدا کە بۆ جیاکردنەوە لە شەڕکەرانی دەرەکی حکومەتی ئیسلامی عیراق، ناویی " کوڕانی ئێراق"یان لەسەر خۆیان دانا.

عەشیرەتە سوننەکان بە تەماعی بەشداریکردن لە دەسەڵات و سودمەند بوون لە خێروبێری ئێراق، توانیان هێزە بەدناوەکانی دەوڵەتی ئیسلامیی ئێراق، کە ڕۆژبەڕۆژ لە پێش چاوی خەڵك ناشرینتر دەبوون، لە ناوچە و پێگە داگیرکراوەکانی خۆیان دوور بخەنەوە. دوا بەدوای ئەمە چەند گروپێکی بچووك لە پاشماوەی دەوڵەتی ئیسلامیی ئێراق مانەوە کە زۆربەیان لە ناوچەکانی بەغدا و دیالە و شارە گەورەکانی پارێزگای ئەنبار ، بەتایبەت شاری فەلوجە و ڕومادیدا بوون. دەوڵەتی ئیسلامی تووشی بارودۆخێکی ئاڵۆز هات، کەوتە حاڵەتی کەناری قەیران و هەڵوەشانەوەوە. هەروەها عەشیرەتە سوننەکان گرووپە "بەرگریکارانی مەدەنی)یان ناچارکرد چەك دابنێن. ئەندامانی ئەم گروپە بە شێوەیەکی جیاواز لە گرووپی دەوڵەتی ئیسلامی سەرقاڵی کاروچالاکیی بوون وتوانییان بگەڕێنەوە سەر ئیش و کارەکانی پێشتری خۆیان.

دوای ئەمە هێزە سەربازییەکانی ئەمریکا بۆ ناوەندەکانی پاراستن و پشتیوانیکردن پاشەکشێیان کرد و لەوێدا وەك گۆڕکەن دەستیان بە هەڵکۆڵینی زەوی کرد. وای لێ هات بە دەگمەن هێزە ئەمریکی و هاوپەیمانانیان لە کوچە و کۆڵانی شارەکانی ئێراقدا دەبیندران. بۆچوونی ئەمریکییەکان لەسەر ئەو بنەمایە، کە بە بەهێزکردنی گوردانە سەربازییەکان یان بە دەستەواژەیەکی تر (تەوژمەکان (Surge) لەلایەن جۆرج بۆشەوە، ئێراقییەکان چۆکیان داداوە و دەست لە بەرگریکردن هەڵدەگرن، بەڵام ئەم کارە شتێکی جیا لە ئەفسانەیەکی جەماوەری نەبوو. من دروست ئەو کاتانە لە نێو ژمارەیەکی زۆر لە چەکدارانی بەرگریی ئێراق لە ئەنبار بووم، ماوەیەك دواتریش چوومە بەغدا. ئەمریکییەکان زۆر بە سادەیی و ئاسان جەنگی ئێراقیان دۆڕاندبوو، بەڵام لە ڕێگەی بەخشینی خێروبێری فەردە دۆلارەکانیانەوە، هیچ نەبێت توانیان کەمێك ئابڕوی خۆیان بپارێزن و لە ساڵی ٢٠١١ لە کاتی کشانەوەیان بۆ ناوەندەکانی پشتیوانیکردن، وایان پێشان دا کە بەهەمەحاڵ بە ئەگەر و بەڵام و بە زەربی هێز، بە شێوەیەك شەڕیان لە بەرژەوەندی خۆیان پێشخستووە.

بەهەرحاڵ نە حکومەتی ئێراق و نە ئەمریکییەکان هیچ یەکێکیان بەرانبەر بەو بەڵێن و پەیمانانەی کە پێشتر بە سوننەکانیان دابوو، وەفادار نەبوون. سونییەکان لە پێش هەمووشیانەوە ئەندامانی پێشووی حیزبی بەعسی دەسەڵاتدار بە فەرمی لە ژیانی سیاسی ئێراق دورخرانەوە و دەرکران. هەروەها پاش لاوازبوونی دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامیی ئێراقیش چی تر کەس لای لێ نەکردنەوە و پارەی پێ نەدان. جارێکی تر ژمارەیەکی زۆر لە گەنجە سونییەکان بێ ئیش مانەوە و دەسبەتاڵ بوون. سوننەکان لە جیاتی پاداشت وەرگرتن لەلایەن گرووپە چەکدارەکانەوە کەوتنە ژێر فشار و چاودێریی توندەوە. ڕۆژئاواییەکان هەموو شتێکیان دەزانی، بەڵام هیچ پەرچەکردارێکیان پێشان نەدا.

دوای ئەوەی هەردوو سەرکردەی گرووپی تیرۆریستی دەوڵەتی ئیسلامیی ئێراق، میسری و بەغدادیی یەکەم، لە مانگی ئاپریلی ٢٠١٠دا لە ڕێگەی هێرشە ئاسمانییەکانی ئەمریکاوە کوژران، دکتۆر ئەبوبەکر بەغدادیی سیوهەشت ساڵە لە مانگی مەی ٢٠١٠ ڕابەرایەتی پاشماوەی ئەم گرووپە لاوازبووەی گرتە ئەستۆ. ئەوان وەك پێشوو ژێرکۆمەڵەی قاعیدە بوون.

لە ساڵی ٢٠١١، لە کاتی بەهاری بەناو عەرەبی، فەرماندە دەرکراوە بەعسییەکان، کە ناچار بە چەکدانان کرابوون، پەیوەندییان بە گرووپی دەوڵەتی ئیسلامیی ئێراقەوە کرد. ئەم فەرماندانە لە ساڵی ٢٠٠٣ لە هێزەکانی دەرگیر لە ناکۆکییەکانی ئێراق بە لاوە نرابوون و پاش ئەوە هیچ دەرفەتێکیان پێ نەدرایەوە. دەوڵەتی ئیسلامیی ئێراقیش بە هاتنی ئەم هێزانە بۆ نێو ڕیزەکانی، بووە هێزێکی شەڕکەری بچووك و زۆر بەهێز، کە وردەوردە گەشەی کرد. ئەبوبەکر بەغدادییش لە دژی شیعەکان و دەوڵەتەکەی مالیکی هەمان ڕێبازەکەی زەرقاوی پەیڕەو کرد، ئەویش بە هەمان دڵڕەقیی و بە هەمان ڕاڤەی سەخت و توند و دەمارگیرانەی شەریعەت، بڕەوی بە چالاکییەکانی دا.

کاتێك کە تەوژمی بەرگریکاری سووری دژی ئەسەد لە سووریا دەستی بە جموجۆڵ کرد و چەند سەرکەوتنێکیشیان بەدەست هێنا، بەغدادییش لە کۆتایی ساڵی ٢٠١١ لەژێر ڕابەرایەتی محەمەد جۆلانی بەڕەگەز سووری، ڕێکخراوی بەرەی نوسرەی دامەزراند. ئەم ڕێکخراوە پاش چەند مانگێك سەرکەوتنێکی زۆری لە دژی ڕژێمەکەی ئەسەد

بەدەست هێنا. ئەم گروپە لە سەرەتای دەستپێکردنیان لە ڕێکخراوی قاعیدە و دەوڵەتی ئیسلامیی ئێراقەوە نزیك بوون، لەبەر ئەوەی قاعیدە و لقی ئێراقی دەوڵەتی ئیسلامییش لای خەڵکی سووریا زۆر خۆشەویست و پەسەند نەبوون، هەر بۆیە ئەوان ئەو کاتە بێدەنگییان هەڵبژارد.

دەموچاوی ئەسەد یان بە گوتەی ئەوان"کافری عەلەوی" لە نێوان شۆڕشگێڕەکاندا وێنەی دوژمنێکی سەرسەختی هەبوو. ئەو سیکۆلار و عەلەویش بوو، هەروەها هاوپەیمانی حکومەتی شیعەی ئێرانیش بوو، هەروەها بە بۆچوونی ئەوان بە شێوەیەکی شاراوەش بە یەکێك لە هەوادارە سەرسەختەکانی ڕۆژئاوا و بە پشتیوان و گوێڕایەڵی ئیسرائیلیش دادەنرا. زۆرنەی ئەو شۆڕشگێڕانەی لە سووریا، چاوپێکەوتنم لەگەڵیان کرد، بەشار ئەسەدیان بە دۆست و هەواداری ئیسرائیل وەسف دەکرد، ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە ئیسرائیل چەندین جار پێگە و مۆڵگەکانی ئەسەدیان بۆردومان کردبوو. لە سوریا هیچ شتێك ناتوانێت ڕێگە لەو وێنانە بگرێت کە لە بارەی دوژمنەوە دروستکراون.

زۆرێك لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی نزیك و ڕۆژئاوا لە شەڕی سووریا تێوە گلان و ڕاکێشرانە نێو کێشمەکێشەکانی ئەو وڵاتەوە، بە تایبەتی ئەو کەسانەی هۆگری زۆریان بۆ جۆرێك گۆڕانکاری لەو سەرزەمینەدا هەبوو. عەرەبستانی سعودی و قەتەر و ئەمریکا و فەرەنسا و بەریتانیا و ئەوانیتر هەوڵیاندا بەرەی شۆڕشگێڕان و بەرگریکاریی دژی ئەسەد بەهێز بکەن. ئەویش لە ڕێگەی ناردنی چەك و پارە، هەروەها لە ڕێگەی کاروچالاکیی میدیایی و پروپاگەندەی ڕۆژنامەوانییەوە کاریگەرییان لەسەر ڕای گشتیی دادەنا، ئەم مەسەلەیەی چالاکیی میدیاکانی ڕۆژئاوا لە کاتی شەڕی ئێراق لە ساڵی ٢٠٠٣ وەبیر دەهێنایەوە، چونکە ئەو کاتەش میدیاکان دەستیان دابوویە بڵاوکردنەوەی زانیاریی ناڕاست و نابەجێ و پێچەوانەی ڕای گشتیی. کاتێك من لە سووریا بووم و زۆرجار شەوانە ڕاپۆرتە ئینتەرنێتییەکانی میدیا ڕۆژئاواییەکانم دەخوێندەوە، ئەوکات بیرم لەوە دەکردەوە کە میدیا ڕۆژئاواییەکان دەربارەی وڵاتێکی تر و سەرزەمینێکی تەواو جیاوازتر لە ئێرە دەنووسن، کە من وا خەریکم لە نزیکەوە دەیبینم و ئەزموونی دەکەم.

ئەو چەکانەی کە بوونە مایەی ئەوەی لە ناوجەرگەی زنجیرە خۆپیشاندانێکی ئاشتیخوازانەی سووریاوە، شەڕێکی ناوخۆیی بێبەزەیی و سەرکێشانە هەڵبگیرسێت، ئەو

چەکانە بوون کە پێشتر بە ڕێککەوتنی دۆستانەی ئەمریکا لە ڕێگەی کانتنیرەکان و ئامرازی بارهەڵگری گەورەوە بە کەشتی یاخود فڕۆکە ڕەوانەی تورکیا دەکران. لەوێشەوە چەکەکان دەنێردرانە سووریا و ڕادەستی شۆڕشگێڕان دەکران. دوای ئەوەش چەند ڕێگەیەکی دیکەی بەقاچاغبردنی چەك لە ئێراق و لوبنانەوە دروستبوون.

بارەکان بۆ ناوچەی نادیار و شاراوەی دیاریکراو دەنێردران و دیاریکردنی جۆری چەکەکان و شوێنی ناردن و ئەو گروپانەی کە قەراربوو وەری بگرن، لە ڕێگەی ئەفسەرەکانی (سی، ئای، ئەی)[5] ـەوە ئەنجام دەدرا. بەم شێوەیە ئەمریکییەکان بە ڕواڵەت دەیانتوانی لەوە دڵنیابن کە چەکەکان ڕاستەوخۆ بۆ گروپەکانی بەرەی نوسرە و باقی گروپە توندڕەوەکان نانێردرێت، هەرچەندە ئەوان لە سووریا ئەم مەسەلەیەیان لەژێر کۆنترۆڵدا نەمابوو. ئەوان وەکوو هەرکەسێکی تر کە کەمتازۆر شارەزای بارودۆخی سیاسیی سووریا بێ دەیانزانی ئەم چەکانە دواتر دەکەوێتە دەستی هێزە تیرۆریستییەکانی ناوچەکە. سەرکێشترین گرووپەکان دەیانتوانی بە ئاسانی لەوبەری هێڵە سنوورییەکانەوە بەدوای باشترین جۆری چەکدا بگەڕێن. زۆربەی چەکە بیانییە نێردراوەکانیش دەدرانە دەستی گرووپە بەناو میانڕەوەکان و بە ئاسانی بەو گروپانە دەفرۆشران، کە لە ڕێکخراوی قاعیدەوە نزیك بوون. لە سووریادا بازاڕی گەرمی کڕین و فرۆشتنی چەك و مامەڵەی پڕسوود و بازرگانیکردنی چەك هاتە ئاراوە .

تەنانەت ڕێکخراوە تایبەتەکان و بە نمونە" خێرخوازە سەربەخۆکان" لە عەرەبستانی سعودی و کویت پارەیەکی زۆر، بە ملیۆن چەك و ژمارەیەکی زۆر شەڕکەریان ڕەوانەی سوریا کرد. بەشی زۆری ئەم پارە و چەکانە کەوتنە دەستی گروپە توندڕەوە ئیسلامییەکان. هەرچەندە یاسای ئەو وڵاتانە کرداری لەو چەشنەیان قەدەغەکردبوو، بەڵام کەمترین بەربەست بۆ ڕێگریکردن لەم هاوکارییانە بوونی نەبوو .

تا ساڵی ٢٠١٣، بەرەی نوسرە بووە یەکێك لە بەهێزترین گرووپە شۆڕشگێڕەکانی نێو وڵاتی سووریا. ئەم گرووپە بەڕادەیەك بەهێز بوو، کە بەغدادیی بە پێویستی زانی بە شێوەیەکی ئاشکرا ڕوونی بکاتەوە، کە ڕاستییەکەی بەرەی نوسرە شتێك نییە جگە لە

---

5-SIA

دەولەتی ئیسلامیی ئێراق لە سوریا. سەرئەنجام ئەو داوای لە محمد جۆلانی کرد کە بەیعەتی پێ بدات و سوێندی وەفاداریی بۆ بخوات، بەڵام جۆلانی پشتی لەم کارە کرد و وای بە باش زانی، کە بەیعەت بە ئەیمەن زەواهیری رابەری ڕێکخراوی قاعیدە بدات. بەهەرحاڵ، جۆلانی پێی خۆش بوو لقێك بێت لە ناوەندی سەرەکییەکە، نەك لقی لقێکی دیکە بێت.

لەمڕووەوە زەواهیری داوای لە بەغدادی کرد، نوسرە و دەوڵەتی ئیسلامیی ئێراق (داعش) هەروەك چۆن تا ئێستا لە یەکتر جودابوون، هەروا بە جودایش بمێننەوە، بۆ ئەوەی هەر یەکێك لەم دوو ڕێکخراوە هەوڵەکانی خۆیان لەسەر ئەو ناوچانە، کە لەژێر کۆنترۆڵیاندان، چڕ بکەنەوە. بەغدادی ئەم مەسەلەیەی بە تەواویی ڕەتکردەوە، هەروەها ڕوونیکردەوە، لەمەبەدواوە بەرەی نوسرە بە شێکە لە دەوڵەتی ئیسلامیی ئێراق (داعش). لەبەر ئەوەی جۆلانی و زەواهیری شوێن داخوازییەکەی بەغدادیی نەکەوتن، بۆیە بەغدادی لە ڕێکخراوی قاعیدە جیابووەوە و جۆلانی بە گومڕا و مورتەد لەقەڵەم دا. دوابەدوای ئەم مەسەلەیە نیوەی شەڕکەرەکانی بەرەی نوسرە وازیان لە جۆلانی هێنا و بەرەو لای بەغدادی ڕۆشتن و بەیعەتیان بەو دا.

دواتر شاری ڕەقە و ناوچەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی سووریا کەوتنە ژێر کۆنترۆڵی بەغدادییەوە. ئەو ناوی گرووپەکەی لە "دەوڵەتی ئیسلامیی ئێراق (داعش)"ەوە بۆ "دەوڵەتی ئیسلامی لە ئێراق و شام" (شامات و ناوچەی ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاست)[٦] گۆڕی[٧]. دواتر ئەم ناوەی کورتتریش کردەوە و تەنها " دەوڵەتی ئیسلامی" لێ مایەوە، لە ئێستادا لە نووسراو و تۆمارەکانی داعشدا ئەم ناوە بەکاردەهێنرێت. لەمە بەدوا هیچ قەوارەیەکی جوگرافییش بەم ناوەوە نییە، چونکە بانگەشەی دەوڵەتی ئیسلامیی ئەوەیە، کە ئەوان قەوارەیەکی جیهانیین. ئەو کاتەی ئەبوبەکر بەغدادی وەك خەلیفەی ئەم گرووپە دیاری کرا، نزیکەی شەش ملیۆن کەس لەژێر دەسەڵات و قەڵەمڕەوی دەوڵەتی ئیسلامییدا دەژیان.

---

6- Levante

٧- هەڵبەتە ناوی ئەم گروپە لە زمانی کوردیی عەرەبیی و فارسیی و لە هەموو ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەر بە (داعش) ناودێر کراوە.

# بەشی دووەم

## ئامانجەکانی ڕۆژئاوا

دیسان ڕۆژئاوا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست جەنگ هەڵدەگیرسێنێ و بەشداریی شەڕی کردووە. ئەمە چەندەمین جەنگە لەم ناوچە پڕ لە نەوتەدا، بیستەمین یاخود سییەمین؟ ئەم جارەیان شەڕ لەگەڵ داعش یاخود گرووپی بەناو دەوڵەتی ئیسلامییە، کە توندڕەویی و شەڕانگێزیی ئاشکرای هەموو جیهانی هەژاندووە، بەڵام ئایا ڕۆژئاوا دەتوانێ لە یەکەم هەنگاویدا بەو ئامانجەی بگات کە ئەم بەربەریێتییەی سەدەکانی ناوەڕاست بووەستێنێت؟ یان دەستتێوەردانی ڕۆژئاوا لە پێناو ئەوەدایە کە داعش بەرژەوەندییە نەوتییەکانی ئەوانی لە ئێراق سنووردار کردووە؟ بەهەرحاڵ چەکدارانی داعش توانیان هێڵی ستراتیژیی نەوتی ئێراق – تورکیا کۆنترۆڵ بکەن و لەم ڕێگەیەشەوە شادەماری ژیانی پیشەسازیی ئێراق رابگرن.

ئەمریکییەکان هەمیشە بۆ لادانی هەر جۆرە مەترسیی و بەربەستێك لە ڕەوتی دەرهێنان و گواستنەوەی نەوتدا ئامادەی شەڕکردن بوون. تا ئەو کاتەی کە چەکدارانی داعش تەنها لە سووریا و دوور لە بیرەنەوتە گەورەکانی ئێراق خەریکی پیاوکوشتن و تاوانکاریی و سەربڕین بوون، ئەمریکییەکان کاریان بە سەر ئەوانەوە نەبوو. تەنانەت ئەوکات ئەمریکا لە ڕێگەی هاوپەیمانەکانیشییەوە لە ناوچەی کەنداوی عەرەبی (فارس)، پشتیوانیشی لێ دەکردن، هەروەها پشتگیریی گرووپە تیرۆریستییەکانی دیکەی سووریاش دەکرد،بۆنمونە گرووپی بەرەی نوسرە و بەرەی ئیسلامیی و ئەحرار لشام، چونکە ئەوانیش دژی ئەسەد دەجەنگین، ئەسەد، کە هاوپەیمانی ئێران بوو، لە دوای شەڕی ٢٠٠٣ـی ئێراق و کەوتنی سەدام حوسێنی دوژمنی زۆر بەهێزتر ببوو. لە شەڕی نوێی ئێراقدا ڕۆژئاواییەکان بەدووی چ ئامانجێکدا دەگەڕێن؟

گەشـە و بـرەو پەیـداکردنی ژیـاری ڕۆژئـاوایی، کـە ٥٠٠ سـاڵ پێشـتر دەسـتی پـێ کردووە، بە هیچ جۆرێك لەسەر بنەمای مرۆدۆستی و ئەویترویستی نەبوو. ئەم پێشکەوتنە هـەرگیز سلەهرچـاوەی خسـتنەڕووی بیرۆکـەی ژیارانـە و بەشارسـتانیکردنی ناوچـەکانی دیکـەی دونیـا وەرنـەگرتووە، بـەڵکوو لەسـەر بنـەمای دەسـتەبەرکردنی بەرژەوەندییـە ئابوورییەکانیان بنیات نراوە، هەروەها لەسەر بنەمای دڵڕەقیی و بێبەزەیی سوپا و هێزە سـەربازییەکانیان جـێگیر بـووە. هەڵبەتـە زۆرینـەی سـەرانی ڕۆژئـاوایی پاڵنـەری خێرخوازانەکـەی خۆیـان بەهانـە دەکـەن بـۆ ئـەوەی پاڵپشـت و پشـتیوانی هاووڵـاتیی و دەنگدەرەکانی خۆیان بەدەست بێنن. ئەوان هەر ئەو کەسانە بـوون، کـە پێشـتر بـەهۆی جیاوازیی کەلتوور و فەرهەنگەوە و بەناوی مەسیحییەت و دواتریش بـەناوی مـافی مـرۆڤ و دیموکراسییەوە مرۆڤەکانیان کوشت، بەڵام لەڕاستیدا هەمیشە شەڕ لەسەر پارە بووە، تا ئەمڕۆش شەڕەکان لە پێناوی ناوبانگ و پارەو دەسەڵات بوون. لەم ڕوانگەیـەوە سـاموێل هـانتینگتۆنی ئـەمریکایی لەگـەڵ زۆربـەی مێژوونووسـان هاوڕایـە، هـانتینگتۆن دەڵـێ: "ڕۆژئاوا بەهۆی بە هـۆی باڵادەسـتی بەهاکانییـەوە نییـە، کـە دەسـتیان بەسـەر دنیـادا گرتووە، بەڵکوو لە ڕێگەی باڵادەسـتی لـە دەسـەڵات و بـەکارهێنانی ئـەو دەسـەڵاتەوەیە بەسەر هەموو دنیادا زاڵ بوون. زۆربەی کات ڕۆژئاواییەکان ئەم ڕاستییە ڕوونـە فـەرامۆش دەکەن، بەڵام ئەوانیتر هیچ کـات لـەبیری ناکـەن.) زۆرداریـی و دڵڕەقیـی ڕۆژئاواییـەکان هەموو سنوورەکانی تێپەڕاندووە و تەنانەت دڵڕەقیی ئەوان زۆر زیـاتر لـەو شـتەیە ئـەمڕۆ تیرۆریستی بێڕەحمی داعشی نمایشی دەکات و پیشانی دەدات.

لوییس د. باودیکور، نووسەر و کۆلۆنینشینی فەڕەنسایی بەمشێوە باسـی یـەکێك لـە بەربەرێتییە بێوێنەکانی فەڕەنسییەکان لە جەزائیر دەکات: "لێرە سـەربازێك بـۆ گەمـە و تەوس، مەمکی ئافرەتێکی بڕی، لەوێش سەربازێکیتر لاقی منداڵێکی گرت و سـەری کوتـا بە دیوارێکدا و ورد و پەراشی کـرد." ڤیکتـۆر هۆگـۆ فەڕەنسـییەکی تـرە، کـە لـە بـارەی چەند سـەربازێکەوە دەنووسـێ: سـەربازەکان منداڵـەکانیان بـۆ یـەکتری فـڕێ دەدا و بـە

نووکی ڕمەکانیان لە ئاسمان دەیانگرتنەوە. لەبەرانبەر هەر گوێیەکی سوێرکراو ۱۰۰سو[۸]یان بە بکەری ئەو کارە دەبەخشی.

ڕوون و ئاشکرایە سەرە بڕدراوەکان سوود و نرخێکی زیاتریان هەبوو. تا کۆتاییهاتنی جەنگی جەزائیر لە ۱۹٦۲، سەربڕینی هێزە ئازادیخوازەکانی جەزائیر کارێکی سادە و ڕۆژانەی فەڕەنسییەکان بوو. دواجار سەرە بڕاوەکانیشیان لە ئاپۆڕای جەماوەردا نمایش دەکرد، هاوشێوەی ئەوەی کە ئەمڕۆ لە دەوڵەتی ئیسلامیدا ڕوو دەدات.

بارودۆخی ئێراقییەکانیش ئەو کاتەی کە کۆڵۆنیی بەریتانیا بوون، زۆر لەمە باشتر نەبوو. لە ساڵی ۱۹۲۰ چەرچڵ بە تۆمەتی ڕاپەڕین لەدژی حکومەت، ئەوانی بە سپڵە و بێوەفا تاوانبار کرد و چەکی کیمیایی لە دژیان بەکار هێنا، بە شێوەیەك دواتر بە لوتبەرزییەوە لە یادداشتەکانی خۆیدا ئەم کارەی بە "چالاکییەك بە کاریگەریی ئاکاریی تایبەتەوە" باس کرد .

لە لیبیا سەرۆك عەشیرەتەکانیان سواری فڕۆکە کرد و لە ئامانەوەهەموویانیان فڕێ دایە خوارەوە. کیژۆڵە لیبییەکانیان وەك کۆیلەی سێکسیی بۆ هێزە داگیرکەرەکان بەکارهێنا. سەدان هەزار خەڵکی بێتاوان و مەدەنی لە ئۆردوگا زۆرەملێکانی کارکردن لە بیابان زیندانی کرابوون و نیوەیان بە شێوەیەکی دڵهەژێن گیانیان سپارد .

هەتا ئەمڕۆش ئەو بێڕەحمیی و دڵڕەقییەی ئازاردانی ئەویتر نەگۆڕاوە. تەنها کێشەکە ئەوەیە ئێمە ئاوڕمان لەو شتانە نەداوەتەوە و ئەو شتانەمان لە یادگەی خۆمان سڕیوەتەوە. دونیای ئیسلام ئەوانەی لەیاد نەکردووە. بەپێی وتەی زۆربەی سەربازە بەرجەستە ئەمریکییەکان لە زیندان، شوێنی ئەشکەنجەی ئەمریکییەکان لە بەگرام لە نزیکی کابوڵ، زۆر وەحشیانەتر لە گوانتانامۆ لەگەڵ زیندانییەکان ڕەفتار دەکرا. ماوەیەك بە سەگ دەستدرێژی دەکرایە سەر زیندانییە تالیبانییەکان تا ئەوکاتەی دانیان بە هەموو شتێکدا دەنا. من وتەی یەکێك لە شایەتحاڵەکانم بڵاو کردەوە، کە خۆی لە پسپۆڕانی ئەمنی بوو. بەڵام کەس ڕانەچڵەکی و کەسیش خەم داینەگرت. ئەگەر ئەم سەگانە بەر

---

۸- نزیکەی ۵۰۰ سەنتی ئەمڕۆ

بدرابایەنە گیانی سەربازەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان و بەو شێوەیە دەستدرێژی بکرایە سەریان، ئەوکات چی چی ڕووی دەدا؟!

پێشەنگ و سەرانی ماف مرۆڤی ڕۆژئاوا لەدوای سالّی ٢٠٠٣ تاوانێلێکی لەم جۆرەشیان لە ئێراق ئەنجام دا. مانال، کە کچێکی لاوی ئێراقیی بوو بەزۆر ناچاریان کرد لە زیندانی فرۆکەخانەی بەغدا بینەری دەستدرێژیکردنی سەربازێکی ئەمریکی بۆ سەر گەنجێکی بەرهەلّستکاری ئێراقیی بێت. ئەم ئافرەتە بە سەدان جار ئەم سوکایەتییەی بە گوێی هەموو جیهاندا هێنا و لە دادگا ئامادە بوو، بەلّام کەس گوێی بۆ نەگرت و کەسیش ئاوڕی لێ نەدایەوە، ئاخر ئەو کچێکی ئەمریکی نەبوو لە ناخەوە ڕووخا بێت .

بەپێی نوێترین ڕاپۆرتەکانی زیندانی گوانتانامۆ ژنە کارمەندە ئەمریکییەکان، بەندکراوەکان بە شێوەیەکی خراپ بۆ سێکس بەکار دێنن،تەنانەت هەندێك جار بە دوو کەس بەر دەبنە گیانی زیندانییەك. کاتێکیش ئەم دەستدرێژییە سێکسییانە لە ئەمریکا ئاشکرابوو، تەنهاوتەنها هۆشدارییەکی سادەیان بە فەرمانبەرەکان دا. لای ڕۆژئاواییەکان دەستدرێژیکردن و لاقەکردنی زیندانییە عەرەبەکان بە تاوان هەژمار ناکرێت. شپیگلّ ڕاپۆرتێکی تێروتەسەلی لەم بارەیەوە بلّاو کردەوە، بەلّام کەس گوێی بۆ ئەم سووکایەتیی و ڕیسواییانە شل نەکرد و هەمووان گوێیەکانی خۆیان داخست و ئاوڕێکیان لەم بابەتە نەدایەوە.

ئەگەر چەکدارانی داعش تاوانی لەم جۆرە ئەنجام بدەن، ئەوکات تووڕەیی ڕۆژئاوا هەموو سنوورەکان دەبەزێنێت و دەگاتە ئەوپەڕی و دانامرکێتەوە.حکوومەتەکان کۆدەبنەوە و فەرماندە سەربازییەکان کۆدەبنەوە، بۆ ئەوەی ڕێگەچارەیەك بۆ بەرگرتن لەم هێرشانە بۆ سەر بەهاکانمان بدۆزنەوە. وا هەست ئەکرێ ئەو تاوان و پێشێلکارییانەی کە عەرەبەکان ئەنجامی دەدەن لەگەلّ ئەوانەی کە ئێمەی ڕۆژئاوایی ئەنجامی دەدەین، وەك ئاسمان و ڕێسمان لێك جیاوازن. بە ڕاستیی نەژادپەرستی لەو فۆرمەدا بێزراوترین و وەڕزکەرترین کردەیە.

بەپێی گوتەی فەیلەسوفی فەڕەنسیی ژن پول سارتەر، ڕۆژئاوا لەگەڵ عەرەبەکان هەمیشە وەك بونەوەرێکی نزمتر لە مرۆڤ مامەڵەی کردووە و لە ئاستی مەیمونێکی گەشەکردوودا ڕەفتاری لەگەڵ دەکردن و لە دیدی ڕۆژئاواییەکانەوە ئەو خەڵکانەی کە لەوێن تەنها نیشتەجێی عەرەبستانن نەك خاوەنی ڕەسەنی ئەو شوێنە بن. تەنانەت سیاسەتمەدار و کۆمەڵناس و نووسەری گەورەی فەڕەنسیی (ئەلێکسی دوتۆکڤێل) ئەم پرسیارە دەورووژێنێت: "ئایا بە بینینی ڕووداوێکی لەم چەشنە لە دونیادا مرۆڤ بەو دەرئەنجامە ناگات کە پێگەی تاکی ئەورووپایی لە ئاست نەژادەکانیتر وەکوو پێگەی ئینسانە لە بەرانبەر ئاژەڵ؟ تاکی ئەورووپایی کارەکان بە ئەوان دەسپێرێت مادامێك چی تر نەیتوانی بەهرەیان لێ وەرگرێت، ئەوکات نابووتیان دەکات و لەناویان دەبات".

لەم دووسەد ساڵەی دواییدا تەنانەت یەکجاریش نەبووە وڵاتێکی عەرەبی هێرش بکاتە سەر وڵاتێکی ڕۆژئاوایی؟ هێرشبەران هەمیشە زلهێزەکانی ئەورووپایی بوون. ملیۆنان خەڵکی مەدەنی بێگوناح و مەدەنی عەرەب لەم هێرشە بەربەرییانەدا کوژران،. بەڵام لە بەرانبەردا دەربارەی بێڕەحمیی موسڵمانەکان هەموو شتەکان ئاڵۆز کراون و بە پێچەوانەوە پیشان دراون، ئەمەش لە کاتێك دایە ڕۆژئاواییەکان زۆر بێبەزەییتر لە موسڵمانەکان بوون.

ئەم مەسەلەیە تەنها دنیای ئیسلام ناگرێتەوە. کاتێك لە ماهاتما گاندی کرد لەربارەی ژیاری ڕۆژئاوا پرسیاریان کرد، ئەم پیاوە هیندییە بەم جۆرە وەڵامی دایەوە: "بە بۆچوونی من، دەتوانێ بیرۆکەیەکی باش بێت." هەڵبەتە لە دیدی گاندییەوە واقیعییەتی نەزموونکراوی هێژمۆنی ڕۆژئاواییەکان لە هیند شەیتانی بوو. لە ساڵی ١٩٧٥دا، کە من وەك نوێنەری لاوی ئیندیرا گاندی سەرۆك وەزیری هیند، کاتێك لە پێش ئەودا وتارێکی چاوەڕواننەکراوم خوێندەوە و تێیدا ڕەخنەم لە گرنگیی مافی مرۆڤ لای ڕۆژئاواییەکان گرت. ئەو بە سەرسووڕمانەوە پرسی: "هەر بەڕاست تۆ باوەڕت بەم شتانە هەیە؟"

ڤیسلی کلارك، فەرماندەی گشتیی پێشووی هێزەکانی ناتۆ دەڵێت: کەمێك دوای ڕووداوی یازدەی سێپتەمبەر، لە پنتاگۆن لیستێکیان پیشاندام، لەو لیستەدا ناوی حەوت

دەوڵەتی نالەباری تێدابوو، کە بڕیار بوو لە پێنج ساڵی دواتر هێرش بکرێتە سەریان. لەو لیستەدا ناوی وڵاتەکانی ئێراق، لیبیا، سووریا، ئێران هاتبوو. لایەنگرانی شەڕخوازیی جۆرج بۆش نەیاندەویست ئەم هەلە[9] بێوێنەی ١١ سپتمبەر لە دەست بدەن. بەپێی گوتەی کلارك ئەوان ویستیان ئەم دەرفەتە بقۆزنەوە و تا تەنوور گەرمە نانی پێوە بدەن و لە ڕێگەی هەڵگیرساندنی شەڕی جۆراوجۆرەوە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نائارام و سەرەوژێر بکەن، پاشان بیخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە. دواتر دەتوانرا بەڵگەی ڕاست و دروست بۆ ئەم کارە پەیدا بکرێت!"

بۆ ڕای گشتیی ڕۆژئاواییەکان سەختە باگراوندی گەمەیەکی گاڵتەجارانەی لەم چەشنە لە سیاسەتی ڕۆژئاوادا ببینن. ڕای گشتی بە ڕاستیی وا دەزانێ ئێمەی ڕۆژئاوایی"مرۆڤە باشەکان"ـین. ئەو وێنەی کە سەد ساڵە ڕۆژئاوا بۆ موسڵمانانی کێشاوە و وەکوو دوژمنێك وێنای کردوون، بە قووڵیی لە زیهنی ڕۆژئاواییەکاندا چەسپیووە، بەڵام ئەو وێنەیە هەرچییەك بێت هیچ نییە جگە لە شتێکی ساختە و دەستکرد.

خۆ ئەوە موسڵمانان نەبوون "جەنگی پیرۆز" یان هلگیرساند و لە جەنگی خاچپەرستاندا زیاتر لە چوار ملیۆن موسڵمان و جوولەکەیان کوشت. ئەوە مەسیحییەکان بوون کە لە ئۆرشەلیم تا ئەژنۆیان ڕۆچووبوو لە خوێندا و بە ڕەسیفەکاندا تێپەڕین تا بگەن بە ئارامگەی فریادڕەسیان. ئەوە موسلمانان نەبوون کە بە پێکهێنانی کۆلۆنالی لە ئەفریقا و ئاسیا ٥٠ ملیۆن مرۆڤیان کوشت. ئەوە موسڵمانان نەبوون لە جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانیدا نزیکەی ٧٠ ملیۆن کەسیان بە کوشت دا، ئەوە موسڵمانەکان نەبوون، کە ١٠ ملیۆن سلۆڤاکیی و شەش ملیۆن جوولەکەی هاونیشتیمانیی و دراوسێ و دۆستیان زۆر نامەردانە و ئابڕووبەرانە کوشت، بەڵکوو ئەوە ئێمەی ئەڵمانی بووین. سیاسەتمەدارە بە ڕواڵەت مەسیحییەکانی ئێمە، کەی بە ئەندازەی ئایینی مەسیحییەت ڕێزیان لەم ئایینە پڕ لە سۆز و ئەشق و پڕ بەزەییە گرتووە؟ کوانێ، کەی و لەکوێ ئێمە لەگەڵ برا ئایینییە موسڵمانەکان و جوولەکەکان بە ڕێز و ئەوینەوە مامەڵەمان کردووە؟

---

٩- هەلی هێرشەکانی یازدەی سێپتەمبەر

لـەم پێـنج سـەدەی دوایـی کیشـوەر و وڵاتـە داگیرکراوەکـانی بـێ بـەرگریی ملیـان بـۆ بەربەرێتییەکانی ئێمە نەداوە. سەرەڕای ئەوەی بەشێکی فراوانی خـەڵکی خۆیـان لەگـەڵ سیاسەتەکانی ئێمەدا وێك خستووە، بـەڵام کـەم تـا زۆر لـە هـەموو سـوچ و قـوژبنێکیش گروپـە نـاڕازیی و بەرهەڵسـتکارەکان هـەر بوونیـان هـەبووە. لەوانـە بزوتنـەوەی ئاشتیخوازانەی "نافـەرمانی مـەدەنی" گانـدی لـە هینـد، بزوتنـەوەی چـەکداریی "بـەرەی ئـازادیخوازی نیشـتمانی" لـە جـەزائیر، یـان بـەرگریی ئێراقییـەکان دژی هێرشـی سـاڵی ٢٠٠٣ی ئەمریکییەکان، ئەو هێرشەی، کە پێچەوانەی مافە نێودەوڵەتییەکان بوو.

ژان کوکتو، نووسەری فەڕەنسی دەڵێت: "پـاکی هـەموو شۆڕشـێك، ئەوپـەڕی تـا دوو هەفتە دەوامی هەیە." بەرگریی یاسایی هەر زوو دەگۆڕێت بە گروپی تیرۆریستی بێـڕەحم و خوێنڕێـژ. ئـەم شـتە تـەنها لـە دنیـای ئیسـلامدا ڕوو نـادا. لـە پـاڵ گروپـە تونـدڕەوە مەسـیحییەکان وەك جـورج حەبـەش، کـە بێڕەحمانـە دانیشـتووانە جوولەکـەکانی شارۆچکەیەکی قەتڵوعام کرد، ڕێکخراوی تیرۆریسـتی سـەهیۆنیی وەك ئێرگـون(ڕێکخراوی سەربازی نیشمانی لە ئیسرائیل) بە سـەرکردایەتی مـەناخیم بگـین یـا ئـەو گرووپـەی کـە خۆیان بە تیرۆریست ناو دەهێنـا "بـەرگریکارانی ئـازادیی ئیسـرائیل" بـە سـەرکردایەتیی ئیسحاق شامیریش، بوونیان هـەبوو. تیرۆریسـتگەلێك وەگ بگـین و شـامیر دواتـر بوونـە سـەرۆکوەزیرانی وڵاتەکـەیان، ئەوانـە لەلایـەن ڕۆژئاواییەکانـەوە بـە تـەواوی پشـتگیری دەکران.

تیرۆریـزم دیاردەیـەکی جیهانییـە و تـەنها تایبـەت بـە موسـڵمانەکان نییـە. بـەپێی زانیارییەکانی ناوەندی گشتگیری تیرۆریزمـی جیهـانیی، کـە ناوەنـدێکی بەرفراوانـە و بـە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ لەلایـەن دەوڵـەتی ئـەمریکاوە دامـەزراوە، لـە سـاڵی ٢٠١٣ لـە ڕۆژئاوادا ٢٣٩ هێرشی تیرۆریستیی ئەنجام دراون. تەنها دوو حاڵەت لەم هێرشانە لەلایەن موسـڵمانەکانەوە ئـەنجام دراون. سـاڵی پێشـتر لـە ٩٦ حاڵـەت شەشـیان لەلایـەن موسلمانانەوە ئەنجام درابوو. زۆربەی ٢٣٩ حاڵەت لەلایەن کەسانی نەناسراوەوە ئـەنجام

دراون، کۆمەڵگـــەلێك وەك شـــەڕکەرانی جوادییخـــواز، چـــەپە رادیکاڵـــەکان، راســـتە توندڕەوەکان، پرۆتستانەکان و هتد.

ئەو گوتەیە کە هـەموو موسـڵمانان تیرۆریسـت نـین، بـەڵام هـەموو تیرۆریسـتەکان موســـڵمانن، شـــتێکی زۆر بێمانایـــە، تەنانـــەت ئەگـــەر هێرشـــی تیرۆریســـتی گرووپـــە ئیسلامییەکان زۆر لـە هێرشـی گروپـەکانیتریش خوێنـاوییتر بێـت. لـە ئـەڵمانیا تـا ئـەمڕۆ تەنانەت یەك ئەڵمانیش بە دەستی تیرۆریستە ئیسلامییەکان نـەکوژراوە، بـەڵام تـەنها لـە ساڵی ۱۹۹۰لە ئەڵمانیا ۲۹موسڵمان بە دەستی توندڕەوە ئەڵمانییەکان کوژراون. بیر لە کوشـتاری ناسـیۆنال سۆسیالیسـتەکان یـاخود کوشـتارەکانی مـولن و زولـیگن بکەنـەوە. بڵاوکردنەوەی ڕق و کینە دژ بە ئیسلام تەنها بەم شتانە تەواو نابێ و کۆتایی پێ نایەت.

هەڵبەتە لـەم سـاڵانەی دوایـی تیرۆریزمـی ئیسـلامیی لـە هـەنگاوی یەکەمیـدا نـەك لـە ڕۆژئـاوا، بـەڵکوو لـە ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت قوربـانیی و کوشـتارەکانی ئـەنجام دەدات، ئەویش لە ژێر کاریگەریی جەنگی دژەتـیرۆری ئـەمریکا لـە ئەفغانسـتان و ئێـراق و لیبیـا. خودی ئەم جەنگانە بە بەرنامەیەلێکی پلان بۆداڕێـژراوی تیرۆریسـتیی لەقەڵـەم دەدرێـن، بەڵام ئەم تیرۆریزمـە هێنـدەی بـۆ قوربانییـە ڕۆژهـەڵاتی و ڕۆژئاواییـەکانی ترسـناك بـوو، ئەوەندە بۆ ستراتیژی ئاسایشی جیهانیی ئەمریکا زیانبەخش نەبوو. بە پێچـەوانەوە ئـەم جـۆرە تیرۆریزمـە بەهانـــەی گرنگـــی هێنـــا ئـــاراوە بـــۆ ئـــەوەی پشـتیوانی هاوڵـــاتی و دەنگدەرەکانی خۆیان لە وڵاتەکەیان بقۆزنەوە و دیسانەوە دەست لە کاروباری ناوەنـدی نەوت و گاز و شەڕوشۆڕ وەربدەن. بە پێـی وتـەکانی هێنـری کیسـنجەر وەزیـری پێشـوی دەرەوەی ئەمریکا، لە ئێستادا نەوت زۆر لەوە گرنگترە کە بە عەرەبەکانی بسپێرن.

تیرۆریستەکان ئەو مرۆڤە پەست و هیچ و پوچانەن، کـە سیاسـەتی ئـەمریکا هەمیشـە پێویستی پێیانە تا بەهۆی ئەوانەوە بە شێوەیەکی ڕواڵەتیی ڕەوایەتیی بە دەستێوەردانە سیاسییەکانی خۆی بدات. هاواری نائومێدانەی ژەنـەراڵی پێشـوو، کۆلین پـاوڵ لـە پـاش کەوتنی یەکێتیی سۆڤێت زۆر بەناوبانگە کە دەڵێ: "لەسەر ڕێگەکـەم لاچـن ئـەی بێفـەڕە خوێڕییەکان!" با وای دانێین هـیچ تیرۆریسـتێك لـە جیهانـدا نەبووایـە، ئـەوکات ئـەمریکا

خۆی دەست بەکار دەبوو و تیرۆریستی بۆ خۆی دادەتاشی. چونکە ئەمریکییەکان لەم جۆرە کارانەش دەکەن .

لەبارەی ستراتیژی شەڕخوازانەی ئەمریکییەکان لە بواری نەوت و گاز دەتوانین بەڵگەی زۆرتر ببینینەوە. بۆ نموونە لە مانگی مەی ۱۹۹۷دا، دەوڵەتی ئەمریکا بە شێوەیەکی ئاشکرا ڕایگەیاند، ئەگەر ڕێگەکانی بازرگانی و دەستڕاگەیشتن بە بازاڕە سەرەکییەکان و کۆگاکانی وزە و سەرچاوە ستراتیژییەکان بکەونە مەترسییەوە، ئەوکات دەوڵەتی ئەمریکا خۆی بە بەرپرسیار دەزانێ بۆ دەستێوەردانی سەربازیی. تەنها گەمژەکان ناتوانن سەر لە سیاسەتی ئەمڕۆی جیهان دەربێنن: "نەوت ئاڵتونێکی ڕەشە، کە خۆشگوزەرانی ئەمریکییەکان بەستراوەتەوە بەوەوە، نەوت پیسترین دیاریی شەیتانە."

تیرۆریستەکان هێرشەکانیان وەکوو پەرچەکردارێك بەرانبەر سیاسەتە توند و چاوچنۆکانەکانی ئەمریکا دەزانن، ئەو ئەمریکایەی، کە وڵاتەکانیان وەك بەنزینخانەیەك بۆ خۆی سەیر دەکات و بۆ بەدەستهێنانی ئەم ئامانجەیان سوود لە توندترین ڕێگەکان وەردەگرێت. گەنجە موسڵمانەکانی ئەڵمانیا و ئێراق بە چاوی خۆیان دەبینن کە هەر ڕۆژە و هەر ساڵە سەرباز و چەکە ڕۆژئاواییەکان بە چی شێوازێك لە وڵاتەکانی ئەفغانستان و ئێراق و یەمەن و سۆماڵ و فەلەستین، ژن و پیاو و منداڵە موسڵمانەکان دەکوژن و بریندار دەکەن، سەرئەنجام ئەم کارانە دەبنە مایەی ئەوەی بەشێك لەو گەنجە موسڵمانانە لە کات و شوێنێکی دیکە پەرچەکرداریان هەبێ. هیچ کەس بە تیرۆریستیی لە دایك نابێ و نایەتە دنیاوە.

بەڵگەردان و قوربانییە سەرەکییەکانی ئەم تیرۆریزمە کە لە ڕەواڵەتدا ئامانجی ئەو ئازادکردنی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە، کەسانێکی مەدەنی چارەڕەشن کە لەو ناوچانەدا دەژین، موسلمان و مەسیحییەکان هەر دوویان بە رادەیەك دەبنە قوربانی. هەروەها ئەو بۆردومانانەی، کە ڕۆژئاوا پێی وایە بە ئەنجامدانی ڕووبەڕووی تیرۆر دەوەستێتەوە،

زۆربەی قوربانییەکانی موسڵمان و مەسیحی بێدەسەڵات و داماوەکانن، بەتایبەت ئەوانەی کە دەکەونە نێو ئەم بازنەی توندڕەوییەوە.

تیرۆریستەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە باشی دەزانن کە کەمینەن، زۆرینەی موسڵمانان خوازیارن لە ڕێگەی ئاشتیخوازانەوە مافەکانی خۆیان بەدەست بێنن و لەم هەژارییە دەرباز بن. تیرۆریزمی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دیاردەیەکی کەمینییە، بەڵام ئەم کەمینەیە ڕزگارکردنی دونیای ئیسلام بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێ و وەك ڕوونە بەو ئاسانییەش دەست هەڵگر نییە، بە تایبەت ئەو کاتانەی کە ڕۆژئاوا پیرۆزترین سەرمایەی موسڵمانان، کە ئایینەکەیانە، بە تەوس و گاڵتەجاڕیی دەگرێ و هەوڵی سڕینەوەی دەدات. ڕۆژئاوا لەوە تێ ناگات کە هێرشکردنە سەر پێغەمبەری ئیسلام محەمەد(درودی خوای لەسەر بێت.) هاوشێوەی بۆردومانەکان و هێرشە ئاسمانییەکان ئازاربەخشە و زیهن و ئەندێشەی موسڵمانان بریندار دەکات.وا هەست ئەکرێت ڕۆژئاواییەکان گرنگی بەمەش نادات و هۆگری بۆ نییە. ئەوان دەڵێن بەرگریکردن لە بەهامانی خۆمان گرنگە نەك بەهاکانی دونیا ئیسلام.

زۆربەی تیرۆریستان ئەوە دەزانن کە لە ڕووی سەربازییەوە بەرانبەر هێزە ڕۆژئاواییەکان هیچ شانسێکیان ناکەن و لەپێش هەموو شتێك زیان بە خۆیان و دونیای خۆیان دەگەیەنن. ژان پۆڵ سارتەر لە ساڵی ١٩٦١ لە دەورانی جەنگی جەزائیردا ئەمشێوە وەسفی ئەم نائومێدبوونە خۆوێرانکەرە دەکات:

تووڕەیی دامرکێنراو لە سووڕێکی بازنەییدا دەخولێتەوە و ناوەڕۆکی دەگۆڕێت، پێچەوانە دەبێتەوە و لە نێوان ژێردەستەکان و ئەو گروپانەی لەژێر فشاردان، بە شێوەیەکی خۆوێرانکەرانە سەر هەڵدەداتەوە، بە شێوەیەك کە بۆ بەتاڵکردنەوە و خاڵیکردنەوەی ئەو تووڕەییە، گروپەکان لەنێوان خۆیان بەشێوەیەکی بێبەزەییانە دەکەونە گیانی یەکدی و قەڵاچۆکردنی یەکتر. هۆزەکان لەگەڵ یەکدا دەجەنگن، چونکە ناتوانن ڕاستەوخۆ هێرش بکەنە سەر دوژمنی سەرەکی و بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین هەمیشە سیاسەتە کۆلۆنیالیستییەکان پەرە بەم ململانێیانە دەدەن. لافاوی

بونیادشکێنی توندڕەویی تەواوی چوارچێوە و زنجیرەپێوەندییەکان تێکوپێك دەدات. ئەمەش هەمان تایبەتمەندیی دەشتەکییانەیە. توندڕەویی دەگەڕێتەوە بۆ ئێمە، بەڵام ئێمە وەکوو ڕابردوو کەمتر هەست بەوە دەکەین کە ئەم توندڕەوییە، توندڕەوییەکەی خودی خۆمانە و بۆمان گەڕاوەتەوە .

ماوەیەکی زۆرە لە دنیای ئیسلامدا ڕای جیا لەسەر ئەوە هەیە، کە داخوا لەو ناوچانەی کە ڕۆژئاوا دەستی بەسەردا گرتوون دەبێ چاولێکەریی لە ڕۆژئاوا بکرێ یاخود نا دەبێ دەست بە سوننەت و بەها ئیسلامییەکانەوە بگیردرێ. ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان ڕزگاربوونیان لە گەڕانەوە بۆ ئیسلامی پەتیی و ڕەسەن دەبیننەوە. ئەم بۆچوونە لە ڕووی داراییەوە لە لایەن وەهابییەکانی عەرەبستانی سعودییەوە پشتگیریی لێ دەکرێت. وەهابییەکان، قورئان وەکوو کتێبێك تەماشا دەکەن، کە لە لایەن خواوە بۆ تەواوی بابەت و کێشە کۆمەڵایەتی و کەلتوری و سیاسییەکان لە هەموو ئان و کاتێکدا ڕێوشوێنێکی ڕوون و نەگۆڕی هەیە. وەهابییەکان کەمینەیەکی بچووکی دەوڵەمەندن. تەنها ٢٪ لە کۆی ١.٦ ملیارد موسڵمانی جیهان پێبەندی ئەم گروپە توندڕەوە ئیسلامییەن، ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر سەلەفییە هاوشێوەکانیشیان لەگەڵ هەژمار بکرێت. زۆرینەی موسڵمانان لە هەوڵدان پەیامە قورئانییەکان لەگەڵ واقیعییەت و گۆڕانکارییەکانی ئەمڕۆدا بگونجێنن. ئەوان لایەنگری ئیسلامێکی بەتەواوی میانەڕەو، ئاشتیخواز و مۆدێڕنن.

لەسەر ئەم بابەتە کە چلون وەڵامی سیاسەتە دەستدرێژیکار و توندڕەوانەی ڕۆژئاواییەکان بدرێتەوە، لە نێو گرووپە ئیسلامییەکاندا ڕاجیاییەکی[10] زۆر هەیە. داعش ڕادیکاڵترین وەڵام دەداتەوە. ئەوان ململانێ دژی هەموو سیماکانی دونیای خۆرئاوا دەبەستنەوە بە خەبات لەدژی هەموو ئەو موسڵمانانەی کە پەیرەوی لە ئایدیۆلۆژیای

---

١٠- خیلاف

توندی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەوان ناکەن و ملی بۆ کەج ناکەن. لای داعشەکان دەوڵەتی ئیسلامی وەڵامی هەموو پرسیارەکانی سەردەمی ئێستای پێیە، لە ئێستادا و لەسەرەتای کارەکانیان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە دەستیان پێ کردووە، بەڵام لە ئایندەیەکی دووردا سەرانسەری جیهان دەگرێتەوە .

تەواوی ئەو قسەگەلە ڕوون و ئاشکران و هیچ پاکانەیەك یان شتێکی شاراوەیان تێدا نییە. تیرۆریزم نیازی بەوە نییە پاساو بێنێتەوە و خۆی لەسەر حەق پێشان بدات. داعش هەرگیزاوهەرگیز کاری لەم جۆرە ناکات. هەر ئەوەی کە خەڵکی بێلایەن و بێتاوان دەکوژرێ، باسی کوشتن دێتە پێشەوە. ئەگەر نا لەم بارەیەوە هیچ باسوخواسێك نابیسترێ. هەرکەسێك باوەڕ و بیرکردنەوە بونیادییەکەی داعش بە سانایی وەربگرێ، هیچ کاتێك درکی بە پێگەی مێژوویی و هەرەمیی داعش نەکردووە.

من بە درێژایی تەمەنم لەگەڵ هەموو جۆرە چەکدار و تیرۆریستێکدا دیدار و چاوپێکەوتنم کردووە، لە ساڵی ١٩٦٠ ئەوکات کە خوێندکار بووم لەگەڵ چەکدارانی ئێف، ئێڵ، ئێن (FLN)لە جەزائیر چاوپێکەوتنم کرد، لە ساڵی ١٩٧١ وەکوو دادوەرێك لەگەڵ فراکسیۆنی سوپای سوور(ڕاف(RAF ، لە حەفتاساڵیدا وەکوو نوێنەری پەرلەمان لەگەڵ چەکدارە ئازادیخواز و تیرۆریستەکانی مۆزەمبیق و ئەنگۆلا و نامیبادا چاوپێکەوتنم کرد، لە ساڵی ٢٠٠٧ وەکوو بەڕێوەبەری میدیایی لەگەڵ یەکەمین چەکدارانی داعش لە ئێراق (ئەوکات هەلگری ئەم ناوە نەبوون). ساڵی ٢٠١٠ لەگەڵ ڕابەرانی تالیبان لە ئەفغانستان، لە ساڵی ٢٠١٢ لەگەڵ تیرۆریستانی ڕێکخراوی قاعیدە لە سووریا و هتد. هەموو ئەم گروپانە بانگەشەیان بۆ ئەوە دەکرد، کە لە پێناو ڕزگارکردنی شەرەفمەندانەی خەڵکی دیلکراو تێدەکۆشن و ڕێگای خەبات و بەرگریکردنیان هەڵبژاردووە. ئەوان پێیان وابوو فەرمانی (ن مەکوژە)[١١] ئەوان ناگرێتەوە. ئەوان هەموو

---

١١- یاسایەکی سەردەمی ئیمپراتۆری ڕۆمانەکانە.

ئەم کارانەیان وەکوو کەسێك، کە مێشکیان شورابێتەوە، زۆر بە ئاسایی ئەنجام دەدا. وەك بڵێی کەسێك دوگمەیەکی فشاری لە مێشکیاندا جێگیر کردبێت و هەر کات ویستی دەستی پیا بنێت. لەناکاو هەموو شتێك ڕێگەپێدراو دەبوو. وەك بڵێی ئەوان لە پێناو شتێکی باشتردا دەجەنگن. ئەوان بەدەر لە خەیاڵاتی ئایدۆلۆژییان زۆرێکیان مرۆڤی سادەی ئەم ڕۆژگارە بوون. بەڵام سەرەڕای ئەوەش بکوژ بوون.

بەڵام لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە ئاراوە، کە ئایا ئەو بەرپرس و سەرکردانەی، کە لەپشتەوەی شاڵاو و پەلاماردانەن کە پێچەوانەی یاسای نێودەوڵەتین، بۆ خۆیان و سەربازەکانیان تیرۆریست نین؟ ڕێکخراوی قاعیدە لەم چەند ساڵەی دواییدا لە سەرانسەری دنیا و لە ئەمریکا و ئەوروپا لەم چواردە ساڵەی دوایی زیادتر لە ۲۳۰۰ کەسی کوشتووە، بەڵام جۆرج دەبلیو بۆش تەنها لە شەڕی ئێراق و ئەفغانستاندا نزیکەی ٦٠٠٠٠٠ کەسی لەنێو بردووە! ئایا جەنگی ئێراق، کە پێچەوانەی یاسا نێودەوڵەتییەکانی جیهان بوو، هەروەها لەسەر بنەمای کۆمەڵێك بەڵگەی بێبنەما و ناڕاست ئەنجام درا، تیرۆر نەبوو؟! ئایا پیتەر ئوستینوف بەریتانی ڕاستی نەگوت، کە شەڕە هێرشبەرییەکانی بە "تیرۆریزمی سەرمایەداران" ناوزەد کرد؟ منداڵێکی ئێراقیی هیچ جیاوازییەك بەدی ناکات لە نێوان ئەوەی کە لە هێرشێکی خۆکوژیدا پارچەپارچە ببێ یاخود بەهۆی بۆمبێکی مەسیحییەوە، کوشتن هەر کوشتنە و جیاوازییەکی نییە. شەڕ تیرۆری دەوڵەمەندەکان و تیرۆر، شەڕی هەژارەکانە. هەتا ئەمڕۆش کەس نەیتوانیوە جیاوازیی نێوان چۆنێتیی ئەم دوو بابەتە پیشان بدات .

ئیدوارد پیك، جێگری سەرۆکی کاری گروپی تیرۆریزم لە کۆشکی سپیی لە زەمانی ڕۆناڵد ڕیگان بە ئاوازێکی تێکەڵ بە کێنایە و نائومێدییەوە بەمشێوە باسی دژوارییەکانی جیاکردنەوەی تیرۆریزمی دەوڵەتی لە تیرۆریزمی ئاسایی دەکات: "شەش پێناسەمان بۆ تیرۆریزم خستەڕوو، بەڵام هەر هەموویان ڕەتکرانەوە. بە خوێندنەوەی وردی بارودۆخەکە لە هەموویاندا دەردەکەوت، کە خودی ئەمریکا لەم چالاکییانەدا دەستی هەبووە."

تیرۆریزم بە هیچ جۆرێك پەیوەندیی بە ئایینەوە نییە. لە ڕاستیدا شتێك نییە بە ناوی "تیرۆریزمی ئیسلامیی"ـەوە. هەرگیز تیرۆریزمی ئێرلەندای باکوور[12] یان ئەو کردەوە تیرۆریستییانەی، کە ئاندرس بریڤیکی نەرویجی ئەنجامی دا، بە تیرۆریزمی مەسیحیی هەژمار ناکرێن. ئێمە بەو کردەوە تیرۆریستییانەی کە موسڵمانان ئەنجامی دەدەن، تیرۆری ئیسلامیی دەڵێین، بەڵام هەرگیز بە ئەو کردەوە تیرۆریستییانەی، کە ڕۆژئاواییەکان ئەنجامی دەدەن ناڵێین تیرۆری مەسیحی. ئێمە لە ڕێگەی پێناسەی زمانەوانی و ناولێنانی تایبەت لە سەر دوژمنەکانمان، کاریگەری لەسەر ڕای گشتیی خەڵك دادەنێین و بەلاڕێدا دەیبەین. کەسێکی تیرۆریست، کە سوود لە ڕێگا شەیتانییەکان وەردەگرێت، هیچ کاتێك مافی ئەوەی نییە وتەکانی خوا بکاتە بەڵگە بۆ کارە قێزەونەکانی خۆی. ئەو بانگەشەیەی کە پێی وایە تیرۆریزم زۆرتر بابەتێکی مەزهەبیی و ئایینییە، بە گشتی جۆرێك لە ئەفسانەی مولحید و خوانەناسانەیە. کۆمەڵکوژیی و قەتڵوعام گەلێك کە ناسیۆنال سۆسیالیستەکانی ئەڵمانیا و کۆمۆنیستەکانی ڕووسیا و چین ئەنجامیان دا، بەڵگە و شایەتحاڵێکی تاڵن لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ دەتوانێت دڵڕەقترین بوونەوەر بێت، ئەگەرچی دیندار یاخود بێدینیش بێت.

بەرهەڵستکاریی و بەگژاچوونەوەی ڕۆژئاواییەکان لەدژی تیرۆر هەمیشە شکستی هێناوە. تەماشای ئەفغانستان لەساڵی ٢٠٠١ و ئێراق لە ساڵی ٢٠٠٣ بکەن. لە ئێستادا ژمارەی تیرۆریستان لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست هێندە زیادیان کردووە گەیشتووەتە لوتکە و ترۆپك. لە سەردەمی بن لادندا ئەوپەڕی ١٠٠٠ تیرۆریستی نێودەوڵەتی هەبوو، بەڵام لە ئێستادا دەکرێ تیرۆریستان ژمارەیان گەیشتبێتە ١٠٠٠٠٠ کەس لە جیهاندا.

لە ئێستاشدا بۆردومانەکانی ئەمریکا دژی دەوڵەتی ئیسلامی (داعش) کە بە ناوی لێدان لە بنکە و بارەگاکانی تیرۆریستانەوە ئەنجام دەدرێت، هیچ ئەنجامێکی نییە. وەك

---

12- IRA

هەمیشە لەم هێرشانەدا زۆرتر خەڵکی مەدەنی دەبنە قوربانیی و دەکوژرێن، نەك خودی تیرۆریستان. لە ئێستاشدا بەهۆی بۆردومانی شاری موسڵ، فەللوجە، حەویجە، عالەم، سەعدیە و ڕەققە لە لایەن هەوادارانی ئاشتییەوە، ژمارەیەکی زۆر خەڵکی سوننی بێتاوان کوژراون. تەنانەت نەخۆشخانەی تایبەت بە منداڵانیش بۆردومان کراوە. ئەو وێنانەی کە پیشان دەدرێن، زۆر ترسناك و ناخهەژێنن. میدیا عەرەبییەکان لەم بارەیەوە بە شێوەیکی چڕوپڕ ڕاپۆرت و دیکومێنت بڵاودەکەنەوە، بەڵام میدیا ڕۆژئاواییەکان هیچ لەم بارەیەوە باس ناکەن. ئەم بۆردومانانە زیاد لە پێش هانی تیرۆریستە سوننییەکانی نێو داعش دەدات و دەبێتە مایەی زیادبوونی ژمارەی چەکدارەکانیان. لە بەرانبەر هەر منداڵێکی کوژراو، کە لە ڕێگەی بۆردومانەکانی ڕۆژئاواوە دەکوژرێت بەلانی کەمەوە دە تیرۆریست سەرهەڵدەدەن.[١٣]

ڕۆژئاوا لە شکستە سیاسییە ناوخۆییەکانی پەندی وەرنەگرتووە، کە دەرئەنجامی هێرشکردنە سەر ئێراق و لیبیا و ئەفغانستان بووە. زیادبوونی سەرسوڕهێنەری ژمارەی تیرۆریستانیش کێشە و گرفتی زۆرتری دروست کردووە. منداڵیش تەنها یەکجار دەستی بە گەرمی دەسووتێ و پەند وەردەگرێ، بەڵام ڕۆژئاوا بەردەوام ستراتیژی زیانباری بۆردوومان بە کار دێنێت. دەڵێن ئەنیشتاین زۆر لەمێژە گوتویەتی: "دوو شت هەرگیز کۆتاییان پێ نایەت، یەکێك گیانلەبەران و ئەویتر گەمژەیی مرۆڤەکان." ئەنیشتاین سەبارەت بە گیانلەبەران زۆر دڵنیا نەبوو، بەڵام سەبارەت بە گەمژەیی مرۆڤەکان تا ئێستا پێچەوانەی قسەکەی ئەنیشتاین نەسەلمێنراوە. تەماشاکردنی شەڕی ئەمریکییەکان لە دژی تیرۆر بەسە بۆ ئەوەی بە جوانیی لە قسەکەی ئەنیشتاین تێبگەین.

لە ڕاستیدا تەنها عەرەبەکان دەتوانن لەگەڵ تیرۆریزمی عەرەبیدا بە جۆرێك شەڕ بکەن کە جارێکی دیکە ئەو تیرۆریزمە سەر هەڵنەداتەوە. داعش ئەو کاتە لە ئێراقدا

---

١٣- لێرەدا مەبەست ئەوەیە کاتێک ئەو بۆردومانانە خەڵکی بێتاوان دەکاتە قوربانیی، کەسوکاری قوربانییەکان دەچنە نێو گروپە تیرۆریستییەکانەوە .

شکست دەخوات کە گرووپە ناتەباکانی شیعە و سوننەی ئێراق دەست لە دوژمنایەتیی یەکتر هەڵگرن و شانبەشانی یەکتر ڕووبەڕووی داعش ببنەوە. کەمینەی سوننەی کە ڕۆژگارێك لە ئێراقدا دەسەڵاتداربوون، دوای شەڕی ساڵی ۲۰۰۳ و هاتنەژوورەوەی هێزەکانی ئەمریکا بۆ ئەو وڵاتە، بە شێوەیەکی رادیکاڵانە لە گەمە سیاسییەکانی ئێراق دوورخرانەوە. ئەو کەسانەی کە لە ڕابردوودا پەیوەندییان بە حیزبی دەسەڵاتداری بەعسەوە هەبوو بە توندیی خرانە ژێر ئازار و ئەشکەنجەوە. سوننەکان و بەعسییەکان بۆ بەدەستهێنانی مافە ڕەواکانی خۆیان و بەشداریکردن لە دەسەڵاتی ئێراقدا، چەندین جار پێشنیاری ڕێککەوتنی ئاشتیخوازانەیان خستە بەردەم بەرپرسە شیعەکان، من بۆ خۆم لە دوو کۆبوونەوەیاندا بەشداربووم.

بێگومان ئاشتەوایی نیشتمانی لە ئێراق دەبێتە مایەی لاوازبوونی داعش. بەو مەرجەی یەکەم جار گرووپە شیعە و سوننەکانی ئێراق چیتر لەگەڵ یەك شەڕ و ململانێ نەکەن، بەڵکوو دەبێ پێکڕا و دەست لەناودەست دژی داعش شەڕ بکەن. دووەم جاریش پێویستە دانیشتوانی شارە سوننەنشینەکانی موسڵ و فەللوجە چیتر بێ یەك و دوو باوەش بۆ داعش ناکەنەوە و هاوکاریی ئەو گرووپە توندڕەوە ناکەن. لە ئێستادا لەو ناوچانە بارودۆخەکە زۆر لەو کاتە خراپترە کە شیعەکان دەسەڵاتداربوون، داعش فاکتەرێکی وەڕزکەرە و خەریکە کەمکەم بەشداریی و دووبارە بەستنەوەی سوننەکان بە کۆمەڵگای ئێراق دەخاتە ژێر مەترسییەوە. لە ساڵی ۲۰۰۷ داعش کە ئەوکات هەڵگری ناوێکیتر بوو(ISI) ، دەتوانرا بە تەواویی و بۆ هەمیشە شکستی پێ بهێنرێت، چونکە ئەوکات هۆز و عەشیرەتە سوننەکان لە بەرانبەر ئەو پارە زۆرەی کە ئەمریکییەکان دابوویان پشتیوانیان لەو گرووپە توندڕەوە نەکرد. ئەم کارە بیرۆکەیەکی بچووك و نوێی ئەمریکییەکان بوو لە پاش ململانێی گەمژانەیان لە ئێراقدا. ئەگەر ئەمریکییەکان بە هەمان شێوە کە لەگەڵ ئیسرائیلدا مامەڵە دەکەن، لەگەڵ دنیای ئیسلامیشدا مامەڵەیان

بکردایـە، بێگومـان سـەرکەوتن لـە بەرامبـەر تیرۆریـزم جێگیرتـر دەبـوو، بـەڵام ئایـا ئەمریکییەکان لە بنەڕەتەوە خوازیاری شتی لەم جۆرەن؟

جارێکیتر دەیڵێمەوە، داعش گروپێکی تیرۆریستییە، کە کۆمـەڵێك هۆکـار و فاکتـەر بوونەتە مایەی دروستبوون و سەرهەڵدانی، بەڵام ئەگەر سیاسەتی ڕۆژئاواش ڕاستگۆ بێت دەبێت دان بەو ڕاستییەشدا بنێ کە سیاسـەتمەدارانی هاوشـێوەی جـۆرج بـۆش و دیك چینی و ڕامسفێڵد و تۆنی بلێر بەهۆی ئەو ژمارە زۆرەی کە بوونەتە قوربـانیی دەسـتیان، هـەر یەکـەیان بـەدوای یەکـدا تیرۆریسـتێلێکی زۆر خـراپتر و بـەدناوترن. هەمیشـە و لـە هەرکوێ، ئەوان دەستێوەردانی سەربازییان کردووە بە هەزاران و بگرە بـە سـەدان هـەزار خـەڵکی بێلایـەن و بێتـاوان بـە شـێوەی دڵهـەژێن و خـەمناك لـە بـەین چـوون. هـەروەها کۆمــەڵێکی زۆریــش ڕووبــەڕووی ســووکایەتی و دەســتدرێژی بوونەتــەوە. ئــەو شــێوازە ئەشـکەنجانەی، کـە ئەمریکییـەکان لـە زیندانـەکانی گوانتانـامۆ و ئـەبوغرێب و بـاگرام ئەنجامیان دا هەم سادیستی بوو هەم لە بەربەرێتیی سەدەکانی ناوەڕاست دەچوو.

سـەرەڕای هـەموو ئەمانـە زۆر بـە کـەمی گرتـەی ڤیـدیۆیی و وێنەیـەك لـە قوربـانیی بۆردومـان و موشـەکبارانەکانی ڕۆژئاواییـەکان دەسـت دەکـەوێت. هەربۆیـە چرکەسـاتی مەرگی دایکێك و کۆرپەکەی لە ئەنجامی فڕێدانی موشەکێکی ئەمریکی بۆ سەر ماڵەکـەیان هەسـتی ئێمـە نـاوروژێنێ. ئێمـە ئـەم کارەسـاتانە نـابینین، هـەر بۆیـە ئـەم قوربانیانـە بێناونیشان دەمێننەوە و کەسیش باسیان لێوە ناکات.

بە پێچەوانە، داعش هەراوهوریا لەسەر کوشـتنەکانی خـۆی دەنێتـەوە و مقۆمقۆیـەکی زۆر دروست دەکات و بە ئەندازەیەکی باش بوار بە ئێمـە دەدات تـا لەگـەڵ قوربانییـەکان پەیوەندیی دەروونی دروست بکەین و لەگەڵ ئەواندا ببینە یەك و هەست بـە ئازارەکانیـان بکەین. ڕۆژێك دەبینین دۆستەکانمان لە جلێکی ڕەنـگ پرتـەقاڵی فشـدا لـە بیبانێکـدا بـە داماویی لەسـەر ئـەژنۆ دانـراون. لـە تەنیشـتیانەوە دەعبایـەکی دەمـوڕوو داپۆشـراو بەدەمامکێکەوە خەریکی تیژکردنی چەقۆکەیەتی بۆ ئەوەی ملی ئەو خۆشەویستەی ئێمە

لێ بکاتەوە. ئەو دەعبا دەمامکدارە پاش کەمێك زۆر بە شێوەیەکی سادیستانە دەست بە سەربڕینی خۆشەویستەکانی ئێمە دەکات و بەم کارەش شتێکی دیکە لە ناخی ئێمەدا دەکوژێت. ئەو هەم ترس و تۆقین پەخش دەکاتەوە و هەمیش بڕیاری شەڕکردنمان لەگەڵ دەدات .

هەڵوێستی ڕۆژئاوا وەك هەمیشە جوامێرانەیە. لانیکەم زۆرێك پێیان وایە. وا هەست ئەکرێت ڕۆژئاوا بەرگریی لە بەها شارستانییەکانی دەکات، هەر بۆیە کاتێك لە تەلەفزیۆن بینەران چاویان لە بۆردومان و تەقاندنی موشەکەکان دەبێ، کە پێشتر وەك کردەیەکی ئەخلاقیی ناسێنراوە، هەست بە خۆشییەکی زۆر دەکەن. ئاخر ئەوان ئەو شوێنانەی، کە وێران دەکرێن و دەکرێنە گۆڕستانی مەرگبار نابینن، هەروەها زۆرجاریش قوربانییەکان ناناسن. ئایا بە ڕاستی ئەو کەسانەی دەبنە قوربانی ئەو بۆردومانانە، تاوانبارن، یان بێتاوان؟

داعش بۆ کوشتنی مرۆڤەکان ئاگایانە سوود لەو ڕێگا توند و ناحەزانە وەردەگرێت، کە لای ڕۆژئاواییەکان ناپەسەندە و ڕۆژئاواییەکان بەو شێوازە کوشتنانە قەڵس دەبن. بەشێکی بەرفراوان لە کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی بە بێلایەنی تەماشاکەری مەرگی خەڵکی بێتاوانن، ئەو خەڵکەی، کە بە ئامرازی موشەك و بۆمب و تۆپ و هاوەن و ڕەشاشەکانی ڕۆژئاوا دەکوژرێن. ئەوان ڕێك هاوشێوەی کوشتنە یاساییەکانی دەبینن، ئەو کوشتنانەی، کە بە ژەهر و لێدانی کارەبا لە سەر کورسی لە ڕۆژئاوا ئەنجام دەدرێن. چونکە ئەم جۆرە کوشتنانە لای کۆمەڵ تارادەیەك پەسەند کراوە. هەڵبەت ئەو چەقۆ درێژەی کە داعش مرۆڤی پێ سەردەبڕێت لە لیستی ئەو شێوازە کوشتنانەدا نییە کە لای ئەوان پەسەند کراوە. هەروەها ئاگرێك کە داعش بە دڵڕەقییەکی بێوێنەوە فڕۆکەوانێکی ئوردنی بە زیندوویی لە قەفەسێکی ئاسنیدا پێ سووتاند ئەوەش کوشتنێکی ناپەسەندە و لای ڕۆژئاوا نامۆیە. ژمارەیەکی زۆر لە قوربانیی هێرشە ئاسمانییەکانی ئێمەش (مەبەستی ڕۆژئاواییەکانە)، بە شێوەیەکی دەردناك و دڵتەزێن بە هێواشیی دەسووتێن و مەرگیشیان

سەرنجی هیچ کەس بەلای خۆیدا ڕاناکێشێت. هەروەك بڵێی ئەم بۆردومانکردنانە یاسایی بن و ئەگەریش سووتان بەهۆی تەقینەوەی بۆمبەکانەوە بێت، ئەوە هیچ نییە و بە کردەیەکی لاوەکیی سەیر دەکرێت و بە کارێکی نەخوازراوی ئۆپراسیۆنێکی سەربازیی لەقەڵەم دەدرێت!

گروپە شۆرشگێڕە سوورییاییەکان، کە ڕۆژئاوا هاوکاریی دارایی و سەربازییان دەکات، لەم جۆرە کوشتنانە ئەنجام دەدەن و خەڵکانێکی زۆریش سەردەبڕن، بەڵام ئەمانە بە نادیاریی دەمێننەوە و کەس باسیان لێوە ناکات. ئەگەریش دەنگۆیەکی لەسەر هەبێ ئەوە کەس گوێی پێ نادات و پشتگوێ دەخرێت، هەروەك شمشێری جەلادە سعودییەکان، کە ڕۆژئاواییەکان نایبینن. بەداخەوە میدیاکان وەك ئەوەی کە هەیە ڕوماڵی ڕاستی و حەقیقەتەکان ناکەن و خۆیان لە قەرەی ئەم گێرمەوکێشانە نادەن.

داعش لەم ڕووەوە هیچ سکاڵایەکی نییە. ئەو دەیەوێت توندڕەویی بێسنووری بە سەرانسەری دونیادا بڵاوبکاتەوە، تا لەم دەروازەیەوە تۆوی ترس و هەرەس و تۆقین لە دڵی دوژمنەکانیدا بچێنێت، بە تایبەت کاتێك لەڕووی تەقەمەنییەوە هاوشانی دوژمنەکانی نییە و زۆر کەمترە لەوانە. داعش دەیەوێ دنەی ئەمریکا بدات و کێشە ناوخۆییەکانی ئەو وڵاتە گەرم و ئاڵۆزتر بکات، مەبەستی وایە ڕابەرانی پلەیەکی ئەو وڵاتە (کەسی یەکەم) توڕە و ناچار بکات، بۆ ئەوەی بڕیاری ڕەوانەکردنی هێزی زەمینی بدات

خافێر سۆلانا، سەرۆکی پێشوی یەکێتیی ئەوروپا، هەروەها گۆڤاری تەندروستیی گشتیی ئەمریکا[14] لە مانگی جونی ٢٠١٤ بەم ئەنجامە گەیشتن کە ٩٠٪ی کوژراوی دەستی جەنگە مۆدێرنەکان خەڵکانی مەدەنین. بەگوێرەی ئەمە بێت جەنگ و پەلاماردانەکانی ئەمریکاش بە بیانووی داکۆکیکردن لە مافەکانی مرۆڤ بە تیرۆریزم هەژمار دەکرێن، بەڵام تیرۆریزمی دەوڵەتی. شارستانێتێك دان بەوەدا نەنێت، کە جەنگی جۆرج

---

14 - American Journal Of Public Health

بۆش لە ئێراق جەنگێکی تیرۆریزمانە بوو، ئەوە شارستانییەت نییە. دەزانم لە ڕۆژئاوا کەس بۆی نییە لەم بارەیەوە بێ پەردە بۆچوونی خۆی لەسەر ئەم بابەتانە دەرببڕێت، بەڵام ژیان زۆر کەمترە لەوەی کە مرۆڤ لە پێناویدا لە ڕاستییەکان لابدات و هەقیقەتەکان بشارێتەوە .

ئێمە لە دنیایەکی پڕ لە درۆدا دەژین، دنیایەك کە پڕە لە شەڕخوازانی دڵڕەق و تیرۆریستانی بێبەزەیی. هیچ یەك لەم دووانە بەدوای خۆشترکردن و بە ئینسانیکردنی دنیای ئێمەوە نین. دڵەڕاوکێی هەریەك لەم شەڕخوازانە دەسەڵات و دونیا و ناوبانگە. ئەوان لەو پێناوەدا هەموو شتێك بەکار دێنن. ئەوان بێشەرمانە بە خراپ سوود لە ڕێز و پیرۆزیی باوەڕ و ئایینەکەیان وەردەگرن، هەروەها ئەمانە بە شێوەیەکی خراپ سوود لە گیانی هاو رەگەزەکانی خۆیان وەردەگرن. ئەگەر جەهەنەمێك هەبێت دیسان لەوێ چاویان بەیەکتر دەکەوێتەوە. لەبەر ئەوەی هەردوویان هەر ڕۆژە یاسا بنچینەیی و مێژووییەکانی پێکەوەژیانی مرۆڤایەتیی پێشێل دەکەن، بڕیاری پێنجەم لە دە بڕیار کە دەڵێت: مەکوژە !.

# بەشی سێیەم

## گەڕان بەدوای حەقیقەتدا

لە زۆرێك لەو دادگاییانەی، كە وەكوو فێرخواز یاخود دواتر وەكوو دادوەرێك بەشدارییم تێدا كردوون، هەستەكانم زۆرجار لە بەرزونزمیدا بوون. لە دوای ئەوەی گوێبیستی وتاری داواكاری گشتی دەبووم، تاوانبارەكەم وەكوو كەسێكی كڵاوچیی و فێڵباز سەیر دەكرد، بەڵام هاوكات كە گوێبیستی وتاری پارێزەری تاوانبارەكە دەبووم یەكراست بۆچوونم لەسەر هەموو شتەكان دەگۆڕا. هەڵسەنگاندنس مافی كەسێتیی و دیاریكردنی تاوانبار و بێتاوانیی كەسەكان یەكێك لە سەختترین بڕیارەكانی ژیانم بووە. ئەوەی من دەمبینی كەموزۆر لە هیچ یەكێك لە دادگاییەكاندا حەقی تەواو تەنها بە یەك لایەنی دادگاییكردنەكە نەبوو، كەمتازۆر كۆمەڵێك بەڵگەی دیكەش هەبوون كە لە بەرژەوەندیی لایەنەكەی تری دادگاییەكە بوون. كەم جار هەستم دەكرد ئەو بڕیارەی كە دادگا بۆ دواجار بڕیاری لەسەر دەدات، بڕیارێكی دادپەروەرانەیە.

هەر بۆیە ئەو وانەیە لە ژیان فێربووم، كە بۆ دۆزینەوەی هەقیقەتەكان دەبێت لەگەڵ هەر دوو لایەنی ناكۆك قسە بكەم. تەنانەت ئەگەر هەموو جیهانیش پێشتر بڕیاری خۆی دابێت.

"بواری قسەكردن بە ئەو لایەنەكەیتری شەڕ و دەعوا بدەن"، یەكێك لە بنەما گرنگەكانی یاسای ڕۆمایە. بەمشێوەیە لە دەیەی هەشتاكاندا، هاوڕێ لەگەڵ چەند گروپێكی جیاجیای جیهادیی ڕۆیشتمە ئەفغانستانی ژێر دەسەڵاتی یەكێتیی سۆڤیەت. دوای ئەوەش دوو جار چوومە مۆسكۆ و لەگەڵ مارشاڵ(سگرنی ئاخرومیف) سەرۆكی ناوەندی سوپای یەكێتیی سۆڤیەت چاوپێكەوتنم كرد، هەرچەندە پێشتر ڕابەری یەكێتیی سۆڤیەت بە ئاشكرا ڕایگەیاندبوو، هەر كاتێك منی وەدەست بكەوێ یەكەم جار شەلاقم لێ

دەدات، پاشانیش ئێعدامم دەکات. پێکەوە چەندین کاتژمێر لەمبارەیەوە قسەمان کرد، کە ئایا دەرچوونی یەکێتیی سۆڤیەت لە ئەفغانستان کارێکی ژیرانەتر نییە؟ ئاخرومیف پیاوێکی زۆر ڕك و ڕاست بوو کە دەیتوانی گوێ بۆ قسەکانم ڕابگرێت.

لە جەژنی(پاك) ساڵی ١٩٧٥ لە(پونتا ئارنا) لەگەڵ(ئاگوستو پینوشەی) دیکتاتۆری چیللی دیدار و چاوپێکەوتنم کرد، بۆ ئەوەی سەبارەت بە ٤٥٠٠ زیندانی مارکسیست کە زۆربەیان زیندانی سیاسی بوون گفتوگۆ بکەم. هەروەها بۆ ئەوەی لە بارودۆخی چیللی دوای ڕووخاندنی سلڤادۆر ئالندە تێبگەم بۆ ئەوێ ڕۆشتم. دواتر چوومە سانتیاگۆی پایتەختی چیللی، بۆ ئەوەی لەگەڵ سەرانی حیزبی بەرهەڵستکاری دیموکراتی مەسیحیی، ئێدوارد و فرای مونتالوا و پەتریسیو ئایل ڤین گفتوگۆ بکەم. هەوڵدان بۆ خستنەڕووی وێنەیەکی واقیعی لە ناوچەکە، بووە مایەی ئەوەی لە ئەڵمانیا بە توندیی دژایەتیی بکرێم و ڕووبەڕووی تانەوتەشەر و بوختان و درۆودەلەسە ببمەوە. هەر ئەو دەور و دەمە بوو کە منیان بە(دۆستی دیکتاتۆر) ناونا. تەنانەت دواتریش، ئازادکردنی هەزاران بەندکراو هیچ گۆڕانکارییەکی لە لافیتەکانی پینوشە و لە نێو هەراوهوریای شێتانەی ڕەخنەگران نەهێنایە ئاراوە.

سەرەڕای ئەمەش، هێشتا پێم وایە بۆ دۆزینەوەی هەقیقەتەکان دەبێ لەگەڵ هەردوولایەنی ناکۆك قسە بکەم. زۆرتر بەدوای بیستنی هاواری ئەو شۆڕشگێڕانەوە بووم کە دژی ئەو کەسانە ڕاپەڕیبوون، کە لەسەر کورسی خۆیانەوە داوەرییان بۆ جیهان دەکرد و لەوە دڵنیا بوون کە هەقیقەت تەنها لای ئەوانە. چەندین جار لەگەڵ حامد کەرزای سەرکۆماری ئەفغانستان و لەگەڵ ڕابەری تاڵیبانی ئەفغانستان گفتوگۆم کردووە. دوای ئەوە لە دیدی بەرپرسە باڵاکان و لە دیدی پلاندانەرانی ستراتیژی و زۆرێك وەك هاراند، کە بڕیار لەسەر ستراتیژییەکان دەدەن، بە(وتەبێژی تاڵیبان) ناو دەبرێم و لە دیدی زۆر کەسی دیکەیشەوە، بە کورتیی و بە پوختیی بیڵێم بە (دۆستی تیرۆریست) لەقەڵەم درام.

دوای چەندین گفتوگۆ و چاوپێکەوتن لەگەڵ بەشار ئەسەد دووبارە مۆرك و مۆركی "دۆستی تیرۆریست" بوویەوە نسیبم .

مەبەست لە ئەنجامدانی ئەم دیدارەی ئەسەد تەنها ئامادەكردنی ڕاپۆرتێك بۆ تەلەفزیۆنی ئشپیگلی[15] جیهانی و ستۆدیۆی ARD نەبوو، بەڵكوو زیاتر بەمەبەستی دروستكردنی پەیوەندیی ڕاستەوخۆ لەنێوان ئەسەد و دەوڵەتی فیدراڵیی نەتەوە یەكگرتووەكانی ئەمریكادا بوو. بڕوای تەواوم بەوە هەبوو ئەمریكا دەتوانێ لە ڕێگەی سعودییە و قەتەری هاوپەیمانییەوە، كە چەك بۆ شۆڕشگێڕان دەنێرن، بە جۆرێك ڕێگەچارەیەك بۆ كێشەكانی سووریا بدۆزێتەوە. ئەسەد ئامادەیی خۆی بۆ ئەو سازانە پیشاندا، كە من پێشتر ئەمریكام لێ ئاگادار كردبووەوە، بەڵام ئەمریكا بەم كارە ڕازیی نەبوو و سوور بوو لەسەر ئەوەی، گفتوگۆ لەگەڵ ئەسەد نەكات .

جارێكیتر شەپۆلێك لە ڕەخنە و تووڕەیی بە سەرما ڕژا. "ئەڵمانیای شەریف" ناوچاوانی كرژكرد.ئەو سیاسەتمەدار و ڕۆژنامەنوسانەی، كە ئامادەبوون بۆ دیدارێك لەگەڵ جۆرج دەبلیو بۆشی تاوانكار هەموو شتێكیان ببەخشن، ڕق و تووڕەیی دایگرتن و بەردەوام دەینگوت چلۆن دەكرێ لەگەڵ كەسێك قسە بكرێ، كە ئەم هەمووە مرۆڤەی كوشتووە. جارێكیش گۆڤاری دی ڤلت[16] نووسی: "ئەم گفتوگۆیە كەمێك لە گفتوگۆی پێشووی ئەو ڕۆژنامەنووسە دیارانە دەچێت، كە خاوەنی بیرۆكەیەكی نادیار بوون و لە دەورانی جەنگ لەگەڵ یوزیف ستالینی میهرەبان و دلێر چاوپێكەوتنیان ئەنجامدا، یاخود پێش جەنگ خەریكی پیاهەڵداگوتن بە(برگهوف)ـی دەسەڵاتداری بەئەزموون بوون. ئەو كەسەی كە تەنها خوازیاری ئەو شتە بوو كە هەمووان خوازیاری بوون و داوایان دەكرد، بۆ نموونە مافی سەربەخۆیی نەتەوەكان و مافی سەربەخۆیی خەڵكی ئەڵمانیا".

---

15 - Weltspuegel
16- Die Welt

ستالین و هیتلەر! دوو ستەمکاری بێوێنەن، مەگەر لەم دووانە ستەمکارتر و وێرانکەرتر هەبوو. ڕەنگە هۆکاری ئەو هێرشە میدیاییانە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی پێش من هیچ یەکێك لە ڕۆژنامەنووسە ڕۆژئاواییەکان گفتوگۆی توندی لەم جۆرەیان لەگەڵ سەرکۆماری سووریا ئەنجام نەدابوو، هەربۆیە کەسیش پێی خۆش نەبوو من ئەو کارە بکەم، هەروەها چونکە لەبەرانبەردا گفتوگۆیەکی زۆرم لەگەڵ بەرهەڵستکارانی ئەسەد و شەڕکەرەکانی قاعیدە و سوپای ئازادی سووریا و باقی گروپە شۆڕشگێڕەکانی سووریا ئەنجام دابوو، بەڵام ئەوەندە سەرنجی پێنەدرا. ئەوەشیان کە سیاسەتی ڕۆژهەڵاتی خودی ویلی برانت تەنها لە ڕێگەی گفتوگۆی ئەو لەگەڵ لئۆنیت برژنفی بێبەزەیی دروستبوو، لە دیدی ڕەخنەگرەکانمەوە هەرگیز وەکوو بەڵگەیەك لەسەر بێتاوانیی من هەژمار نەدەکرا.

ڕۆژئاواییەکان جیهانیان بۆ دوو بەشی باش و خراپ دابەشکردووە، بە بۆچوونی جیمس کارتەر – سەرۆکی پێشووی ئەمریکا– لە زەمەنی جۆرج دەبلیو بۆشدا حەزمان بە گفتوگۆکردن لەگەڵ دوژمانەکانماندا نەکردووە. کارتەر ئەم گوتەیەی لە ساڵی ٢٠٠٥دا نووسی، ئەو کاتەی کە جۆرج دەبلیو بۆش ڕازیی نابێ دیدارێك لە دیمەشق، ئەنجام بدات دیدارێك کە پێشتر ڕێکخراوە و ئامادەسازیی بۆ کراوە. بە بۆچوونی ئەوان میحوەری چاکەکان هەرگیز لەگەڵ میحوەری خراپەکان گفتوگۆ ناکات و نابێتیش گفتوگۆ بکات. هەربۆیە ئەگەر کەسێك ئەم کارە بکات، ئەوا دەبێ چاوەڕوانی پەراوێزخستنی کۆمەڵایەتیی خۆی بێت.

خانمی ئینس پول، سەرنووسەری ڕۆژنامەی تاز ، لە کۆتایی ساڵی ٢٠١٤دا لەوپەڕی ئەدەب و ڕێزەوە شتێکی لەم شێوەی بۆ نووسیم :

"بەڕێز تۆدنهۆفەری ئازیز! ڕۆژنامەی تاز نووسینە پێشنیارکراوەکەی ئێوە چاپ ناکات، "دەستەی نووسەران" بەڕای زۆرینەیەکی بەرچاو لەگەڵ بڵاوکردنەوەی نووسینەکەتان نەبوو. هۆکاری ئەم چاپنەکردنەش بەهۆی بۆچوونی ئاشتیخوازانەی

ئێوەوە نییە، بەڵکوو کێشەکە لەسەر ئەو هەڵوێستەیە، کە لەم چەند ساڵەی دواییدا وەکو نووسەرێك زۆر قسەت لەسەر کۆمەڵکوژیی و کێشەکانی تایبەت بە ئەسەد کردووە. من بڕیاری دەستەی نووسەرانم پەسەند دەکەم. سەرسپێراوی[17] ئێوە ئینس پول، سەرنووسەری ڕۆژنامەی تاز."

ئایا نەدەبوو وەڵامی ئەم نامەیە بدەمەوە؟ من وەڵامم دایەوە، چون بەهەرحاڵ هیوادارم ئەڵمانیا بۆچوونی ڕازی نەبوونی لەسەر دانووستان بگۆڕێ. هیوادارم لەوە تێبگەن، کە دانووستان لەگەڵ دیکتاتۆرەکانیش، زۆر باشتر لە شەڕ ە. هەنوکە دەبێت لەگەڵ دوژمنەکانی خۆم گفتوگۆ بکەم، بە پێچەوانە جیهانمان لە ئاژاوەی شەڕە بێکۆتاییەکاندا لەنێو دەچێت. بۆیە لە وەڵامدا نووسیم:

"خانمی ئینس پولی ئازیز، لەڕاستیدا کە نامەکەتانم بینی تووشی شۆك و سەرسووڕمان بووم، وەك کەسێك بۆ دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەکی ئاشتیخوازانە بۆ سووریا نیوەی دنیا گەڕاوم، لەگەڵ زۆرێك لە دەوڵەت و ڕێکخراوە بەرهەڵستکارەکان گفتوگۆ و چاوپێکەوتنم کردووە و بە مەبەستی دروستکردنی ئەندامی دەستکرد[18] بۆ نزیکەی ٥٠ قوربانیی مێردمناڵی شەڕی سووریا هەزاران یۆرۆم خەرج کردووە. وەکوو کەسێك کە هەموو مانگێك تێچووی خێزانێك لە شاری حمس دابین دەکات، خێزانێك کە نانپەیداکەرەکەی لە شەڕدا کوژراوە. بە ڕاستیی لوتبەرزیی دەستەی نووسەرانی ئێوە تووشی شۆك و سەرسامییەکی زۆری کردم. بێگومان نووسینی نامەیەکی ئابڕووبەری لەم جۆرە لە نووسینگەی تایبەت بە چاپ و بڵاوکراوەکان، هەستێکی سەیر و خۆشی هەیە. پیرۆزتان بێ! من هەمیشە حەزم لێ بوو قارەمانە ڕاستەقینەکانی دنیا بناسم. ئێستا دەزانم دەبێ ئەو قارەمانانە لەکوێ ببینمەوە."

---

١٧- ارادتمند

١٨- عضو مصنوعی

یورگن.تۆدنهۆفەری سەرسوورماو. لە مونیخ.

هیچ کات تورەبوونی هەندێك لە میدیا و چینە باڵاکانی ئەڵمانیا، ئازاری منیان نەداوە. هەروەها هەڕەشەی بەردەوام بۆ کوشتن، لە لوتکەی گفتوگۆکردن دەربارەی سووریا، کە پیتەر شۆل، لاتوری خوالێخۆشبوو لەبەر هەندێك مەسەلە ڕەخنەی لێدەگرت. ڕۆژێکیان وەکوو هەڕەشە تەنافێکی دار و گرێیەکی گەورە و ئەڵقەیەکی خڕ لە پێش دەرگای نووسینگەکەم هەڵواسرابوو. یەکێکیتر لە هەوادارانی شۆڕشگێڕەکانی سووریا لە فەیسبووك نووسیبووی: "تۆدنهۆدنکۆتەر"تۆدنی سەگ و چەپەڵ!" پارە لە ڕێکخراوی مۆساد وەردەگریّ!!! مەرگ بۆ هۆفەر!!!" سەربازێکیتریش نووسیبووی: "عەجەب چەپەڵییەك! سەرهەنگ کلاین بەچکەی کردووە و زیاد لە ١٠٠ چەپەڵی خستۆتەوە و سەربازە ئەڵمانییەکانی ڕزگار کردووە، هیوادارم تۆدنهۆفەر لە هێرشێکی خۆکوژیدا بتۆپێنرێت!!!" لە کەناری ئاڵای میللی ئیسرائیلەوە نووسرابوو: " هەرچی زووترە خوا تۆدنهۆفەر بمرێنێت." موسڵمانێکی توندڕەویش بە تورەییەکەوە دەیگوت: "تۆیەکی چەپەڵ لە نێو وڵاتەکانی ئێمە زۆرترین متمانەیان پێت هەیە و لەولاشەوە تۆ ئێمە دەفرۆشیتە ئەمریکییەکان... تۆ بە مەرگێکی سرووشتی نامریت، هۆفەر:، یەکێکیتر نووسیبووی: "تۆ نابێ بە زیندوویی بمێنییەوە! سەری تۆدنهۆفەری نەفرەتیی لێ بکەنەوە!!!" هەروەها چەپێکی توندڕەوی گەرموگوڕ نووسیبووی: "بێقیمەتی چەپەڵ! سەرت دەبڕم!"

تەنها شتێك کە دەیزانم ئەوەیە نابێ گوێ بە قسەی ئەم و ئەو بدەم، حەز و خولیای من بۆ دۆزینەوەی هەقیقەت و ڕاستییەکان، زۆر لەوە زیاترە بەم شتانە و بە قسەی ئەم و ئەو سارد ببمەوە.

# بەشی چوارەم

## ڕۆیشتن بەرەو سەنگەری داعش

پێشتر ئاماژەم بەوە دابوو کە ناردنی چەك لە عەرەبستانی سعودیی و قەتەرەوە، بووەتە هۆی توندڕەویی شۆڕشی ئاشتیخوازانەی خەڵکی سووریا. من تەواو لەگەڵ خۆپیشاندانە ئاشتیی و دیموکراسییەکانی تونس و میسردا هاوڕا بووم، بەڵام پاش ئەوەی بەشێك لەوان دەستیاندایە چەك و بەکاریان هێنا، خەونی خۆپیشاندەرە ئاشتیخوازەکانی سووریاش کۆتایی پێ هات. لەو دەمە بەدوا ڕابەڕایەتیکردنی شۆڕش کەوتە دەستی گروپێکی دیکەی خەڵك. خۆپیشاندەرە ئاشتیخوازەکان خرانە پەراوێزەوە و کەمە کەمە پاشەکشێیان پێ کرا.

یەکە شۆڕشگێڕە چەکدارەکان بە خێراییەکی سەرسووڕهێنەر بوونە کەسانێکی توندڕەو. سەردەمانێك ئاندریە گلوکزمەن، فەیلەسووفی فەرەنسیی، لە ئیشپیگڵ گوتی: "ڕێگا تیرۆریستییەکان کەم تا زۆر ئامانجی هەموو بزووتنەوە ئازادیبەخشە مۆدێرنەکانیان، لە جەزائیرەوە بیگرە تاوەکوو ڤێتنام، ژەهراویی کردووە. ڕێکارە تۆقێنەرەکان جوانترین و کاملترین پرۆگرام و بیرۆکە نابووت دەکەن." ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان زۆر بە خێرایی گەشە و تەشەنە دەکەن. سەرەتا بەرەی نوسرەی نزیك لە قاعیدە، پاشان گروپێکیتر کە مەنزلگەیان ئێراق بوو، زۆر گەشەی کرد، ئەم گروپە هەرجارەی بە ناوێکەوە لە ئێراق دەردەکەوتن، ئەم گروپە بۆ ناوەکانی دەوڵەتی ئیسلامیی ئێراق، دەوڵەتی ئیسلامیی ئێراق و شام (داعش) و دەوڵەتی ئیسلامی (ISIS,ISIL , ISI, IS)ناوی خۆیان گۆڕیوە .

هۆشدارییە بەردەوامەکانی من لەمەڕ نوێبوونەوەی هێزی ڕێکخراوە تیرۆریستییەکان لە ئەڵمانیا بە تیۆری پیلانگێڕیی لەقەڵەم درا و پشتگوێ خرا. من مەبەستم ئەوە بوو جیهادییە بەناو میانڕەوەکان سووک و چرووک بکەم، چونکە تەنانەت ڕابەری سوپای ئازادی سووریا، کە ڕۆژئاوا بە میانڕەو دەیناسێنێت، منی لەوە ئاگادار کردەوە کە سەربازەکانی دەستەدەستە و تاقم تاقم دەچنە نێو ریزی گروپە توندڕەوەکانەوە. چونکە بەرەی نوسرە و داعش لەوان خۆشحیسابترن، لەوێ پارەیەکی باشیان پێدەدەن و بێباکانەتر و بێبەزەییانەتریش شەڕ دەکەن. بەڵام بەداخەوە ئەوکات ڕۆژئاوا ئامادەی کۆکردنەوەی زانیاریی لەسەر ئەم گۆڕان و پێشهاتانە نەبوو. لە مانگی مەی ٢٠١٤دا، کاتێك ئامادەبوونی بەشار ئەسەدم لەسەر ئاڵوگۆڕکردنی زانیاریی دەربارەی ڕێکخراوە تیرۆریستییەکانی ئەمڕۆی سووریا بە ئەمریکا ڕاگەیاند، ویلایەتە یەکگرتووەکان بەم کارە ڕازیی نەبوو. هەرچەندە هەرگیز پێویستی بە گفتوگۆکردن لەگەڵ دەوڵەت نەبوو، بەڵام وەڵامە منداڵانەکەی ئەمریکییەکان بەم شێوەیە بوو: "ئێمە لەگەڵ ئەم خوێڕییە گفتوگۆ ناکەین." هەڵەیەکی دراماتیکی بوو! و مەسیحییەکان، شیعەکان، یەزیدییەکان و هەموو جیهان باج و قوربانیی خوێناوییان لەو پێناوەدا. ڕێژەی سەرکەوتنەکانی داعش، نەتەوە یەکگرتووەکانی ئەمریکای تووشی شۆك کرد، هەر ئەو ئەمریکایەی، کە پێشتر ئامادە نەبوو شتێك دەربارەی تیرۆریزم لە سووریا بزانێت .

لەمانگی جونی ٢٠١٤، کاتێك کەمتر لە ٤٠٠ شەڕکەری دەوڵەتی ئیسلامیی ئێراق (داعش)، لە شاری سوننەنشینی موسڵ، ٢٠ هەزار سەربازی شیعەی ئێراقی و هەزاران پۆلیسیان کردە دەرەوە، بڕیارمدا هەر چۆنێ بووە سەردانێکی موسڵ بکەم. چونکە ئەم شارە دوو ملیۆن کەسییەم لە ڕێگەی سەفەرەکانی پێشترمەوە بۆ ئێراق دەناسی و نەمدەتوانی باوەڕ بە سەرکەوتنی شەڕکەرەکانی داعش بەسەر سوپای مۆدێرنی ئێراقیدا بکەم. هەربۆیە زەنگم بۆ هاوڕێ سوننەکانم لە موسڵ لێدا و لێیانم پرسی، ئایا دەتوانن هاوکارییم بکەن بۆ ئەوەی بچمە نێو شاری موسڵی داگیرکراوەوە؟ ئەوانیش بەم شێوەیە

وەڵـامی منیـان دایـەوە: "هـیچ ئەگـەرێك نییـە بـۆ ئـەم كـارە." ئـەوان تـازە لـە موسـڵ هەڵهاتبوون و چیتر زاتی گەڕانەوەشیان بۆ ئەو شارە نەبوو.

هەروەها زەنگم بۆ ئەندامانی بەناو"بەرگریی سوننە" لێدا، ئەوانەی کە لـە سـەرەتادا بەرانبەر بە هێزەکانی جۆرج بۆش بـە باشـی شـەڕیان کردبـوو، بـەڵام دیسـان ئـەوانیش ئامادە نەبوون هاوکارییم بکەن بۆ ئەوەی بچمە نێـو شـاری موسـڵەوە. هەرچـەندە هێـزە بەرگریکارە سوننەکان لاف ئەوەیان لێ دەدا، کە لە موسڵ و دەوروبەری ۲۰۰۰۰ چەكداری ئامادەی شەڕیان هەیە، بەڵام ترس لـە داعـش زۆر لەمـە زیـاتربوو. ئاشـكرابوو ئـەوان بـە کلاشینکۆفەکانیانەوە لەبەرامبەر چەکە مۆدێرنەکانی داعش، کە لە ڕێگەی هەڵاتنی سـوپا و هێزە ئێراقییەکانەوە وەکوو دەسـتکەوت چـنگیان کـەوتبوو، هـیچ شانسـێکیان نـەبوو. بتەوێت و نەتەوێت بارودۆخەکە زۆر ئالۆز بوو.

بۆ تێگەیشتن و شـارەزابوون لـە بـارودۆخی ناوچـەکە لەگـەڵ فریـدریکی کـورِم بـەرەو هەولێر پایتەختی هەرێمی کوردستانی ئێراق ڕۆشـتین. ئـەم شـارە لـە ۹۰کم ڕۆژهـەڵاتی شاری موسڵە، لـەوێ لەگـەڵ کـوردە دەستڕۆیشـتووەکانی نێـو حکومـەت و دانیشـتووانی هەڵاتووی شاری موسڵ و ئەندامانی بەرگریکاری سوننە چاوپێکەوتنمان کرد، بـەڵام هـیچ کام لەوان ئامادەییان نیشان نەدا بۆ ئەوەی هاوکاریی ئێمە بکەن بۆ چوونە نێو ناوەنـدی نوێی داعشـەوە. هەربۆیـە لـەوێ بەناچـار بڕیارمانـدا سـەردانی دوو ئۆردوگـای پەنابـەران بکەین و دواتر بچینە گوێڕ، کە ناوچەی شەڕی نێوان پێشـمەرگە کوردەکـان و داعشـەکان بوو. گوێڕ دەکەوێتە ٦٠ کیلۆمەتری باشووری ڕۆژئاوای شاری هەولێرەوە. لێرەدا ڕووداو و پێشهاتەکانی ۲۰ـی(مـانگی ئوت)ـی ۲۰۱٤،ەمـان تۆمـارکرد. پلـەی گـەرمی هـەوای دەرەوە ٤٣ پلەی سیلیزییە و کەشێکی گەرم و لەبار بوو.

لە سەردانی یەکەمین ئۆردوگادا، نزیکی ۳۰ هەزار کەس دەبینین کە لە ناو خێمـەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان جێگیربوونە، ئەو خەڵکەش تێکەڵە لـە خـەڵکی سـوننە، شیعە و ئێزیدی بوون. هیچ خزمەتگوزارییەك نییە. هەرچەندە لـە ڕۆژێکدا تـەنها یـەکجار

شتێك بۆ خواردن وەچنگ دەکەوێت، بەڵام هیچ کەس سکاڵا ناکات. تەنانەت دەبینین لە چاڵی زێرابەکاندا ژنەکان سەرقاڵی جلشۆردنن و منداڵەکان سەرگەرمی یاریکردنن. هەمووان هەوڵیان دەدا بە باشترین شێوە سوود لە بارودۆخەکە وەربگرن. هەرکەسە و کارێکی هەیە و دەبێت ئەنجامی بدات. ژیان سەرەڕای ئەوەی سەخت و دژوارە، بەڵام لێرە بەردەوامە. ئەوان هەموو شتێکیان بەجێهێشتووە، لە هەموو شتێك چاوپۆشییان کردووە. زۆریان بینەری ڕووداوی ترسناك و تۆقێنەر بوون. کێ دەزانێت ئەوان کەی و ئایا دەکرێت جارێکی تر بگەڕێنەوە نێو ماڵەکانیان؟ زۆربەی ئەو خەڵکە لە موسڵ، کە هەنووکە لەژێر دەسەڵاتی داعشدایە، هەڵاتبوون. هەتا ئەو دەمەی گۆڕان بەسەر بارودۆخەکەدا نەیەت ئەوان هەر لێرە دەمێننەوە.

لە کاتی ڕۆشتندا دەبینم کە منداڵەکان بە بتڵی بەتاڵی پلاستیکی یاریی فوتبۆڵێن دەکەن. لەگەڵ خۆمدا بیر لەوە دەکەمەوە فوتبۆڵی کوڵانیی لەوسەری دنیاش هەیە. چەند چرکە دواتر، خۆم دەبینم لە گەرمەی قەرەباڵغیی خەڵکدام و هەوڵ دەدەم بتڵێك بە دەست بێنم، بۆ ئەوەی منیش بۆ چەند مەتری ئەولاتر شووتێکی پێ لێ بدەم یان مراوغەیەکی پێ بکەم. منداڵەکان خەریکن هاوکاریم دەکەن. هەرچییەك بێت کەسێکی گەورەتر لە خۆیان گەمەیان لەگەڵ دەکات. جا ئەو کەسە پیاوێکی بیانییشە!

فریدریك بە چەند لاوێك، کە هۆگری بیستنی قسەکانین و لە دەوری کۆببوونەتەوە گوتی: "ئێمە ئەڵمانین. ئۆهـ، ئەڵمان! قارەمان و پاڵەوانی جیهان!" فریدریك و لاوەکان پێکڕا چەپڵە لێ دەدەن. دواتر فریدریك دەبینێت کە یەکێك لە لاوەکان درێسی ئیتاڵیای پۆشیوە. فریدریك پێدەکەنێت و دەڵێ، لە ڕاستیدا دەبووایە درێسی هەڵبژاردەی ئەڵمانیای لەبەردا بووایە. ئەو بە درێسی هەڵبژاردەی ئیتاڵیاوە ناتوانێت پۆز لێ بدات، بەڵام فریدریك دەزانێت کە دەغدەغەی منداڵەکانی ئێرە لە بنەڕەتدا شتێلێکی ترە.

لەدوای چارەکەسەعاتێك لە ئارەقدا تەڕ دەبم. بەڵام ئەم ١٥ چرکە فوتبۆڵە بە تەواویی حاڵمی باشتر کردوە. دەکەوینە ڕێ. لە ئۆتۆمبیلەکەدا، ئەو کاتەی باسی

فوتبۆلی کۆلانەکانمان دەکرد، بیرم کەوتەوە کە کۆلە پشتییەکەم لەگەلّ هەموو پارە و پۆسپۆرتەکەم لە کەمپەکە بەجێ هێشتووە. یەکڕاست دەگەڕێینەوە .

بەلّام لەناکاو خۆلّبارینێکی خەستی لماوی هەلّدەکات. خۆلّبارینەکە تا دێت توندتر دەبێتەوە، بەشێوەیەك وای لێ دێت کە ئیتر هیچ شتێك لە دەوروبەر نابینم. هەموو شتەکان بەرەو لای ترۆمبێلەکە دێن. بەرد، کەسەك، لقی دار، لم و خاشاك و زبلّ دێن و بەر ترۆمبێلەکە دەکەون و تەقوتۆق دەنێنەوە. ئێمەش خۆمان دەچەسپێنینە کورسییەکانەوە و دەستەکانیشمان بۆ پاراستنی سەروچاومان دەکەینە قەلّغان. دەنگی پیاکێشانی شتەکان بە شووشەی ئۆتۆبیلەکەماندا هێندە بەهێزە دەترسین شووشەکان بشکێنێت. هاوکات تەرزەبارین دەست پێ دەکات، بەلّام لەنێو ئەم هەمووە ژاوەژاوەدا دەنگی بارینەکەی هێندە بەر گوێیەکان ناکەوێت. من هەر بیرم لای ئەوەیە ئەو ئۆتۆمبیل و ئامرازانەی گواستنەوە کە بەرەو ڕوومان دێن بە ئێمەدا نەکێشن !

لەناکاو هەموو شتێك کۆتایی پێ دێت. دووبارە پێشەوەمان ڕوون دەبێتەوە و مەودای بینینمان ڕۆشنتر دەبێت. بەلّام باران لە پەسا دەبارێ و خۆشی ناکات. شووشەی پێشەوەی ئۆتۆمبیلەکە ورد بووە. بە ترسولەرزەوە بەرەو لای کەمپەکە دەڕۆین. فریدریك لە ژێر بارانێکی بەخوڕدا دادەبەزێت و دەچێتە نێو ئۆردوگاکەوە. کیفەکەم هێشتا لەو شوێنەیە کە بەجێمان هێشتووە، لە نزیکی گۆڕەپانی یارییەکە و هەموو شتێك لەجێی خۆیەتی. بەختم هەبوو لەوەی لەگەلّ منداڵێلێکی باشدا یاریی فوتبۆلّم کردبوو. فریدریك تەواو خووساو و تەڕ بووە. چاکەتەکەم لەبەر خۆم دادەکەنم و بەوی دەدەم.

دووەمین ئۆردوگای پەنابەران، لە قوتابخانەیەکی کۆن لە بەرانبەر کلێسایەکدا بوو. ٣٥٠ مەسیحیی، بەگشتی ٧٢ خێزانێك دەبوو لەو قوتابخانەیەدا جێگای خۆیان کردبووەوە. کاروباری خواردن و خواردنەوە لەسەر کلێساکە بوو. ئەو خەلّکە خۆشحالّبوون بەوەی کە لانیکەم، کەمێك هاوکاریی دەکرێن. زۆرینەی ئەم پەنابەرانەی ئێرە لە موسلّ هەلّاتوون، وەك شیعەکان، سونییەکان و ئەو ئێزیدییانەی کە لە کەمپی

یەکەم چاومان پێیان کەوت. پاش گفتوگۆیەکی دڵتەنگانە بەرەو گوێر بەڕێ دەکەوین، بەرەو لای بەرەکانی پێشەوەی جەنگ.

لە زەوییەکانی کەنار جادەکە دیواری خاکی چڕوپڕ دروست کراوە و ئامرازە سەرەتاییەکانی بەرگریکردنی دژ بە داعشمان بەر چاو دەکەوێت. لە یەکێك لە بازگەکانی پشکنین هێزە کوردییەکان لە پەسا دەڵێن زیاتر مەچنە پێشێ، چونکە داعش لەم دەوروبەر و نزیکانەدایە. قەناس بە دەستە لێهاتووەکان بە تایبەت لە لای ڕاستی جادەکەوەن. هێزەکانی پێشمەرگە پێش چەند ڕۆژێك دوای بۆردومانە چڕوپڕەکانی ئەمریکا گوێریان ڕزگار کردووە. داعش تەنها لە یەك گوند پاشەکشێی کردووە. لە ڕاستیدا پێگەی ستراتیژی زۆر گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە.

لە بازگەی پشکنینی دواتریش دیسان هۆشداریی دەدەن، بەڵام من لەپەسا ترۆمبێلی بارهەڵگر و ترۆمبێلی شەخسیی لەسەر جادەکە دەبینم و تکا لە شۆفێرەکەمان دەکەم بچێتە پێشەوە، بەڵام لەناکاو جادەکان چۆڵ دەبن. تەنها یەك تەنکەر دەبینرێت. شۆفێرەکەمان تا دێت نیگەرانتر دەبێت و نائومێدانە تەواوی پرسیارە پێویستەکانی لە سەربازێکی ڕاوەستاو لە کەنار جادەکە دەپرسێت: "ئایا دەتوانین بچینە پێشەوە؟ زۆر ترسناك نییە؟ بۆچی ئیتر هیچ ترۆمبێلێك نابینین؟ بۆچی گوندەکان لە شاری دێو و درنج دەچن؟ قەناس بەدەستەکان لە کوێن؟" دەمزانی چی لە مێشکی شۆفێرەکەدا دەگوزەرێت، بەردەوام هەناسەی قوڵی هەڵدەکێشا، تا بەڵکوو بتوانێت بەسەر ترس و دڵەڕاوکێکانیدا زاڵ ببێت.

ئیتر بڕیارمدا ڕەچاوی ئامۆژگاریی و قسەی سەربازی خاڵەکانی پشکنین بکەم. بە پێچەوانەی ئەوەی ئێمە چاوەڕوانمان دەکرد ئەوان دەڵێن: "ئێوە لە سنوور تێپەڕیون." بەڵام دوای چەند ساتێك چیتر هیچ جۆرە ترۆمبێلێکی بارهەڵگر و ئامێرێکی گواستنەوە لەسەر جادەکە نابینرێت. جگە لە ئێمە، هیچ کەسێك لەو دەوروبەرەدا نییە. ئێمەش دەکەوینە حاڵەتی ترس و لەرزەوە. ئایا لە گوێر تێپەڕیووین و لەو دیوی هێڵی پێشەوەی

بەرەکەوەین؟ جادە چۆڵوهۆڵە. تەنها لێرەولەوێ چەند ماڵێکی چۆڵکراو بەرچاو دەکەون و ئیتر هیچ شتێك نابینرێت.

لە دەستی ڕاستمانەوە و لای سەرەوە و لە دووری یەك بۆ دوو کیلۆمەتر، شوێنێك دەبینرێت کە لە ئۆردوگای داعش دەچێت. پێ دەچێت وا بیربکەنەوە کە ئێمە بازرگانین. هیوادارم! شۆفێرەکەمان لە پەسا دەڵێت کە پێشتر نەهاتوومەتە ئێرە و بە سەختیی ترسی لێ نیشتووە. دەڵێت نامەوێت تووشی هەڵە و ڕووداوێك ببم. فریدریك هەوڵ دەدات بە قسەی خۆش ئەو شتانەی لەبیر بباتەوە. پێمان وابوو دەبێت لەم دەوروبەرە بازگەیەکی پێشمەرگە کوردەکان هەبێت، ئەگینا کۆتا خاڵی پشکنین ڕێگەی بە ئێمە نەدەدا کە بێ ڕاوەستان لەو بازگەیە تێپەڕین. بەمەیشەوە لە ناوچەی شەڕ و ململانێدا لۆژیك نامێنێت و ناتوانرێت باوەڕ بە لۆژیکیش بکرێت. کەی دەگەینە وێستگەی خاڵی پشکنینی دواتر؟ ئاخر کەی، نەفرەت بێت؟ چیتر حەزناکەم جارێکیتر وەکوو سەردەمی پێشوو و کاتی مانەوەم لە لیبیا، لە کات و ساتی ململانێی سەختدا، لە پێناوی شۆڕشی بەناو عەرەبیدا، گرفتار و تووشی بارودۆخێکی مەرگبار ببم. فریدریك هەروەسا زەق تەماشای من دەکات.

سوپاس بۆ خوا ١٠٠ متر لە پێشەوەمان لەناکاو دوو پێشمەرگە وەدەرکەوتن. بەرەو لایان دەچین. کلاشینکۆفەکەیان دەخەنە بەر دەم و چاومان. دادەبەزم بۆ ئەوەی لە پشێویی و ئاڵۆزییەکان کەم بکەمەوە و پیشانی بدەم کە من چەکدار نیم. پێشمەرگەکان دوای ئەوە کەمێك ئارام و میهرەبانتر دەبن، پێمان دەڵێن پێش چەند ڕۆژێك داعشەکانیان لەم شوێنە دەرپەڕاندووە. ئێستا داعشەکان لەو دیوی ڕووباری زێن. لە دووری یەك کیلۆمەتر لێرەوە، پردێکیش لەسەر ڕووبارەکەیە.

ترۆمبێلێکی پڕ لە پێشمەرگە بە گرمەگرم خەریکە بەرەو لای ئێمە دێت. سەربازێکی لاوی خوێنگەرم کە دەسماڵێکی لەسەری ئاڵاندووە و عەینەکێکی ئاڵتونیی لەسەر چاو ناوە شۆفێری ئۆتۆمبیلەکەیە و لێدەخوڕێت. بە لوتف و میهرەبانییەوە دەڵێم، حەزمان

لێیه پێگەی نیزامیی پێشمەرگە ببینین و دواتر سواری ئۆتۆمبیلەکەیان دەبم. هەمیشە بە جۆرێك دەرفەتەکان دەڕەخسێن، لێرەش بەهەمان شێوە هەموو شتێکمان بۆ ڕەخسا. ئۆتۆمبیلەکە جێگەی ئێمەی تێدا نابێتەوە. لەسەر چەکێکی سووك دادەنیشم. هەوڵ دەدەم تا دەتوانم کەم بجولێمەوە. لەگەڵ دەنگی جیڕەجیڕی لاستیکی ئۆتۆمبیلەکە، بەڕێگادا دەڕۆین. شۆفێرە هەولێرییەکە هاوڕێ لەگەڵ فریدریك بە تەکسی بەدوای ئێمەدا دێن.

لە تەپەیەك سەردەکەوین، پاشان دادەبەزین. لەم شوێنەوە گوندەکە، پردەکە، ڕووبارەکە و گوندی دراوسێش بە باشی دیارە و دەبینرێت. ئەو شوێنەی کە داعش سەنگەری تێدا دروست کردووە. پێشمەرگەکان بە خێرایی لە دەوری ئێمە کۆ دەبنەوە. کاتێك خۆمیان پێ دەناسێنم، هەموویان خۆشحاڵ دەبن و بە گەرمی دەستمان لەگەڵ دەدەن. لاوانێکی خاوەن شارستانێت، پێشکەوتوو، بە باشیی ئامادەکراو و لاوانێك کە بە باشی خزمەتی خۆیان کردووە و تەواو ئامادەن. ئایا ئەم گەنجە خوێنگەرم و ئازیزانە لە بەرانبەر داعشە بێبەزەییە توندڕەوەکان، هیچ شانسێکیان هەیە؟

ژمارەیەك لە پێشمەرگەکان بە کلاشینکۆفەکانیانەوە لەپشت دیوارێکی خشتینەوە سەنگەر دەگرن و چەکەکانیان ڕووەو سەنگەری داعش دەگرن. بە تووڕەییەوە چاو لە دوژمن دەکەن. هەمووان بە ئارامی چاوەڕوانن تا فریدریك وێنەیان بگرێت. باسی ئەو دۆستە کوردەیان لەگەڵ دەکەم(حسێن) کە ڕۆژانی شەممە لە میونیخ لەگەڵیدا یاریی فوتبۆڵێن دەکەم. لێیان دەپرسم: " بۆچی ١٠٠ هەزار پێشمەرگەی لەخۆبایی و ناوداری جیهان داوای کۆمەك لە ئەورووپا و ئەمریکا دەکەن و نایانەوێت سەربەخۆیانە لەگەڵ داعشدا شەڕ بکەن، خۆ ئێوە پارتیزانی ئەفسانەیی و بێوێنەن." بە سەرسامیی و شڵەژانەوە پێدەکەنن. یەکێکیان دەڵێت: "دەبێت چی بکەین؟ ئێمە تەنها ئەم کلاشینکۆفە و ئەم چەکە بچووکانەمان هەیە! داعش لە بەرانبەرمان مۆدێرنترین چەکی بەدەستەوەیە و ئامادەیە."

بە عوزر و بەهانەهێنانەوەوە لە قسەکانیان بەردەوام دەبن و دەڵێن: "ئێمە هێشتا بۆ دەرکردنی داعش بڕیارێکمان پێ نەگەیشتووە. ئەگەر سەرۆکی هەرێم بڕیاری بدایە بەوەی داعش لە موسڵ دەر بکەین، ئەوکات یەك چرکە لە دەرکردنیان دوا نەدەکەوتین، بەڵکوو بە لەخۆباییبوون و بێباکییەوە لە دڵی دوژمنمان دەدا و سەرکەوتنمان بەدەست دەهێنا!"

وا دیارە بەهەمان شێوەی هێزەکانیتری ئێراق، پێشمەرگە ئەفسانەییەکانیش کەمێك ترسیان لە داعش هەیە. ستراتیژی داعش، خوڵقاندنی ترس و تۆقاندن لە ڕێگەی کوشتنە بەربەرییەکانییەوە، ئەو کوشتنانەی، کە هاوشێوەی بەربەرییەتەکانی سەدەکانی ناوەڕاستە، کاریگەر بووە.

سەرکردەی پێشمەرگەکان ئاماژە بۆ گوندەکەی ئەوبەری ئاوەکە دەکات، ئەو گوندەی کە داعشەکان سەنگەریان تێدا دروست کردووە. لە ئێستادا بەرەی داعش ئارامە، وەك دیارە ئەم ئارامبوونە لەبەر ئەوەیە کە نەکەونە بەر هێرشە ئاسمانییەکانی ئەمریکا، بەڵام وەختێك دوژمن چۆتە ناو گوندەکەوە و لەگەڵ دانیشتوانی گوندەکە تێکەڵ بووە، لەبەر ئەمە ئەنجامدانی هێرشی ئاسمانیی ورد و ڕێك، هێرشێك کە زیان بە خەڵکی بێلایەن و مەدەنی نەگەیەنێت، کارێکی سەخت و دژوارە. لە ئاییندەدا هەر ئەم بۆردومانانەیە، بەتایبەت لە شارە گەورەکانی وەکوو موسڵ، دەبێتە کێشەی سەرەکیی بۆ ئەمریکا .

یەك کاتژمێر دوای ئەوە خواحافیزیی دەکەین. لەو دیوی ڕووبارەکە ئاڵا ڕەشەکەی داعش دیارە، کە با دەیشەکێنێتەوە .

لە ڕێگەی گەڕانەوەمدا بۆ هەولێر، چاوم بە چەند فەرماندەیەکی پلەبەرزی چواردەوری سەرۆکی هەرێمی کوردستان دەکەوێت. سەرکەشانە هەواڵی ئەوەمان پێدەدەن کە کوردەکان دەستیان گرتووە بەسەر سێ یەکی ئەو چەك و کەرەستە مۆدێرنانەی کە سوپای ئێراق بەجێیان هێشتوون. ئەو دەمەی سوپای ئێراق لە ترسی

هێزەکانی داعش هەڵاتوون. وەك ئاشکرایە بەهای چەکەکان ٤ ملیار دۆلاری ئەمریکییە. من دەپرسم: "ئایا ناوچەی گەشەکردووی نێوە ناتوانێت ئەوباقی چەکەکان لە بازاڕی ڕەشی نێودەوڵەتیی بکڕێت؟" ئەو پێدەکەنێت و دەڵێت: بێگومان دەتوانرێت ئەو کارە بکرێت. "بەڵام کاتێك ئەورووپا چەك بە دیاریی دەبەخشێتە ئێمە، بۆچی بچین بیکڕین. ڕەنگە سەیر بێت بەلاتانەوە، بەڵام داعش بۆ ئێمە بەهرەیەکی ئاسمانییە. ئێمەی کوردەکان هیچ سەردەمێك بەم ڕادەیە لە وەدیهاتنی هیوا و ئامانجە سیاسییەکانمان نزیك نەبووینەتەوە." ئایا دەکرێ ڕەخنە لە کوردەکان بگیرێت، کە لەم پێگە و بارودۆخەی دروست بووە، بۆ بەرژەوەندیی خۆیان سوود وەردەگرن؟

# بەشی پێنجەم

## چات[19] لەگەڵ تیرۆریزم

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر لە پێشوو سێبەری داعش بە سەر ڕاگەیاندنەکانی جیهان و هەروەها فکری منیدا سێبەری دروستدەکرد. چەند هەفتەیەك دەبێت وا خەریکم لە چوارچێوەی کتێبێکدا کار لەسەر ئەو کێشە و بارگرژییانە دەکەم کە لە ئێراق و سووریا هاتوونەتە پێشێ، بەڵام هێشتا بەڵگەی بەهێز و تەواوم لەسەر داعش بە دەست نەکەوتووە. ئەم تیرۆریستە خوێنرێژانە کێن، کە هەموو هێز و سوپاکان لێیان هەڵدێن؟ ئەمانە کێن، کە کوشتارە بە ئامانج و کوشتارە ئازاربەخشەکانیان یەخە و دامێنی خەڵکانی مەدەنیو بێلایەنیشی گرتۆتەوە؟

لە مانگی جونی ٢٠١٤، پێش سەفەرکردنم بۆ شاری هەولێر، زۆر هەوڵم دا لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە پەیوەندیی بکەم بە دوژمنانی سەرسەختی شارستانێتەکەمانەوە. جیهادییە ئەڵمانییەکانی نێو داعش لە هەمووان زیاتر بوونە مایەی سەرنجڕاکێشانی من.

هەر بۆیە داوام لە کوڕەکەم کرد بۆ ئەنجامدانی بە دواداچوون و لێکۆڵینەوەکانم یارمەتیم بدات. بۆ ئەم کارەش پێویستمان بە پڕوپاگەندەی سیاسیی کاریگەر هەبوو. دەبوو ئەوەمان بە گریمانە بکردایە، کە هەموو کاروچالاکییەکانمان لە ئینتەرنێت لەژێر چاودێریی دەزگای هەواڵگریی و دەزگای زانیاریی ڕۆژئاواییەکان دایە و چاودێریی دەکرێین. لەلایەکیترەوە فریدریك نەیدەویست "ئیدارەی پاراستنی دەستوور" کاتژمێر پێنجی بەیانی لە خەو ڕابچڵەکێنێت. هەرچەندە هەموو ئەو کاروچالاکیانەی کە ئێمە ئەنجاممان دەدا یاساییش بوون. بەرژەوەندیی ئێمە لەوەدا بوو زانیارییەکانمان زیاتر لە ڕێگەی ئەڵمانییە جیهادییەکانی نێو گروپی داعشەوە بەدەست بێنین. هەرچەندە من و فریدریکی کوڕم ڕۆژنامەنووس بووین. بەڵام فێردی باشترین هاوکاریشم بوو.

---

١٩-گفتوگو - Chat

بۆ ئەوەی ڕاستگۆبم لە کارەکەمدا نووسینگەی سەرۆك، ئەندامێکی دەستڕۆیشتوی نێو کابینەی حکومەت، هەروەها هاوڕێم تۆماس باقمنی سەرنووسەری (ئەی، ئاڕ، دی)ـم لەکار و ڕەوتی بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەکانم ئاگادار کردەوە، هەڵبەت بێ باسکردنی وردەکاریی زیاتر لەسەر مەسەلەکە. چونکە پێشتر ئێمەیان بە سیفەتی (دۆستی بەشار ئەسەد) سەربەرز کردبوو! پێم خۆش نەبوو جارێکی دی تۆمەتی بەرگریکردنم لە داعش بدەنەپاڵم.

لە ٩ـی مانگی جون، دروست یەکەمین شەوی لێکۆڵینەوەکانم زیاد لە ٨٠ جیهادیی ئەڵمانیمان لە ئینتەرنێت بینیەوە. فریدریك ئەو نامەی کە من شەوی پێشتر ئامادەم کردبوو، گەیاندییە دەستیان. کار و ڕەوتی چاکسازیی و ئیمزای نامەکەم بە فریدریکی کوڕم ڕاسپارد .

**سڵاو...**

**من فریدریك تۆدنهۆفەرم و لەلایەن باوکم تۆدنهۆفەرەوە بۆت دەنووسم. ئێمە تۆمان لەڕێگەی تۆڕی کۆمەڵایەتیی فەیسبووکەوە بینیەوە، بابەت و بیروبۆچوون و وێنەکانی تۆشمان بینی، بەم شێوەیە تێگەشتین کە تۆ لە سووریایت. نازانم ئاشنایەتیت لەگەڵ ناو و ناوبانگی باوکم هەیە یاخود نا؟ بەڵام ئەو لەم ساڵانەی دواییدا هەوڵی داوە وێنەی ڕاست و دروستی ئیسلام بە جیهان پیشان بدات و لە پێش دەستپێکردنی جەنگ و لە ئانوساتی جەنگیشدا چەند جارێك هاتۆتە سووریا. لە دیدی باوکمەوە ئەم جەنگە وەکوو هەموو جەنگەکانیتر ترسناکە، بەڵام ئەو کەسێك نییە تەنها یەك لایەن بە تاوانبار و موقەسیر بزانێ. ئەو باوەڕی وایە هیچ شەڕێك لە ڕووی ئینسانییەوە دادپەروەرانە نییە. ئەمەیشی لە شەڕێلێکی زۆرەوە ئەزموون کردووە، ك سەرەتای ئەو بۆ سەردەمی جەنگی ئازادیخوازی جەزائیرییەکان لە دەیەی شەست دەگەڕێتەوە.**

ئەو لە سووریا لەگەڵ ئەندام و لایەنگرانی هەموو گروپە شۆڕشگێڕەکان گفتوگۆی کردووە. هەروەها لەگەڵ گروپەکانی سەر بە ڕێکخراوی قاعیدە و دەوڵەتیش گفتوگۆی کردووە. ئەو لە هەموو گرژیی و ڕووبەڕووبوونەوەکاندا لەگەڵ هەردوو لایەن گفتوگۆ دەکات. هەر بۆیەش حەز دەکات لەگەڵ تۆ یان هاوڕێکانت قسە بکات. دەیەوێت ئاشنای پاڵنەرەکانتان بێت.

١٥ نەفەر لەو کەسانەی نامەکانیان بەدەست گەیشتبوو وەڵامیان دابوویەوە. دوای ئەوە زۆربەی گفتوگۆ و پەیوەندییە سکایپییەکان زۆر کورت بوون و زۆرجار پەیوەندییەکان بە ناتەواویی دەمانەوە. چونکە ئەو کەسانەی گفتوگۆکار بوون زۆرجار لە کەینوبەینی قسەکردندا بێمتمانە دەبوون. لەگەڵ دوو کەسیان لە گفتوگۆدا بووین، ئەوان باش ئەوەیان دەزانی من هاوڕا نەبووم لەگەڵ بۆچوونی سیاسیی و کارە بێبەزەییەکانیان، بەڵام وا هەستدەکرا کە زۆر حەزیان بە دەربڕینی بۆچوونەکانی خۆیان هەیە. گفتوگۆکان لە ڕێگەی ئینتەرنێت و پەیوەندیی سکایپەوە، هەروەها لە ڕووی تەکنیکییەوە زۆر سەخت بوون. چونکە کۆنتاکتی ئینتەرنێتیی زۆرجار گونجاو نەدەبوو. لە پاش چەندین گفتوگۆی چەند کاتژمێریی لە ڕێگەی سکایپەوە، تووشی ژانەسەریش دەبووم. نەك لەبەر کێشە تەکنیکییەکان، بەڵکوو ئەم سەرێشەیە لە ئەنجامی ناوەڕۆکی گفتوگۆکانەوە بوو.

**سەلیم**

**سەلیم، ناوی جەنگیی ئەوە، جیهادییەکی ٢٠ ساڵە، سادە و بێ فرۆفێڵ. پێ دەچێت خۆش ئەخلاق بێت. لە کۆتایی مانگی جولای، کە پەیوەندیمان پچڕا، نێوبراو بۆ گروپی جیهادیی جندالاقصی شەڕی دەکرد، کە زۆربەی ئەندامەکانی بیانی بوون. ئەو پێشتر لە ڕیزی بەرهەڵستکارانی گروپی بەرەی نوسرە و داعشدا بوو. لە ساتەوەختی گفتوگۆکانماندا زۆر بە ڕاشکاویی گرووپی داعشی ڕەت دەکردەوە. ئەو لاوێکە پڕاوپڕە لە بیروبۆچوونی ناتەبا و دژیەك.**

**به شێوەیەك دەیگوت پێشتر تا دڵت حەز بكات لە ئەڵمانیا كاری نابەجێ و خراپەم كردووە. بە هیوای ئەوەیە لە سووریا لە ڕێگەی بەرگریكردن لە موسڵمانان دژ بە ڕژێمی ئەسەد، قەرەبووی خراپەكارییەكانی ڕابردووی بكاتەوە. دەیەوێت ببێتە مرۆڤێكی باش. زۆرجار من و فریدریكی كوڕم لەگەڵ یەك لەسەر ئەوە قسەمان دەكرد، ئایا دەتوانین ئەو ڕازیی بكەین بۆ ئەوەی دەست لەم كارە هەڵبگرێت و لە شوێنێكی تر ژیانێكی سادە و ئارام بۆ خۆی بنیات بنێت، بەڵام ئەو دەمەی بە شێوەیەكی كتوپڕ لە كۆتایی مانگی جولایدا بەتەواوی پەیوەندییەكانی بە ئێمەوە پچڕا، وای بۆچووین كە كوژرابێت یان دەستگیریان كردبێت. لە خوارەوە، گفتوگۆی ١٩ـی جولای بە پوختەكراوی خراوەتە ڕوو:**

سەلیم: من هاتوومەتە ئێرە، چونكە باوەڕی تەواوم بە كارەكەم هەیە. ئەوەش دەزانم، كە ڕۆژێك دێت دەمرم. هیچ كەسێك ناتوانێت نكۆڵیی لەوە بكات، كە خودای میهرەبان ڕۆژێك لەگەڵ من حساب و كتاب دەكات. من باوەڕم بە هەموو ئەو شتانە هەیە كە لێرە ئەنجامیان دەدەم. هەموو ئەو كارانە لە پێناوی ئایینەكەمدا دەكەم. ئەگەرچی دروست بێت یان نادروست. چونكە هەموو كەسێك خۆی هەڵدەكێشێت و بانگەشەی ئەوە دەكات كە ئایینەكەی ڕاست و دروستە. مەسیحییەك دەڵێت، ئایینی مەسیحیی ئایینی ڕاست و هەقیقییە. جوولەكەیەك بۆچوونی وایە ئایینی هەقیقیی، بریتییە لە یەهودییەت. كەسێكی موسڵمانیش بە هەمان شێوە دەربارەی باوەڕەكەی خۆی كە ئیسلامە، هەمان بۆچوونی هەیە. ئەگەر ئەم بۆچوونەی نەبێت ئەوە هەر لە بنەڕەتدا موسڵمان نییە. من بونیادگەرام، چونكە بونیادی من قورئانە. من هەوڵ دەدەم بە باشترین شێوە و دەقاودەقی قورئان لە خزمەتی خوای میهرەبانمدا بم.

تۆ وەكوو ڕۆژنامەنوس هەرگیز ناتوانیت هەقیقەتی ئەم جەنگە پیشان بدەیت. سیاسەت لەسەر درۆ بنیات نراوە و ڕاوەستاوە. ئەم دیموكراسییەش كە دەیڵێن، بریتییە

لە ساختەچێتیی و فێڵبازیی و لەسەر بنیاتی درۆیە. هەمووان لە پێناوی بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەکانیان درۆ دەکەن. لەکاتێکدا ئەگەر تۆ بتەوێت ئەو ڕاستییانە بنووسیتەوە کە تایبەتە بە ئێمە، ئەوە چارەنووسێکی سەخت و دژوار چاوەڕێت دەکات. ئەڵمانییەکان ئامادەن بچنە ئەفغانستان، قەندوز یان هەر شوێنێکیتر، بەڵام کەس ئامادە نییە یارمەتییەکی ئێرە بدات. لە دیدی ئێوەمانانەوە ئەو خەباتکارانەی کە ڕوو لە ئێرە دەکەن، سەلەفین. هەرکەسێك بێتە ئێرە و بجەنگێت و بەرگریی لە براکەی و لە ئیسلام و بەهاکانی خۆی بکات، بە بۆچوونی ئێوە سەلەفییە. ئێمە لە ئیسلامدا دەڵێین:"هەموو موسڵمانان برای یەکترن." تۆش ئەگەر موسڵمان بووبایت، هێندەی ئەمە فیداکاریم بۆت دەکرد. بەلای منەوە هیچ جیاوازییەك نابینم لەوەدا، کە ئایا تۆ دەناسم یاخود نا، بەڵام کاتێك موسڵمانێك ماڵ و ئارامیی خۆی بەجێ دەهێڵێت و لە ڕێگەی خوای گەورەدا دەجەنگێت، بە بۆچوونی ئێوە ئەو کەسە بە تیرۆریست لەقەڵەم دەدرێت. بەڵام ئەگەر ئەڵمانییەك یان ئەمریکاییەك لە نێو سوپادا ئەم کارە بکات، بە بۆچوونی ئێوە ئەوە قارەمانە. ئەگەر ئەم قسە و باسانە بە ڕاستیی بنووسیتەوە، ئەوە تۆ سەرکەوتوو نابیت .

o [20]یورگن تۆدنهۆفەر: بەلای منەوە سەرکەوتن گرنگ نییە. من هەوڵ دەدەم هەقیقەت بدۆزمەوە.

- سەلیم: لە ڕاستیدا ویستم بچمە ئەفغانستان. لەناکاو بە ڕێککەوت سەرم لێرەوە دەرهێنا. بۆ وەرگرتنی ڤیزا ڕووم لە کونسوڵخانەی پاکستان کرد. بەڵام بەداخەوە کارەکانم سەری نەگرت. ئەمڕۆ ئەگەر باردۆخ لەبار بووایە بۆم، دەستبەجێ بۆ ئەفغانستان دەڕۆشتم. ئەمە ئارەزووی دڵی منە. بەشێك لە هاوڕێکانم لەوێن. پێم وایە خەڵکی ئەفغانستان باشتر ڕێکخراون و میهرەبانترن وەك لە خەڵکی سووریا. خەڵکی سووریا، ئێمەی خەڵکی دەرەوەیان خۆش ناوێت .

---

٢٠- لەمە بە دوا ئەو نیشانەیە بە مانای قسەکانی یورگن تودنهوفەر دێت.

زۆر بە ڕاستی و ڕاشکاوییی دەیڵێم: لە خۆم پرسی، باشە بۆچی نامە بۆ من دەنێرن؟ بۆچی فڵانی دەیەوێت لەگەڵ من قسە بکات؟ من بینەری چۆنێتیی بارودۆخەکان بووم. ئەو کاتەی لە فرانکفۆرت بووم و هەموو ئەم خەڵکانە دەناسم. پیر ڤۆگول و تەواوی ئەو کەسانەی کە لە هەموو دەرفەتێکدا وتار دەدەن. هەرجارێك تیمێکی تەلەفزیۆنی یان کەسانێکی ڕۆژنامەنووس دەهاتن و شتێلێکیان دەگوت. لە ڕاستیدا تا ئێستا میدیاکان هەموو شتێکیان هەڵگەڕاندووەتەوە. ئەوان قسەکانیان پێچەوانە دەکردەوە. دواتر ئەم قسانەیان لە تەلەفزیۆنەوە پەخش دەکرد و لەگەڵیشیدا مۆسیقایەکیان پەخش دەکرد کە ئازاری گوێی دەدا. هەموو ئەم کارانە تەنها لە پێناوی ئەوەدا بوو کە وێنەیەکی ناشیرین و ناپەسەند لە ئیسلام پیشان بدەن. پیر ڤۆگول، بوکسوری پێشین کە ئێستا ئیتر سەلەفییە! ئەو شتێکی خراپیشی نەگوتبوو، بەڵام میدیاکان خولیای ئەوەن کە وێنەیەکی ناشیرین لە ئیسلام بڵاو بکەنەوە. نیگەرانیی من ڕێك لێرەوەیە. بەوەی تۆ لەگەڵ من گفتوگۆ بکەیت و دواتر بەشێك لە قسەکانم بسڕیتەوە و لە ئەنجامدا، شتێکی لەم شێوەی لێ دەربێت: "هەنووکە سەلیم جیهاد دەکات، مرۆڤ دەکوژێت و خەریکی کاری لەم شێوەیە. دەی باشە هەمیشە هەر بەم شێوەیە بووە".

o من نامەوێت قسەکانی تۆ بگۆڕم.

• ڕاتان دەربارەی ئەم هەموو کاروچالاکییە هاندەرانەی دژ بە ئیسلام چییە؟ هەمیشە لە کۆتاییدا تەواوی تاوان و کەمتەرخەمییەکان دەخەنە ئەستۆی موسڵمانان. ئایا سەلەفییەکان خەڵکانێکی خراپن؟

o ئایا ڤیدیۆی "ئیسلامی هەڕەشەئامیز"ی منت بینیوە؟

• نەمتوانی بیکەمەوە. لێرە بارودۆخەکە بەو شێوەیە نییە هەر کەس بۆ خۆی ئینتەرنێتی ئازادی هەبێت. هەرکەس بۆ کڕینی ٥٠ میگابایت ئینتەرنێت دەبێت نزیکەی سێ بۆ چوار یۆرۆ یان زیاتر بدات، بۆیە بێگومان ڤیدیۆیەکی لەم شێوە بە خێرایی و قورسییەکەی ئەو قەبارە ئینتەرنێتە تەواو دەکات.

o زۆر چاکە. من چەند پرسیارێکم هەیە. ڕاستیی، بۆچی لە عەرەبستانی سعودیی هیچ دەنگوباسێکی جیهاد نییە؟

• شتێك بە ناوی عەرەبستانی سعودییەوە بوونی نییە، ئەوەی کە هەیە، ئەمریکای سعودییە نەك عەرەبستانی سعودیی. ئەوجا ئێمە تەنها کاتێك دەست دەدەینە جیهاد، کە هێرش بکرێتە سەر موسڵمانان. لە عەرەبستانی سعودییش هەنووکە ئەم هێرشکردنە ڕووی نەداوە. هەڵبەتە حوکمە واقیعییەکانی ئیسلام لەوێ نابینرێت. ئەگەر لەوێ شەریعەتی ئیسلام حاکم بوایە ئەوکات دەنگوباسی خانووی لەشفرۆشان و خواردنەوە کهولییەکان نەدەبوو.

o یانی ئەحکامەکانی ئیسلام لە عەرەبستانی سعودیی تەنها پەیوەستە بە خەڵکانێکی سادەوە؟

• ڕێك وایە، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە لە ڕاستیدا پادشای عەرەبستانی سعودیی هیچ سەروکارێکی لەگەڵ ئیسلامدا نییە. هەربۆیەش، موسوڵمانەکانی ئەوێ لەبەرانبەر ئەو شتانەی کە ڕوودەدەن، ڕازیین. زۆرێك لە خەڵکیش سەرەڕای ئەوەی لە مەککە و مەدینە دەژین، بەڵام بە هیچ جۆرێك لە ئیسلام تێنەگەیشتوون.

من هاتوومەتە ئێرە، چون هەوڵ دەدەم ڕەفتارەکانم لەسەر بنەمای پێودانگەکانی ئیسلامی هەقیقی بێت. چون باوەڕم وایە کاتێك دەمرم، خوای میهرەبان لەسەر کردەوەکانم لێپێچینەوەم لەگەڵدا دەکات. لێم دەپرسێت: درۆت کردووە؟ شەرابت نۆشیوە؟ ئایا تەڵەکەبازییت کردووە و ئەوانیترت ئازار داوە؟ هەر لەبەر ئەمەیە ئێستا هەوڵ دەدەم مرۆڤێکی باشتر بم. ئەو کاتەی هێرش دەکرێتە سەر موسوڵمانان، جیهادیش فەرز دەبێت.

o کوتوپڕ چۆن سەروکەللەی بەرەی نوسرە و داعش پەیدا بوو؟

• من له بنەڕەتدا مرۆڤێکی زیرەك نیم. سەرکردەی ئەم ڕێکخراو و گرووپانە ئامانجێکی زۆریان هەیە. بڕێکیان ئامانجیان پارەیە و بە کڕین و فرۆشتنی چەکەوە سەرقاڵن. شەڕ لە بەرژەوەندیی ئەوانە. پارەیەکی زۆر دەخەنە گیرفانەکانیانەوە. هەندێکیشیان لە بیری ئەوەدان دەوڵەتێك لە ئایندەدا دروست بکەن و حوکمی تێدا بکەن. هیچ یەکێك لەم شتانە بەلای منەوە گرنگ نییە. تەنها بیر لەوە دەکەمەوە کە چۆن بتوانم بەرگریی لە خوشك و برا ئایینیی و منداڵەکانیان بکەم و مرۆڤێکی باش بم.

o پێ دەچێت ڕێکخراوی قاعیدە لە ژێرەوە لەگەڵ ڕژێمی ئەسەد پەیوەندیی هەبێت؟ پەیوەندییەك، کە کەسانێك قسە لەبارەی هەبوونیەوە دەکەن؟

• هەرگیز و لە هیچ بارودۆخێکدا ناکرێت ئەسەد قاعیدەی بنیاد نابێت. چونکە ڕێکخراوی قاعیدە مێژوویەکی زۆر درێژی هەیە. دروست هێندەی ژمارەی سەرکردەی گرووپ و ئەو کەسانەی تێیدا چالاکی دەنوێنن...

دەربارەی داعش؟ کەسانێك هەن بانگەشەی ئەوە دەکەن داعش لەگەڵ دەوڵەتی سووریا کار دەکات. ئەلبەغدادیی، ڕابەری داعش هەمیشە لە شەڕدایە لەگەڵ موسڵمانان. تەواوی غەنیمەتی جەنگەکانی لەژێر دەستدایە و پڕوپاگەندەیەکی چاکیش بۆ خۆی دەکات. ئەوان پارەیەکی زۆر و زەبەلاحیان هەیە، بەڵام تەنها خەریکی خراپەکارین. لە جیهاد تێنەگەیشتوون و لە فەرهەنگی موسڵمانان تێ نەگەیشتوون. ئەوە نازانن کە دەبێت بوار بە خەڵکیش بدرێت. ئەوان ٤٠ ساڵ جگەرەیان کێشاوە و ئێستا کتوپڕ داعش سەری هەڵداوە و ڕووبەڕووی هەرکەسێك دەبێتەوە، کە جگەرە بکێشێت، دەستیان دەبڕن، چوزانم! ئەمە ئیسلام نییە. ئەو ئەڵمانییانەی کە هاتوونەتە ئێرە زۆر دنە دراون. ئەوان خۆشحاڵ دەبن و داعش بە ئیسلام تێدەگەن. لەکاتێکدا هیچ لە ئیسلام تێنەگەیشتوون. نازانن کە ئیسلام هەم ئەشق و هەم ئەقڵیشە. من ناتوانم بە یەکجاریی جگەرەکێشان لە کەسێکی جگەرەکێش قەدەغە بکەم. چی بگات بەوەی ئەو کەسە ٤٠ ساڵ جگەرەکێش بووبێت. دەبێت سەرەتا ئاگاداری بکەمەوە بۆ ئەوەی کەم کەم لە

جگەرە بێزار بێت و جگەرە تەرك بكات. نەك لەبەر خاتری ترس لە من، بەڵكوو لە پێناو ترس لە (الله)ـی خوا و خولقێنەری خۆی ئەو كارە بكات .

- بۆچی زۆرینەی ئەڵمانییەكان یا جیهادكارە نێودەوڵەتییەكان دەچنە نێو ریزەكانی داعشەوە ؟

- چونكە بانگەواز و پڕوپاگەندەی داعش لە بواری ڕاگەیاندنەوە زۆر بەهێزە. ئەوان كارەكانیان لەم بوارەدا بێوێنەیە. هەندێك جار خەڵكانی ساویلكە هەن، كە بەم ئاڵا ڕەشە و بە" لا اله الا الله"ـی نوسراوی سەر ئاڵاكەی داعش فریو دەخۆن. هەموویان ریشیان هەیە و سەد و دە لە سەد بەرگریی لە حوكمە ئیسلامییەكان دەكەن، بەڵام هەموویان كەوتوونەتە هەڵەوە. یەكەمجار دەبێت لەگەڵ دوژمندا بجەنگین. پێش سەركەوتن بەسەر دوژمن ناتوانین جەنگ لەگەڵ شارنشین و دانیشتووانی ژێر دەسەڵاتمان بكەین. خەلافەت ئەركی خۆی هەیە. ئەمە هەر ئەو شتەیە، كە ئەوان نایزانن. ئەسڵەن ئەوان لە ئیسلامدا تەنها ریش و ریش و ریش دەبینن و وادەزانن كە ئەحكامی ئیسلام هەر ئەمەیە. بەهەرحاڵ ئێمە بە ئاڵاكانمانەوە لەسەر ڕێگای ڕاستین، بەڵام ئەوان لە ڕێگای چەوتیدان. پێش ئەوەی بمانەوێ كەسێك تەمبێ بكەین، دەبێت شتێكی پێ بدەین. خۆ من ناتوانم هەروا منداڵێك تەمبێ بكەم كە بژێویی ژیانیم دابین نەكردووە و من خواردنم بۆ پەیدا نەكردبێت. بەڵام ئەگەر من باوكی ئەو منداڵە بم و كوڕەكەشم هەڵەیەكی كردبێت، پێدەچێت بتوانم تەمبێی بكەم. چونكە من پەروەردەم كردووە. من ئەو كەسەم كە جلوبەرگ، خۆراك و هەموو شتێكم بۆ دابین كردووە و پارێزگارییم لێ كردووە، بەڵام ئەگەر كوڕەكەی تۆ لە قوتابخانە قوتابییەكی لاواز بێت، دەكرێت بەهەمان شێوە بێم و لێی بدەم؟ خۆ من باوكی نیم! خۆ من خواردنم پێ نەداوە. من هیچ پارێزگارییەكم لێ نەكردووە. داعش هیچ شتێك نادات بە خەڵكی! خەڵكی شارەكان لە دوژمنەكان زیاتر دەخاتە ژێر فشار و ئەشكەنجەوە. لەو سەرەتاوە كە لەگەڵیان بووم هەموو ئەم شتانەم پێ گوتن .

- لەم بارەیەوە چیت بە داعشێكان گوت؟

- ئەوان کوێرن، ئەسڵەن هیچ شتێك نابینن. تەنها شتێك کە دەیبینن ئەحکامی ئیسلامییە، ئەحکامی ئیسلام و ئەحکامی ئیسلام. وای بۆ دەچن هەمیشە حەق بەوانە و هەر کەسێك کە لەگەڵ ئەوان و بەغدادیی نەبێت، لەسەر ڕێبازێکی هەڵەیە.

  - o بەڵام بەغدادیی ئەو دەمە لە لایەن ئەمریکییەکانەوە لە ئەبوغرێب زیندانی کرابوو.

- دروستە. داعش پاش شەڕی ساڵی ۲۰۰۳ش هیچ چالاکییەکی لە ئێراقدا نەبووە. ئەوانیان لە ئێراق دەرکرد، چونکە هیچ دەسکەوتێکیان نەبوو. دواتر ئەوان هاتنە نێو وڵاتی سووریاوە و پرۆسەی جیهادیان شێواند. لە جێی ئەوەی هەموومان لە دەوری یەك کۆ بکەنەوە، کێشە و بۆشاییيان خستە نێوانمانەوە. بەرەی نوسرە لێرە سەرکەوتنێکی زۆری هەبوو، ئەوان زۆر سەرکەوتوبوون. تا ئێستا ناوچەیەکی زۆریان لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمی ئەسەد ئازاد کردووە. ئەوەی کە ئێمە ئێستا دەتوانین بە ئازادیی بسوڕێینەوە و خواردن بخۆین، هەموو ئەمانە لە سایەی بەرەی نوسرە، سوپای ئازاد، احرار الشام و باقی گرووپەکانی ترەوەیە، بۆیە قەرزاری ئەوانین.

  - o بە ڕاستیی تۆ لە داعش نیگەرانیت؟

- من لە زۆر شت تێناگەم، بەڵام هەمیشە هەوڵ دەدەم سوود لە ئەقڵم وەربگرم. هەوڵ دەدەم بابەتەکان بە وردیی ببینم، تا ئەوەی بێ بیرکردنەوە و تێڕوانین لێیان بڕوانم. وەختێك هاوکاریی کەسێك دەکەم، هەوڵ دەدەم لێی تێبگەم. چی ئامانجێکی هەیە، بۆ دەیەوێت ئەم کارە بکات؟ ئایا لەپێناوی پول و پارەدا ئەم کارە دەکات، دەسکەوت (غەنیمەت)ـی دەوێت، یان دەیەوێت بازرگانی بە کڕین و فرۆشتنی چەکەوە بکات؟ ئایا مەبەستی ئەوەیە بە فرۆشتنی نەوت و بەنزین پارە لە باخەڵی بنێت؟ ئامانجی چییە؟ ئەو کەسانەی لەنێو داعشدا دەمرن زۆربەیان لە شەڕەکانی داعش دژ بە بەرەی

نوسره دەكوژرێن. ئەمە كارێكی شێتانەیە. لە گەنجە سادەكان بپرسن، لە عەرەبە سادەكانی ئێرە، كە هیچ پەیوەندییەكیان بە شۆڕشەوە نییە و تەنهاوتەنها پەنابەرن، بپرسن، هیچ یەكێك لەوان دان بە داعشدا نانێن .

- o داعش چی دەوێت؟

- • داعش هێز و دەسەڵاتی دەوێت، دەیەوێت دەوڵەتێك دابمەزرێنێت. بەغدادیی خواست و حەزی تایبەتیی خۆی هەیە. ئەو تەنها خراپەكاریی دەكات. هەر لەبەر ئەمە تۆ وەكوو رۆژنامەنووسێك پێویست دەكات هەرچی زووتره سەردانی ئێرە بكەیت و لەو بارەیەوە راپۆرتێك ئامادە بكەیت. ئەوكات تۆ بە ئاشكرا خەڵكی بێدار دەكەیتەوە و بە رای من بەم كارە بارودۆخەكە باشتر دەبێت. هەڵبەتە كاتێك تەلەفزیۆنەكانی ئەڵمانیا ئەو راپۆرتە پەخش بكەن. ئەگەر سەردانی ئێرە بكەیت و لەگەڵ تێكۆشەران (مجاهدین)ـی راستەقینەدا ئاشنا بیت، ئیتر بە تیرۆریست ناوزەدیان ناكەیت. تێكۆشەرانی راستەقینە، كە تەنها لە پێناو ئامانجی پارێزگاریكردن لە مرۆڤەكان و گێڕانەوەی مافەكانیان تێدەكۆشن.

- o بەڵێ، بەڵام نەك لە رێگای جەنگەوە. بێگومان ئەوانیش پێ دەچێت خەڵكانێكی زۆریان كوشتبێت .

- • بەڵێ، ئاشكرایە بەڵام هەروەكوو ئێستا خۆشتان گوتتان، جەنگە ئیتر.

- o راوبۆچوونی خۆتان لەسەر جەنگ چییە؟

- • كوشتن... لە جەنگدا زۆر بیر لە كوشتن ناكەیتەوە. تەنها بیر لە ژیانی خۆت دەكەیتەوە و بەرەو پێشەوە دەڕۆیت. جۆرە دیدێكی تایبەتت بۆ دێتە پێش. كاتێك دەچیتە نێو مەیدانی شەڕەوە و دوژمن بەرانبەرت وەستاوە و كۆپتەر، فڕۆكە، تانك و هەموو شتێك لە دژی تۆ دەخاتە كار و تۆش بە كلاشینكۆفێكی شەقوشڕەوە هەوڵ دەدەیت بەرانبەری بجەنگی، لەم ساتەدا بیر لە هیچ شتێك ناكەیتەوە. بیرت تەنها

دەرگیری ژیان، مەرگ، هاتوهاوارەکانی چواردەورتە. ترسانی من ترس نییە لە مەرگ، چون ئەگەر بە ڕاستیی نییەتم پاك بێت، ئەوە لە ڕێگای الله دا دەمرم. مرۆڤ هەر کارێك دەکات دەبێت لە پێناوی الله دا بێت، نەك لەبەر ئەوە بێت خەڵکی پێی بڵێن تۆ زیرەك و چاونەترس بوویت. ئەگەر لەو پێناوەدا بێت ئەودەم هیچ بەهایەکی نابێت. هەرکەسێك هەر کارێك لە پێناوی الله ئەنجام نەدات، یەکڕاست دەخرێتە دۆزەخەوە. موجاهید دەبێت لە پێناوی خوادا بجەنگێت نەك بۆ خۆی.

بەهەرحاڵ مرۆڤ تەنها بیر لە خۆی و بۆمبەکان دەکاتەوە. دەترسێت. من لە مردن ناترسم. ترسم لەوەیە، کە بریندار بم و بە باشی چارەسەر نەکرێم، یان یەکێك لە دەستەکانم لەدەست بدەم، یان هەر شتێکیتر. ئەودەم نەتوانم بجەنگم، من لەمە دەترسم.

دواتریش مرۆڤ تەقە لە بەرانبەرەکەی دەکات، لەوانەیە کەسێکیش بکوژێت. هەندێك دەکوژرێن و هەندێکیش نا. کوشتنی مرۆڤێك لە گۆڕەپانی جەنگ کارێکی هێندە ئاسان نییە. چونکە ئەوەی بەرانبەریش بۆ خۆی دەجەنگێت. گریمان دەمانەوێت خاڵێکی پشکنین بگرین، پێش گرتنی ئەو شوێنە بە خەستیی گوللەبارانی دەکەین و لە دووریی ٥٠٠ مەترەوە بە هەموو ئەو شتانەی کە لەبەردەستدایە ئەم خاڵی پشکنینە تۆپباران دەکەین. بەم شێوەیە هەنگاو هەنگاو لەو شوێنە نزیکتر دەبینەوە. تا ئەو کاتەی بگەین بەو خاڵە هێندە بۆمبارانی دەکەین، وێران بێت. ئەوکات ئەوەندە مرۆڤمان کوشتووە هیچ کەس دڵنیا نییە لەوەی چی کەسێك و کێی کوشتووە. مرۆڤ تەنها لە کاتی ئەنجامدانی بۆسەیەکی تایبەتدا بە دڵنیایی دەزانێت چ کەسێکی کوشتووە. بۆ نموونە لە کاتی هێرشبردنە سەر باڵەخانەکان یان چوونە ژوورەوە بە شێوەیەکی شاراوە بۆ نێو خاڵێکی پشکنین، دانان و جیبەجێکردنی کەرەستەی تەقینەوە، هێرشی شاراوە یان کردەوەی لەم شێوەیە. لە جەنگی ئاساییدا هیچ کەسێك ناتوانێت بڵێت کەسێکم کوشتووە، مەگەر ئەوەی ئەندامی گروپێکی تایبەت بێت و بۆسەیەکی تایبەتیان نابێتەوە. زۆرجار لێرە دادەنیشین و لە دووریی ٥٠٠ یا ٦٠٠ مەترەوە بۆ ئەولاتر تەقە دەکەین، هەموومانیش تەقە دەکەین. هەندێك جار بڕێك لە ئێمە و ئەوانیش دەکوژرێن، بەڵام هیچ یەکێکیان

نازانن کێ کێی کوشتووە. دواتر کاتێك شوێنەکە دەگرین، جەستە و مەیتێکی زۆر دەبینین. هیچ کەس ناتوانێت بڵێت کەسێکی دیاریکراوم کوشتووە، مەگەر ئەوەی کە تەقەکەرێکی لێزان و کارامە بێت، یان ئەوەی مەودایەکی کەمی لەگەڵ دوژمن هەبێت، لە مەبەستەکانم تێدەگەیت؟

o تا ئێستا نزیکەی چەند کەست کوشتووە؟

• هەروەکوو گوتم، من مرۆڤێکی گەورە نیم، موجاهیدێکی گەورە نیم. تۆ زۆر زیتەڵەی.

O دروستە.

• ژمارە گرنگ نییە. ئەگەر کەسێکیشم کوشتبێت تەنها لەبەر ئەوە بووە ئەو لەگەڵ موسڵماناندا شەڕی کردووە و مەبەستی بووە من و هاوڕێکانم بکوژێت. ئاشکرایە ئەم کەسەش خێزانی هەیە. ئەویش دایکێکی هەیە دوای مردنی فرمێسکی بۆ دەڕێژێت. ڕەنگە منداڵ و ژنیشی هەبێت و بێوەژن بکەوێت، بەڵام ئیتر جەنگە و دەبێت لەم بارەیەوە کەمێکیش خۆپەرست بین. بێگومان ئەگەر بمانتوانیبایە لە ئاشتیدا لەگەڵ یەك بژین، بارودۆخەکە باشتر دەبوو. ئەمە باشترین بژاردەیە.

من لە جەنگ و ئەو جۆرە شتانە بێزارم. زۆر بە ڕاستگۆیانە دەڵێم، تەنانەت پێی تێك دەچم و نیگەران دەبم. لە شەڕ و ململانێدا تەزوو و موچرکە بە گیانمدا دێت. ئاخر لە جەنگدا کەوشەکانت پڕە لە خوێن. بە خۆڕاکێشان و خەڵتانی خوێن بە ئەملاولادا دەڕۆی. ئەم وێستگەی پشکنینە داگیر دەکەیت و چەکی کوژراوەکان هەڵدەگری و مەخزەن و گوللەبەندەکان لە بەر مەیتەکان دەکەیتەوە. قێزەون و هێڵنجئاوەرە. بۆ نموونە من بۆ خۆم کەوشێکم هەیە پڕە لە خوێن. بێزارکەرە. نینۆکەکانی دەستت، نێوانی پەنجەکانت و دەستەکانت سەراپا خوێنە. لە ڕاستیدا من مرۆڤێکی کەم و زۆر ڕێکوپێکم. بێزم لەم شتانە دێتەوە، حەزم لە پیسیی و بۆنی ناخۆش و ئەم جۆرە شتانە نییە. حەزم لەم شتانە نییە. چی بڵێم؟ من خولیای مرۆڤکوشتن نیم.

سەبارەت بە یاریی بۆکسێنیش بەهەمان شێوە. پێشتر یاریی بۆکسێن و زۆرانبازییم دەکرد. هیچ کاتێك دڵم نەدەهات زۆر زۆرانبازیی بکەم. چونکە نەمدەویست بە ئارەقی بەرانبەرەکەم تەڕ ببم. من بێزم لە ئارەقی ئەوانیتر دەبێتەوە. هەر بۆیەش هەمیشە

هەولّم دەدا هەرچی زووتـرە بەرانبەرەکـەم" نـەك ئـاوت"بکـەم، بـۆ ئـەوەی لـێم نزیـك نەبێتەوە. چونکە نەمدەویست بە ئارەق و لیکی دەمی تەڕ ببم. باشـترین بـژاردە ئەوەیـە کـە بتـوانین بـەبێ جـەنگ لێـرە بـژین. چـونکە مـرۆڤ کاتێـك شـەڕ دەکـات تووشـی پیاوکوشتنیش دەبێت.

- o هەندێك جار پێشبینیی ناکرێت کە تۆ بکوژێکی بێبەزەیی بیت.
- • لە ڕاستیشدا هەروام، من مرۆڤێکم پێش ئەوەی بچمە سەر جێگـەی خەوتنەکـەم زۆر دەگریم و فرمێسك دەڕێژم.

- o چەند کەست کوشتووە؟ ١٠، ٢٠، ٥٠؟
- • هەرگیز ٥٠ کەسم نەکوشتووە. ئەگەر بـەو شـێوە بووایـە مـن ڕامبـۆ بـووم. مـن تەقەکەرێکی لێهاتوش نیم. دۆستێکم هەیە بەردەوام مرۆڤ دەکوژێت. هەمیشە و هەمیشە. من هەرگیز ئەم کارەم پێ ناکرێت. ئـەو زۆر بـە تاقـەت دادەنیشـێت و ئینسـانێك دەکاتـە هەدەف و تەقەی لێدەکات و تەق... ڕۆحی دەکێشێت. لە مەبەستم تێدەگەیت؟

من شەرکەرێکی سادەم. بە ئاڕ بی جی شەڕ دەکەم. هەروەها بە بازوکا، بەAK-47 ، بە کلاشینکۆفێکی سادە. ئەم کلاشـینکۆفە ئەوپـەڕی ٧٠٠ تـا ٨٠٠ مـەتر بـڕ دەکـات. لەوە بەدوا ئیتر گوللەکەی کوشندە نییـە. قـەناس بـە دەسـتەکان ژمارەیـەکی زۆر خـەلّك دەکـوژن. وەختێـك قەناسـێك باڵەخانەیـەك دەکاتـە نیشـان، باڵەخانەکـە بـە تـەواویی دەڕووخێت.

- o مەرگی خەلّکانی بێگوناحیش زۆر دەبینیت؟
- • نەخێر، چونکە ئێمە دەسترێژی گوللە لە خەلّکی بێگوناهح ناکەین. تـەنها لەگـەلّ ئەوانەدا شەڕ دەکەین، کە لە مەیدانی جەنگ ڕووبەڕوومان دەبنـەوە. هـەرگیز بـەو جـۆرە نییە کە بێ بەهانە بچینە نێو ماڵی کەسێکەوە و دواتر بڵێین عەلەوییە و بیکوژین.

دەبێـت ئـەوە بـزانین هـەر کەسـێك بەشـداریی جـەنگ دەکـات، گوناهباریشـە. منـیش گوناهکارم. کاتێك کەسێك دەکوژم، ئەوە گوناح دەکەم. چونکە لـەنێوان بەشـداریکردن و بەشدارییـنەکردن لە جەنگدا مافی هەڵبژاردنم هەیە. دەتوانم بڕیار بدەم شەڕ بکەم یان شەڕ نەکـەم، یـان دەتـوانم بڕیـار بـدەم بچـمە تورکیـا یـان هـەر وڵـاتێکیتر، دەتـوانم لـەوێ

پاسپۆرتێکی نوێ دروست بکەم و ژیانێکی تازە بۆ خۆم دەست پێ بکەم. بەڵام من تا ئێستا هیچ کەسێکی بێتاوانم نەکوشتووە. هەرگیز نەمگوتووە: "هێرش دەکەمە سەر ماڵێك، منداڵ یان ژن یان هەر کەسێکی تری تێدا بێت دەکوژم." شەڕ تەنها لە بازگەکانی پشکنین و سەربازگەکانی دوژمن دایە.

o بەڵام هەموو سەربازەکانیش تاوانبار و بەکرێگیراو نین. ئەوانیش گەنجانێکن هاوشێوەی ئێوە، کە لەلایەن خێزانەکانیانەوە پێیان گوتراوە بچنە نێو ڕیزەکانی سوپاوە و لە هەموو سووچێکی ئەم دنیایە دایکانێك هەن کە دەژین .

• بەڵێ، هەر بەو جۆرەیە. منیش هەر بۆیە گوتم کوشتن کارێکی باش نییە. چونکە ئەویش دایکێکی هەیە فرمێسکی بۆ دەڕێژێت، چەند منداڵ و ژنێك پاش خۆی بەجێ دەهێڵێت. بەڵام هەروەك گوتم شەڕە ئیتر. باشترین بارودۆخ ئەوەیە کە هیچ دایکێك نەگری، هیچ کەسێك نەگری. خۆزگە هۆکاری تەنهایی ژنێك لە ئەنجامی کوشتنی پیاوەکەی لە جەنگدا نەبێت.

o باشە با وای دابنێین سبەی ڕێگەچارەیەکی ئاشیخوازانە هاتەئاراوە. ئایا تۆ و ئەو کەسانەی کە ئاشنایەتیت لەگەڵیان هەیە، ئامادەن بڵێن: "ئەگەر ئەم ڕێگاچارە ببێتە مایەی ڕێککەوتنێکی دروست و دادپەروەرانە، پەسەندی دەکەین؟" لەم حاڵەتە پەسەندی دەکەم؟ ئەم بارودۆخە کەی تەواو دەبێت؟ دەزانن، کە لە سووریا چەند ناوچەیەك هەیە تێیدا ئەسەد هەوادار و هاوپەیمانێکی زۆری هەیە. ئەگەر ڕۆژێك هەموویان لە دەوری یەك کۆ ببنەوە یاخود ڕێککەوتن بکەن، ئەوکات چی؟

• ئەوکات ڕاستەوخۆ دووبارە شەڕ دەست پێدەکاتەوە. چونکە هەرکەس خاوەنی بیروباوەڕێکە و بەگوێرەی ئەو بیروباوەڕە هەڵسوکەوت دەکات. هەندێك لە مرۆڤەکان بە ڕاستی خوازیاری ئاشتی و ڕێککەوتنن. ئەوانە بۆنی ئیسلامیان نەکردووە، گرنگ نییە بۆیان کە لێرە دیموکراسیی حاکم بێت یان شەریعەت و ئەحکامی ئیسلام یاخود هەرشتێکی تر. تەنها دەیانەوێت لە ئاشتیدا بژین. منیش درك بەوە دەکەم. ئەمە وارسکەیەکی ئینسانە. دەیەوێت بژێت و بە سەلامەتی ئەو دنیایە تێپەڕێنێت. ئینسان

هەموو کارێك دەکات بۆ ئەوەی بە زیندوویی بمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر بەپێی قسەکەی تۆ، ئێمە لەگەڵ یەك ڕێك بکەوین و ئاشتیی بەرقەرار بێت، ئەوکات ڕەنگە من ڕازیی ببم، بەڵام ڕەنگە ئیسلامخوازەکان ڕازیی نەبن، چونکە ئەم ئاشتیيە لەسەر بنەمای بەرژەوەندیی پەیڕەوکارانی ئایینەکانیترە و بێگومان کەسێکی موسڵمانیش دەیەوێت بە گوێرەی ئەحکام و شەریعەتی ئیسلام لە ژێر سایەی دەسەڵاتێکی ئیسلامیدا بژێت. ئەمریکییەکان، ناتۆ و ئەورووپییەکان لە چیی دەترسن؟ لە حوکمەکانی ئیسلام. چونکە حوکمەکانی ئیسلام دادپەروەرانە و زۆر بەهێزن.

o بەڵام خۆ هەموو خەڵکی سووریا سوننە نین؟ چەند گروپێکی تر لە سووریادا بوونیان هەیە، لەوانە سیکۆلارەکان. لێرەدا ئایا دادپەروەرانەیە بڵێین: حوکمی ئیسلام بۆ هەمووان؟ یان مەبەستتان لەوەیە هەمووان دەبێت بەگوێرەی حوکمەکانی ئیسلام بژین؟ بەم پێیە بێت دەبێت بڵێی، دەبێ حوکمەکانی ئیسلام لە ئەڵمانیاش جێبەجێ بکرێن، چونکە لێرەش موسڵمان هەن کە خوازیاری حوکمەکانی ئیسلامن.

• موسڵمان دەیەوێت بەپێی حوکمەکانی ئیسلام بژێت. بۆچی؟ ئەحکامی ئیسلام ئەگەر بە جوانیی درك کرابێتن، پارێزگاریی لە مافی مرۆڤ دەکەن. ئەم ئەحکامانە بۆ هەموو مرۆڤەکان ڕاستگۆییان دەوێت و پارێزگاریی لە هەموو موسڵمانان دەکەن. ئەو کاتەی جوولەکەکان لە ئەندەلوس تووشی ئازار و شکەنجە بوونەوە بەرەو کوێ هەڵاتن؟ بەرەو مەغریب، ئەو شوێنەی کە ئێستاش تێیدا دەژین و ڕووبەرێکی بەرفراوانیان پێکهێناوە. یاسا و ئەحکامەکانی ئیسلام پارێزەری هەموو ئینسانەکانە. هیچ جیاوازییەکی تێدا نییە ئەگەر جوولەکە، موسڵمان یاخود مەسیحیی بن. الله لە قورئاندا دەفەرمووێت: "هیچ داسەپاندنێك لە ئاییندا نییە." دینی ئێوە بۆ خۆتان و دینی ئێمە بۆ خۆمان. هەر کەسێك ئازادە و دەتوانێت بە هەرشتێك، کە دەیەوێت باوەڕ بێنێت. بۆچوون و بەرنامەیەك، کە ئێمە لەبەرچاوی دەگرین و کاری پێ دەکەین بریتییە لە ئایینی ئیسلام. پارە بەو کەسە دەدەین کە برسییە، بەرگریی لەو مرۆڤانە دەکەین کە

ستەمیان لێ دەکرێت. لێم تێدەگەیت؟ ئەحکامی ڕاستەقینە ئەمەیە. داپاچین و خەتەنەکردنی ئافرەتان، بڕینی دەست، شەڕ و جینۆسایدکردنی غەیرەموسڵمانان، ئەحکامی ئیسلام نین، نەخێر. پەیامی ئێمە ئەمە نییە. ئەو شتەی داعش ئەنجامی دەدات، هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە نییە. ئەوان لە ئیسلام تێنەگەیشتوون .

کەسێك، کە بە دروستیی لە ئیسلام تێگەیشتبێت، هیچ یەکێك لە ئایەتەکانی قورئان لە دەقێك جیا ناکاتەوە. بۆ نموونە تەماشای ئەم ڕستەیە بکەن: "لە هەرکوێ ئەوتان بینیەوە، بیکوژن!" دەبێت ئەوە بزانین کە لەبەر چی ئەم ئایەتە دابەزیوە. لە چی زەمەنێکدا، لە پێش و پاشی ئایەتەکە چی هاتووە، نەك بە ئاسانی و بێ سەرنجدان لە هەموو لایەك هاوار بکەین:"لە هەرکوێ بینیوتانەوە، بیکوژن!". ئێستا من کەسێك دەکوژم؟ دایکم دەکوژم؟ بێگومان نەخێر! کەسانێك هەن کە لە چەمکی شەڕکردن کە لەو ڕۆژانەدا دەستی پێکردووە، ئەم جۆرە تێگەشتنەیان هەیە. هەروەها مەسیحی و جوولەکەکان. ئەوان لە هیچ شتێك تێ نەگەیشتوون .

باشترین کار بۆ ئەوەی ڕووداوەکانی سووریا پیشان بدەیت ئەوەیە کە تۆ گروپێکی وێنەگرتن کۆبکەیتەوە و بەڵگەفیلمێك، تەواو ڕاستگۆیانە دروست بکەیت. بەڵگەفیلمێك، کە هەموو شتەکان لە سووچێکی دیکەوە پیشان بدات. دیکۆمێنتارییەك کە هەوڵ بدات ڕاستگۆ بێت. دواتر دەبینیت، خەڵك لێرە چۆن دەژین و چ جۆرە تێڕوانین و بیرکردنەوەیەکیان هەیە. ئێمە توندڕەو نین. سەلەفیی نین. من هەرگیز کەسێکی مەسیحی، جوولەکە یان بووزایی یان شوێنکەوتووی هەر دینێکیتر لە خۆڕا ناکوژم. ئێمە موسڵمانین، تەنها ئاشتیمان دەوێت و ئەم ئاشتییەش بۆ هەموو مرۆڤەکانیتر بە ئاوات دەخوازین.

o ئەگەر ئێستا عەلەوییەك لە شەقامێکدا بەلاتا تێپەڕێت، چی ڕوو دەدات؟

• ئەو ئاییینی خۆی هەیە و منیش ئاییینی خۆم. تا ئەو کاتەی ئەو زیان بە من نەگەیەنێت، منیش زیان بەو ناگەیەنم. کەواتە دەتوانێت بە شەقامەکەدا تێپەڕێت. ئەگەر

ئـەوە داعـش بوایـە یەکڕاسـت دەیکوشـت، بـەڵام ئێمـە بـەم جـۆرە نـین. لێـرە پاکـەتی جگەرەش دەست دەکەوێت. خۆم جگەرە ناکێشم، بەڵام هەندێك لە هاوڕێکانم دەیکێشن. لێرە خەڵکانێك هەن ریشیان نییە، گوێ لە مۆسیقاش دەگرن. هەر کەسێك هەر کارێك تـا ئەو کاتەی زیانی بۆ دەوروبەر نەبێت، دەتوانێت ئەنجامی بدات. هەر کەسێك بـە تـەنهایی لە پێش الله دا باجی پادداشتی کارەکانی خۆی وەردەگرێت. ئەو شتەی ئـەنجامی دەدەی لـە نێـوان خـۆت و خـوادا دەمێنێتـەوە. ڕۆژێـك دێـت بـە تـەنهایی لـە بەرانبـەر ئـەو زاتـە دەوەستیت. حساب و کتابت تەنها لە لای ئەو دەبێت. هەر بۆیە تا ئەو کاتـەی زیانـت بـۆ هاورەگەزەکانت نەبێت دەتوانی هەر کارێـك کـە حـەزت لێیـە بیکـەیت. ئەمەیـە ئیسـلامی ڕاستەقینە. من دەمەوێت مرۆڤایـەتیی بـە ئیسـلامی ڕاسـتەقینە ئاشـنا بکـەم، ئەگـەریش مەسـیحیی بـن. حـەز دەکـەم سـەردانی ئێـرە بکـەیت و بەڵگـەفلیمێك (ڕاپـۆرتی ڤیدیۆیی/وێنەیی) دروست بکەیت و پیشانی بدەیت کە ئێمە لێرە چی دەکەین. چ بنەما و بەهایەکی ئیسلام جێبەجێ دەکـەین. بـەپێی ئـەم بنەمایانـە موسـڵمان دەتوانێـت لەگـەڵ مەسیحیدا ئاشتیی بکات و بە ئاشتی لە پەنای یەکتردا سەرقاڵی ژیانی خۆیان بن.

مـرۆڤ دەبێـت لـە حوکمـەکانی ئیسـلام تـێ بگـات. ئـەحکامی ئیسـلام ئـەو کەسـە دەکوژێت، کە بە شێوەیەکی خـراپ دەسـتدرێژیی سێکسـیی بکاتـە سـەر منـداڵان، بـەڵام ئەگەر کەسێك دزیی بکات یەکڕاست دەستی نابڕنەوە. ئەگـەر ئـەحکامی ئیسلام دەسـتی ئەو دزە ببڕێت، کە لەماڵەوە هیچ شتێکی نییە بیخوات، ئەوە حوکمی ئیسلام نییـە. ئـەو ئەحکامەش کە پاشا لە سایەیدا ورگێکی زلـی بـۆ خـۆی لـێ بەرداوەتـەوە و دراوسـێکەی منیش برسییەتی، ئەو ئەحکامەشم ناوێت. ئەمانە ئەحکامی ئیسلام نییە. حوکمی ئیسلام ئەوەیە کە هەمووان وەك یەك ماف خواردنیان هەبێت و لە ماف پاراستن و ئاشتی و ئارامی بێبەش نەکرێن و دزییان لێ نەکرێت. دەسـتی دز کاتێـك دەبڕدرێـت، کـە هـەموو شـتێکی هەبێت، بەڵام بچێت دزیی لە ژنێك بکات. ئەحکامی ئیسلام ئەمەیە.

○ تا ئێستا لە ئەڵمانیا ڕوویداوە، کە لە جێگایەك دزیت کردبێـت؟

• من له ئه‌ڵمانیا خراپه‌کاریی زۆرم کردووه. (پێ ده‌که‌نێت.) کڕین و فرۆشتنی مادده‌ی هۆشبه‌ر، لێدان و جنێودان، درۆکردن، جگه له پیاوکوشتن، هه‌ر کارێك به خه‌یاڵتدا دێت من له ئه‌ڵمانیا ئه‌نجامم داوه .

o باشه ئه‌گه‌ر ئه‌وکات، ئه‌وان ده‌ستی تۆیان ببڕییایه چی؟

• به ئه‌وانم ده‌گوت: "من به‌م کاره ڕازیی نابم." شتی له‌م شێوه‌یه‌م په‌سه‌ند نه‌ده‌کرد، چونکه ئه‌وکات له ئیسلام تێنه‌گه‌شتبووم. من ده‌ستکورت نه‌بووم و هیچ بهانه‌یه‌کیشم بۆ دزیکردن نه‌بوو، به‌ڵام ئێستا له ئیسلام تێگه‌یشتووم. حوکمه‌کانی ئیسلام ڕه‌حمه‌ت و حیکمه‌تن. ڕه‌چاوی بارودۆخی یه‌ك به‌یه‌کی مرۆڤه‌کان ده‌کات. هه‌میشه پێش ئه‌وه‌ی که‌سێك سزا بدات، هه‌لێکیتری ده‌داتێ: "کاتێك خواردنێکت نییه بیخۆیت، وه‌ره بۆ لای ئێمه، وه‌ختێك شتێکت پێویسته وه‌ره بۆ لای ئێمه، به‌ڵام مافی ئه‌وه‌ت نییه ئه‌و شته‌ی که هی تۆ نییه، بۆ خۆتی هه‌ڵبگریت و بیبه‌یت."

o وه‌ك باسده‌کرێت نزیکه‌ی ٣٠٠ ئه‌ڵمانی هاتوونه‌ته نێو سووریا. بۆچی هه‌ندێکیان دووباره ده‌گه‌ڕێنه‌وه بۆ ئه‌ڵمانیا و هه‌ندێکیتریان ناگه‌ڕێنه‌وه؟

• هه‌ندێکیان حه‌زیان لێیه بگه‌ڕێنه‌وه، به‌ڵام له‌وه ده‌ترسن بچنه نێو ئه‌ڵمانیاوه و ڕاسته‌وخۆ ده‌ستگیر بکرێن، به‌ڵام ئه‌گه‌ر کارێکیان نه‌کردبێت نابێت له هیچ شتێك بترسن. بۆ نموونه ئه‌گه‌ر بڕیار بێت من بگه‌ڕێمه‌وه بۆ ئه‌ڵمانیا، به‌هه‌رحاڵ ده‌خرێمه زیندانه‌وه. منیش گه‌مژه نیم. باش ده‌زانم که پۆلیس و پله‌داره کاربه‌ده‌سته‌کان، BKAو ده‌زگای ئاسایش و زانیاریی و ئیداره‌ی پاراستنی ده‌ستوور، هه‌ر ئێستا سه‌رقاڵی کۆنترۆڵکردنی گفتوگۆکانمانن. ئه‌وه‌ش ده‌زانم که بابه‌ته‌کانی نێو فه‌یسبووکه‌که‌م ده‌خوێننه‌وه، فه‌یسبووکه‌که‌م هاك ده‌که‌ن، به‌ڵام له ئه‌نجامدا ده‌بینن من مرۆڤێکی زۆر ساده‌م، بگره هه‌ندێك جار بابه‌ت بۆ ئافره‌تانیش ده‌نووسم. من شه‌رم له هیچ که‌سێك ناکه‌م. ئه‌گه‌ر قه‌رار بێت شه‌رمه‌زاری که‌سێك بم، ته‌نها که‌سێك که له پێشیدا شه‌رمه‌زارم، ته‌نها خوای میهره‌بانه، به‌ڵام ئه‌گه‌ر ڕۆژێك بگه‌ڕێمه‌وه ئه‌ڵمانیا، ئه‌وه زۆر تووشی کێشه ده‌بم، چونکه

زۆر دەمێکە لێرەم. ماوەی ساڵ و نیوێك دەبێت. تەنها بوونی پەیوەندی لەگەڵ کەسێکدا کە لە سووریا دەژێت، بەسە بۆ ئەوەی سەرێشەت بۆ دروست بکەن و بتخەنە زیندانەوە. لێرەدا ئەو هەم سەلەفی و هەم ترسناکیشە. گرنگ نییە تاوانێکی کردبێت یاخود نا. سیستمی ئەڵمانیا لەگەڵ موسڵمانەکان دادپەروەر نییە .

زۆرێك لە دۆستەکانم ئیتر نامەم بۆ نانێرن. چونکە دەترسن بەهۆی منەوە تووشی کێشە ببن. چیتر زەنگم بۆ لێ نادەن، یاخود کاتێك من زەنگیان بۆ لێ دەدەم، وەڵام نادەنەوە. هۆکارەکەشی دیارە: بەرپرسەکان هەموو شتێکیان کۆنترۆڵ کردووە .

o بەڵام بۆچی هەندێك دەگەڕێنەوە؟ ئەوان دەچنە سووریا و ٢ مانگ جیهاد دەکەن و دووبارە دەگەڕێنەوە بۆ قوتابخانە؟ دەچنەوە شارەکانیان و بۆ کیژۆڵەکانیانی دەگێڕنەوە و دەڵێن: هێی، من بۆ جیهاد ڕۆشتبووم.

• نازانم. ڕەنگە ئەو شتەی کە بەدوایدا گەڕاون لێرە دەستیان نەکەوتبێت. ڕەنگیشە ستەمیان لێ کرابێت. پێ دەچێت هەندێك تەنها بۆ تەماشاکردن هاتبێتنە ئێرە. ئەسڵەن هەندێك بۆ ئەوە هاتبوون بڵێن:" ئەهای، من بەشداریی جیهادم کردووە." دواتر دەگەڕێنەوە و بە خۆیاندا هەڵدەدەن کە ٥٠ کەسیان کوشتووە، ئەم شتانە بە تاموچێژەوە بۆ هاوڕێکانیان باس دەکەن، بۆ ئەوەی پێگە و ڕێزێك بۆ خۆیان بەدەست بێنن .

o پێشتر لە ئەڵمانیا چیت دەکرد؟

• من خولێکی کارناسیی وەرزش و لەشجوانییم بینیوە. پێش ئەوەش لە کەمپی پەنابەرەکان دەژیام. لە شوقەیەکی تێکەڵاودا... چوزانم. دڵنیام ئێستا ئەڵمانییەکان دەڵێن:" ئەهـ باوکە، کۆچکردن و ڕابردووی سەخت، بووەتە مایەی ئەوەی فڵانیی بەشداریی جیهاد بکات." نەخێر، ڕاستە من لە کەمپدا گەورە بووم، لە قوتابخانەیەکی سەرەتایی باش نەمخوێندووە و لەوێ خەریکی وێڵێتیی بووم، ماددەی هۆشبەرم کڕیوە و

فرۆشتووه و هەر کارێکی تر، بەڵام هیچ یەکێك لەمانە هۆکار نەبوون بۆ کۆچکردنی من بۆ ئێره. چونکە کەمێك پێش ئەوەی بێمە ئێره، وەزعم زۆر باش بوو. پارەیەکی زۆرم لە باخەڵدا بوو، چەند ئافرەتێکی جوان هاورێم بوون، کە خاوەنی جوانی و هەموو شتێك بوون. بارودۆخم تاڕادەیەك باش بوو. قەڵەو بووم و خاوەنی جەستەیەکی زۆر نایاب بووم. لە ڕاستیدا ئێستاش لەشولارێکی رێك و نایابم هەیە، بەڵام دەمزانی، کە ڕۆژێك دێت دەمرم و هەر وەك پێشتر گوتم، نامەوێت بچمە دۆزەخەوە. لە دۆزەخ دەترسم، دواتر گوتم کە پێویستە ئێستا لە خزمەتی پەروەردگارمدا بم. ببم بە موسڵمانێکی باشتر، تەرکی درۆکردن و کڕین و فرۆشتنی ماددەی هۆشبەر بکەم، لە سوکایەتییکردن بە ژنان، کاری بێڕەوشتیی و خراپ و ئازاردانی خەڵك دەست هەڵگرم. پێویستە ژیانم بگۆڕم، دەبێت هاوکاریی خەڵك بکەم، دەبێت کاری چاك بکەم. ئێستا گرنگترین شت بۆ من ئەمەیە .

o بەڵام سەلیم، تۆ کە ویستت کاری باش ئەنجام بدەیت، جگە لە ڕۆشتن بۆ شەڕ، بواری ئەوە نەبوو کارێکیتر ئەنجام بدەیت؟

• من دەمتوانی هەموو کارێك بکەم، بەڵام موسڵمانی ڕاستەقینە، ئیسلام هەڵدەبژێرێت و بەپێی ئیسلامیش لەسەر بنەمای" لا الـه الا الله"، باشترین کردەوە بریتییە لە جیهاد. ئەمەیە کە نابێت حاشا لە پەروەردگاری خۆت بکەیت. موسڵمان، گوێڕایەڵی خوداوەندە، نەوەك کەسی تر. پێش ئەمە، هەموو هەفتەیەك کچەدۆستێك و کوتەککاریی و ماددەی هۆشبەری نوێم هەبوو، بەڵام موسڵمانی ڕاستگۆ گوێڕایەڵی خواوەندە. الله ئەو زاتەیە، کە دایکی بە تۆ بەخشیوە، دایکی دڵسۆزت. هەر ئەو زاتەیە، کە خواردن و ڕۆزیت پێ دەدات و چاوی پێت بەخشیوە و دڵتی هێناوەتە ترپەترپ، ئەو زاتەیە، کە دەتوانێت بێ ئەوەی بەهانەیەکت بۆ بهێنێتەوە، بە ئاسانی ڕۆحت بکێشێت. چونکە مردن بەهانەی ناوێت. الله توانای کارکردنی بە من داوە. الله دەتوانێت ئەو هێز و گوڕەشم لێ وەربگرێتەوە. ئەو سەلامەتی و نەخۆشیی دەبەخشێتە من، الله ڕێنوێنیکەری

هـەموو شـتێکە. خـراپترین مـرۆڤ ئـەو کەسـەیە شـوکری نیعمەتـەکانی خـوا نـەکات. لـە ئیسلامیشدا باشترین کردەوە جیهادکردنە. ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە تـۆ خـوات خۆش دەوێت. موسڵمان(الله)ـی لە خۆی خۆشتر دەوێت. (الله)ــی لـە خەوەکـەی خۆشـتر دەوێت. (الله)ـی لە خواردنەکەی خۆشتر دەوێت. لە مانگی ڕەمەزانـدا نزیکـەی ١٤ بـۆ ١٥ کاتژمێر بە ڕۆژوو دەبێت، لە کەشوهەوایەکی گەرمدا، ئەو ئەم کارە تەنها لـە پێنـاو خـوا دەکات. هەر لەم پێناوەدایە موسڵمان بێ خۆپارێزیکردن گیانی خۆی فیدا دەکات. من بۆ فیداکاریی گیانم خۆم ناپارێزم. منـیش کۆمەڵـە ئـاواتێکم هەیـە، منـیش حـەز دەکـەم لـە ڤێلایەکدا بژیم. چەند ژنێکم هەبێت، دەوڵەمەند بم و هەر کارێکم حەز لێیە بیکەم. چونکە منیش مرۆڤم. مرۆڤیش لاوازە. مرۆڤ لە میوانی، ژن و شەراب لەزەت دەبات. موسـڵمانیش مافی خۆیەتی خۆشحاڵ بێـت، بەڵام تـا سـنوورێك. چـونکە خۆشـی و خۆشـگوزەرانیی زۆر مرۆڤ دڵڕەق دەکات.

باشـترین کـردەوە جیهـادە. جیهـادی دادپەروەرانـە و ڕاسـتگۆیانە. مـرۆڤ پێویسـتە ڕاستگۆ و دادپەروەر بێـت. چاو لە ڕووداوی ١١ـی سـێپتەمبەر بکـە. فڕۆکـەکان وەکـوو کارەبا لە ناوەندی بازرگـانیی جیهـانی دەدەن و هـەزاران مرۆڤـی بێتـاوان دەمـرن. ئەمـە جیهاد نییە. جیهاد بریتییـە لـە بـەرگریکردن لـە خـەڵکانی هـەژار و کۆمـەککردنیان، نـەك کوشتنی بێگوناهان.

o بەڵام بۆچی گەنجەکان، بە قسەی خۆتـان لەلایـەن داعشـی دێوانـەوە یـاخود لـە لایەن بەرەی نوسرەوە ڕادەکێشرێن؟

• ئەمەی تۆ دەیڵێیت. تۆ دەربارەی ئەم دێوانانە هەقیقەتت فـەرمووە. بـە ڕاسـتی جوانت فەرمووە. مافی مرۆڤ لە کوێیە؟ پاراستن و وەرگرتنەوەی مافی تاکەکەس لە کوێیە؟ داعش بە ئاسانی مرۆڤ دەکوژێت. ئەمانە پیاوکوژن، ئەگەریش لاف ئـەوە لـێ دەدەن، کـە موسڵمانن و یاساکانی خوا جێبەجێ دەکەن، دەی دادوەرییکـردن لـە کوێیـە؟ ئـەوان بـێ وەستان مرۆڤ دەکوژن و دەستی ئەو مرۆڤانە دەبڕن کە جگەرە دەکێشن.

o ڕیکخراوی قاعیدەش هەر بەم ڕادەیە ترسناکە.

• نازانم.

o بەڵێ، بەڵام تۆ ئێستا گوتت ڕووداوی ١١ی سێپتەمبەر هیچ پەیوەندییەکی بە جیهادی دادپەروەرانەوە نییە. شەرافەتمەندانەش نەبووە. کاری لەم جۆرە کەس ناخاتە بەهەشتەوە، بەڵکوو دەیخاتە بنی دۆزەخەوە.

• بەڵام من پێم وا نییە، کە ڕووداوی ١١ی سێپتەمبەر کاری ڕێکخراوی قاعیدە بێت. پێویستە ڕاستگۆیانە ئەمە بڵێم.

o بەڵام بن لادن خۆی ئەوەی گوتووە کە چەند کەسێکی بۆ ئەم کارە هەڵبژاردووە و بانگهێشت کردووە. کەواتە ئەویش گوناهکارە. کوشتنی خەڵکی بێگوناح، کوشتنی خەڵکی بێگوناحە. لە دیدی منەوە جیاوازی نییە کە بکوژ یونیفۆرم[٢١] بپۆشێت یاخود ماسك لێ بدات یان ئەوەی کە قوربانییەکەی بە کۆمپیوتەر دەست نیشان بکات. من هەموو ئەمانە بە کوشتن دەبینم. هیچ کات کوشتنی خەڵکی بێتاوان تەحەموڵ ناکرێت.

• بەهەر حاڵ تۆ ڕاست دەڵێیت.

o تۆش بەم شێوەیە بیر دەکەیتەوە؟

• بەهەرحاڵ، بەڵێ. بکوژەکانی ١١ی سێپتەمبەر با هەرکەسێك بن، بۆ من گرنگ نییە. من لە خوای میهرەبان دەترسم. دەترسم دواڕۆژ الله پێم بڵێت: "من ئەو زاتەم کە ژیانم بەم مرۆڤە بەخشیبوو و تۆ ئەو کەسەی کە ژیانت لێ وەرگرتۆتەوە. ئەسڵەن تۆ کێی کە ڕۆحی بەندەکەی منت کێشاوە؟ "

o ڕێك وایە، لێرەوەیە کە دەڵێم داعشیش هاوشێوەی قاعیدە تۆقێنەرە.

---

٢١- جلوبەرگی یەکدەست.

- من هەرگیز کاری لەم شێوەیە ناکەم. ئەگەر ئەندامی قاعیدە بوومایە و سەرۆکەکەم پێی گوتبام: "دەزانیت چییە، تۆ کە خەڵکی فرانکفۆرتی، وەزیفەت ئەوەیە کە بگەڕێیتەوە و بچیتە کامرزبانک[22] ـەوە." بۆچی دەبێت کاری لەم شێوەیە بکەم؟ ڕەنگە لەم ڕۆژەدا دایك و برا بچووکەکەی خۆم لە بانك بن. ڕەنگە لەم ڕۆژەدا دایکێکی تر لەوێ بێت، وا دابنێ ئەو دایکە مەسیحییە. ئەو لەگەڵ منداڵە چکۆلەکانیدا دەچێتە سەر بورجەکە و دەیەوێت سروشت و ڕوانگەکان لە ئاسمانەوە ببینێت و بە منداڵەکانی پیشان بدات. بۆچی من بچمە ئەوێ و...؟ نەخێر، من کاری لەم جۆرە ناکەم. من زانیارییەکی زۆرم لەسەر ئیسلام نییە. ئەمە بە ڕاستیی دەڵێم. زانیارییەکانم زۆر نین. تەنها مەبەستم ئەوەیە پەروەردگارم لێم ڕازیی بێت.

o بە ڕای تۆ ئەو کەسانەی دەچنە سووریا و پاشان دەگەڕێنەوە بۆ ئەڵمانیا، هیچ مەترسییەك بۆ ئەڵمانیا دروست ناکەن؟

- نەخێر!

o ئەوەیان چی کە گروپێك لە سووریادا دەڵێن، ڕۆژێك لە ئەڵمانیاش دەست بە کاروچالاکیی دەکەین؟

- نازانم، بەهەرحاڵ هیچ کەس مافی ئەوەی نییە کە بێتاوانێك، بێتاوانێك و بێتاوانێك بکوژێت.

من کەسێکی موسڵمانم، پێویستە بەرگریی لە حورمەتی پێغەمبەرەکەم بکەم. ڕەنگە ئەو شتانەی ئێستا گوتم، تەواوی ئەو قسانەی کە کردم گومان لەسەر من دروست بکات، بەڵام نامەوێت درۆت لەگەڵدا بکەم. هەرکەسێك سوکایەتیی بە پێغەمبەر بکات، پەرچەکردارێکی سەختمان بۆی دەبێت. لە ئیسلامدا سزای ئەو جۆرە کەسانەی سوکایەتی بە پێغەمبەر دەکەن تەنها کوشتنە.

---

٢٢- بانکێکی ناوداری ئەڵمانیایە.

o بەڵام دەزانی، ئەو کەسانەی سوکایەتی و هێرش دەکەنە سەر پێغەمبەر مەبەستیان ئەوەیە دنەی ئێوە بدەن. ئەوان حەز دەکەن هەموو موسڵمانان بڕژێنە سەر شەقامەکان و هاوار بکەن: "خوێن، خوێن، خوێن، ئێمە خوێنمان دەوێت!" بۆ ئەوەی ڕۆژێك دواتر ڕۆژنامەکانیان وێنەیەکی واقیعییان هەبێت و بتوانن بڵێن: "ئەم موسڵمانە دێوانانە ببینن. کاتێك سوکایەتیی بە کەسێك دەکرێت، ئەوان کەللەیان گەرم دەبێ و دەست بە مرۆڤکوشتن دەکەن. ئەمانە ئامانجیان هەر ئەمەیە."

• ڕێکوڕاست دەیڵێم، ئەگەر من لە ئەڵمانیا بووایەم و کەسێك سوکایەتی بە پێغەمبەرەکەم بکردایە، لام وایە دانەکانیم ورد بکردایە، بەڵام پێش ئەوە سەرنجی ئەوەم دەدا بزانم ئەم کەسە ئەقڵی هەیە؟ ئەگەر مرۆڤێکی بەدبەخت بێت و ئاگای لە خۆی نەبێت ئەوە کارم بەسەر کارییەوە نەدەبوو، بەڵام خەڵکانێکیش پەیدا دەبن، کە زۆر لێزانن و بەهۆی ڕق و کینەیان بەرانبەر بە ئیسلام خەڵکی بۆ ئەو کارە هاندەدەن. من ئەو کەسانە دەکوژم. ڕەنگە ئێستا وێنەکەم لای تۆ ناشیرین بوبێت. جیاوازی نییە بۆ من، چونکە من ئەم قسانەم لەو پێناوەدا نەکردووە، کە تۆ بە کەسێکی باشم لە قەڵەم بدەیت...

o ئەگەر من لە جێگای تۆ بووایەم. ئەم جۆرە کاروچالاکییە دنەدەرانەم پشتگوێ دەخست و ئاوڕم لێ نەدەدایەوە. چونکە خەڵکی بێشعور زۆرە، نابێت ئێوە ڕێگا بەوە بدەن کە کەسێکی بێشعور دنەتان بدات.

• ئەگەر کەسێك سوکایەتیی بە عیساش بکات، من هەر ئەم کارە دەکەم. من وادەزانم کە زیاتر لە مەسیحییەکان عیسام خۆش دەوێت. عیسا، ئیبراهیم، موسا، نوح و داوود و هەموو پێغەمبەران بۆ یەك دین هاتوون. تەواوی پێغەمبەران فەرموویانە: "خوای تاکوتەنها بپەرستن! هاوەڵی بۆ دروست مەکەن." عیسا نەیفەرمووە: "من بپەرستن." هەموویان بۆ یەکتاپەرستیی هاتوون. هەروەها عیساش، بەڵام مەسیحییەکان ئەم یەکتاپەرستییەیان چی لێ کردووە؟ سێ خودایان لێ دروست کردووە: باوك، کوڕ و ڕوح القدس. بەڵام عیسا بە ڕاشکاوانە لە ئینجیلدا گوتبووی: "من تەنها شوانێکی سادەم بۆ بەنی ئیسرائیل نێردراوم."

o مەریەم، دایکی پیرۆزت[٢٣] فەرامۆش کرد.

• "پێ دەکەنێت." ڕاستە. مەریەم، دایکی پیرۆزم لە یاد کرد، بەڵام هەر وەکوو پێشتر گوتم هەموویان بۆ یەکتاپەرستی هاتوون. مەریەمیش بەهەمان شێوە. من عیسام خۆش دەوێت. حەزم لێ بوو لە سەردەمی ئەودا ژیابام و لە شوێنکەوتوانی ئەو بوایەم. حەزم لێ بوو یەکێك لە شوێنکەوتوەکانی ئەو بوایەم. ئەگەر کەسێك سوکایەتی بە عیسا یان ئیبراهیم یاخود هەر پێغەمبەرێکی تر بکات، پشت بە خوا تا بتوانم ڕەفتارێکی زۆر توند و ددانوردکەرانەی لەدژ نیشان دەدەم، چونکە بەو کارە زۆر دڵگران و دڵتەنگ دەبم.

o من وای دەبینم لە دیدی(الله)شەوە ئەم کارە باشترە. پشت گوێخستن وەڵامێکی چاکتر و دەمکوتکەر دەبێت بۆ ئەو جۆرە مرۆڤانە. هیچ یاسایەك ناڵێت: هەموو خەڵکێکی نەفام و دنەدراو بکوژە. یا بە سادەیی دنەتان نەدەن! لە کۆتاییدا ئێوەی موسڵمانان زیاتر سوکایەتیی بە خۆتان دەکەن. کێشەی ئەم بابەتە لێرەدایە. ئەگەر تەماشای میدیاکان بکەیت لە هەموو جێگایەك نووسیویانە: "هەنووکە موسڵمانان بەربوونەتە گیانی یەکتر، سوننەکان دژی شیعە و عەلەوییەکان. هەریەکەیان دژی یەکتری". ڕۆژئاوا ئاگرەکە خۆشتر دەکات و دەڵێت: "ئەم شێتانە ببینن! ئێستا تەنها کافییە کەسێك کاریکاتێری محمد (درودی خوا برژێت بە سەریدا.) بکێشێت، ئەوجا هەموویان تووڕە دەبن."

o وەرە گفتوگۆکەمان بگۆڕین، دایك و باوکتان بیر لە چی دەکەنەوە؟

• ماڵەوە، گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، هەر دەڵێن بگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە!

o هەموو جارێك قسەیان لەگەڵ دەکەیت؟

• تەنها لەگەڵ دایکم قسە دەکەم. من باوکم ناناسم. ئەو ساڵەهای ساڵ ئێمەی بە تەنها جێ هێشتووە. یەك برای بچووکیشم هەیە. سوپاس بۆ خوا، هیچ کاتێك و هیچ کات

---

٢٣- مادر مقدس

دایکم نارەحەت نەکردووە و هەمیشە گوێڕایەڵی بووم. خێزانەکەم زۆر هەژارن. دایکم تەنها مۆڵەتێکی مانەوەی کاتی هەیە، تەنانەت پاسپۆرتیشی نییە. تەنها ٢٠٠ یۆرۆ وەردەگرێت و مافی ئەوەی نییە کاریش بکات. بە ڕاستی دەسکورتە. من دایکم لە هەموو شتێك زیاتر خۆش دەوێت.

- o بەڵام بە دڵنیاییەوە ئێستا دایکت دڵتەنگە.
- • دڵتەنگە، بەڵام درکی منی کردووە. دەزانێت بەراورد بە ڕابردوو ئێستا بوومەتە مرۆڤێکی باشتر و بە گوێرەی بەها و بنەما ئەخلاقییەکان دەژیم. ئەو دەزانێت، ئەگەر لە ئەڵمانیا دەرنەچووبایەم، سا بە بوونی ئەو هەموو هاوڕێ نارێکە و کاریگەرییەکانیان، زۆر بەدبەخت دەبووم و پێ دەچوو سەرلەنوێ دەستم بە کاری کڕین و فرۆشتنی ماددەی هۆشبەر بکردایەتەوە. ڕەنگە ڕەوانەی زیندانیان کردبام. ئەو دەزانێت، کە لێرە بە ڕاستیی بە کەڵك دێم و لەبەر ئەوەی هیوام هەیە، ئێستا موسڵمانێکی ترم. بەهەمان شێوە کە گوتم، زۆر باش دەبوو ئەگەر بتتوانیبایە فلیمێك یان ڕاپۆرتێك ئامادە بکەیت، بەڵام پێم وایە مەگەر ئەو کارە لە خەودا ببینم. ئەم شتە ڕوونادات، بەڵام هیچ شتێکیش فەرق ناکات.

- o بە ڕەچەڵەك خەڵکی کوێیت؟
- • دایکم مەراکشیی و باوکیشم خەڵکی تورکیایە.

- o هاندەری کام تیپی تۆپی پێیت؟
- • بە گشتیی ڕیاڵ مەدرید، بەڵام لە ئەڵمانیادا هاندەری یانەی شاڵکەم.

- o شاڵکە؟
- • کێشەت هەیە لەگەڵ شاڵکە؟ دەی بێگومان تۆ هاندەری یانەی دۆرتمۆندیت.

o نەخێر، من هاندەری بایرن مونشنم و هەر لەو شارەش دەژیم.

• بایرن، ئۆو چەند چاکە. دەبێت ڕاستگۆیانە دان بەوەدا بنێم لە ئێستادا یاری ئێف، سی، بایرن مونشن زۆر باشتر بووە. پاسکاریی کورت! لەم ڕۆژانە باڤارییەکان زۆر زۆر باش یاریی دەکەن.

o جارێکی تر دێمەوە سەر پرسیارەکانم کە تایبەتە بە ژیانی ئێوە، بۆ نموونە بۆ سبەینێ دەبێت چ کارێك ڕاپەڕێنیت؟

• پێش هەموو شتێك، لە ئێستاوە تاکوو نوێژی بەیانی بەخەبەر دەمێنم. یەك کاتژمێر و نیوی تر دەبێتە کاتژمێر ٤ـی بەیانی، ئەوکات کاتی نوێژی بەیانییە. ئەودەم نوێژەکەم دەکەم و دواتر کەمێك پاڵ دەکەوم. پاشان تا کاتژمێر ٩ یان ١٠ـی بەیانی دەخەوم. دوای ئەوە لە خەو هەڵدەستم. چەند وەرزشێك وەکوو شناوکردن و هەستان و دانیشتن ئەنجام دەدەم. پاش ئەوە دەچم لە هاوڕێکانم دەپرسم بۆ ئەمڕۆ چ کارێکمان هەیە. ئایا هێرش نەکراوەتە سەرمان؟ ئێستا بارودۆخ تا ڕادەیەك ئارامە. چەند ڕۆژێك پێش کاروچالاکیی سەربازیمان هەبوو، بەڵام لە ڕاستیدا دوێنێ و ئەمڕۆ هیچ هەواڵێك نەبوو، جگە لەوەی، کە فڕۆکەکانی جۆری میگ بە ئێرەدا تێپەڕیوون و بۆردومانیان کردووە. هەر وەخت هیچ کارێکمان نەبێت لە ماڵەوە دەمێنمەوە و شتێك دەخۆم یاخود لەگەڵ چەند برایەکم لە دەوری یەکتر کۆ دەبینەوە یان وەرزش دەکەم.

ماڵەکەی من زۆر نزیکی سنوورەکانی دوژمنە، لێرەوە تا ئەوێ ٦٠ – ٧٠ مەترێك دوورە. هەر کە ڕۆشتمە دەرەوە، ئەو کات لە ناوەڕاستی شوێنی شەڕدام. خانووەکەم لە نزیك سنووری شاری دەراوسێمانە. شەڕەکان لە نێوان شارەکەی من و شارەکەی دراوسێمان ڕوو دەدەن. زۆرجار گوللە بە تەنیشتمدا تێ دەپەڕێت یان چەند تۆپێك بەر زەوی دەکەون. ئێرە کۆمەڵە تەقەکەرێکی بەتوانای لێیە، بەڵام من خۆشم دەوێت.

**لێرەدا گفتوگۆکەمان بۆ چەند دەقیقەیەك دەپچڕێت، هەست دەکەم ئازیری تاقیکردنەوەی دۆخی مەترسیداریان لێداوە لێرەدا سەلیم داوای لێبوردن دەکات.**

• ئێمە بەردەوام لە ئامادەباشیداین. ئەگەر ئێستا شتێك ڕوویدات یەکڕاست من ئامادەم. چەکە AK-47ـەکەم هەمیشە لە تەنیشتمەوەیە و تفەنگە دەستییەکەشم بەردەوام لە پێش خۆم داناوە. بەم جۆرە هەرکات ڕووداوێك ڕوویدات لە ئامادەین، ئەگەر هیچ شتێك لە گۆڕێ نەبێت، ئەوکات سەرگەرمی ژیانی سادەی خۆمان دەبین. لێرە دەتوانرێت زۆر بە سادەوساکاریی ژیان بەسەر ببەیت. تەنها ترسێك ئەوەیە، کە زۆرجار فڕۆکەکان دێن و بۆردومان دەکەن، ئەگەر نا جگە لەمە ژیانێکی زۆر سادەوساکارمان هەیە. ئەگەر لێرەبای دەمتوانی هەموو شتێکت پێ پیشان بدەم، وەکوو چۆنێتی ڕۆشتنمان بۆ جەنگەکان. سوپاس بۆ خوا من چوار گوللەبەن (هێلەگ)ـی باشم هەن. دانەیەکیان هیی هاوڕێیەکمە پێشتر کوژراوە. ئەویش من بۆم هێنابوو. هەموو شتێکم بۆ ئامادە کردبوو، وەك تفەنگ و گوللەبەن. ئەگەر بڕیار بێت تۆ بۆ ماوەی هەفتەیەك سەردانی ئێرە بکەیت، ئەوکات هەموو ئەم کەرەستانەت پێشکەش دەکەم، بۆ ئەوەی پارێزراو بیت .

o بۆ ئەوەی منیش شەهید بم! ئێستا وەزیفەی تۆ چییە؟

• گرنگترین وەزیفەمان پاراستنی ئەم گوندەیە.

o لە پێناو چی پارێزگاریی لە ئەو گوندە دەکەیت؟

• لە پێناو دانیشتوانی گوندەکە، بۆ ئەوەی قەتڵوعام نەکرێن .

o بەرپرسی ڕێکخستنەکانتان کێیە؟ بەڕێوەبردنی کاروباری شارەکە لە ئەستۆی کێیە؟

• هەموو شتەکان خراپ ڕێکخراون.

هەموو شتەکان خراپ ڕێکخراون، زۆر خراپ. دەبێت ڕاستگۆیانە ئەوە بڵێم. بەڵام بارودۆخەکە باشتر دەبێت. سوپاس بۆ خوا ئێستا شارێلێکی زۆر لە ژێر ڕکێفی ئێمەدایە، لەم شارانەدا داعش وجودی نییە، بەڵکوو بەرەی نوسرە، احرار الشام، سوپای ئازاد و

باقی گروپەکان لێرەن. جندالاقصی باشترین گرووپە، بە ڕاستی ئەندامەکانی کەسانی زۆر باشن. لەم ڕوانگەیەوە من گەواهییان بۆ دەدەم. وەزیفەی ئێمە ئەوەیە ڕێگە نەدەین شارەکە لەلایەن سەربازانی ئەسەدەوە داگیر بکرێت، دواتریش لە پێناوی ئەوەی هەموو بتوانن تاڕادەیەك بە ئازادانە بۆ خۆیان بژین. دڵنیابە لێرە کەس ناتوانێت کاری ناتەبا و ناڕێك و دژ بە داوێنپاکی بکات، یان وەك ئەوەی کە دەڵێن، لەگەڵ ژنێك پەیوەندیی ناشەرعیی دروست بکات. بێگومان کاری لەم شێوەیە ڕێگەپێدراو نییە. باسوخواسی شەرابیش نییە، بەڵام خەڵك دەتوانن جگەرە بکێشن. هەندێکیش گوێ لە مۆسیقا دەگرن. لە ڕاستیدا هەر کەسە و سەرقاڵی کاری خۆیەتی و کاری خۆی ئەنجام دەدات. نوێژکردن لێرە بەزۆر نییە. هەڵبەتە نەبوونی داعشیش کاریگەریی هەبووە. ئەوکات داعش لێرەبوو چەند شەڕێکی قورس لەنێوان داعش و بەرەی نوسرە و احرار الشام ڕوویدا. بە ڕاستی شەڕێلێکی سەخت بوون. داعش ئێستاش هەوڵ دەدات بگەڕێتەوە بۆ ئێرە، بەڵام هەرگیز سەرکەوتوو نابێت. لە دیدی داعشەوە ئێمە گومڕا و لە دین دەرچووین و لەوانەین کە لە دین پاشگەز بووینەتەوە.

**لێرە بەدوا بۆ هەمیشە پەیوەندیی ئێمە و سەلیم پچڕا. ئیتر هەرگیز گوێمان لە دەنگی سەلیم نەبوو. من و فیردی هیواداربووین ئەو ڕازیی بکەین بۆ ئەوەی دەست لە جیهاد هەڵبگرێت و لە قوژبنێکی تری ئەم جیهانە بۆ خۆی ژیانیکی نوێ بنیات بنێت.**

**ئەبوقەتادە**

سەرەتای هاوینی ٢٠١٤، پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر لەگەڵ چەندین کەس لە شەڕکەرانی ئەڵمانیی لەنێو داعشدا لە پەیوەندیدا بووین. پەیوەندییەکان یەکشەوە پچڕان. یەکێك لە گەنجەکان ئێمەی لەوە ئاگادارکردەوە، کە لەگەڵ یەکێك لە بەرپرسەکان گفتوگۆی کردووە و ئەو بەرپرسە گوایە داوای ناونیشانی سکایپی منی کردووە. دەڵێت چیتر تۆ نابێت لەگەڵ هیچ کەسێك لێرە پەیوەندییت هەبێت. ئەو لە ئەمڕۆ بەدواوە دەتوانێت هەموو شتێکتان بۆ ڕێك بخات. چەند ڕۆژێکی دوای ئەوە

ئەبوقەتادە زەنگی لێدا. ئەبوقەتادە تەمەنی لە سەرووی ٣٠ ساڵەوەیە و خاوەنی لەشولارێکی گەورەیە. نزیکەی یەك مەتر و هەشتا سانتیمەتر باڵا و ١٥٠ کیلۆ کێشی هەیە، جیهادییەکە لە شێوەی گەنجەکانی بادئسپێنسەر[٢٤]، ئەو لەڕووی ئەقڵیی و ئایدۆلۆژییەوە بە ئەزموونترین کەسی گفتوگۆکەمانە، کە زانیارییە مێژووییەکانی بەرفراوانە، وەڵامەکانی ئەو توندوتیژ و کاریگەر بوون. وا دیاربوو لەنێو بەشی میدیای داعشدا پێگەیەکی سەرەکی هەیە، بەڵام سەبارەت بەم مەسەلە هیچ زانیارییەك نادرکێنێت. پێشتر مەسیحییەکی پرۆتستانتی بووە. ئەڵمانییەکی ڕەسەنە کە باوك و دایك و داپیری هەموو بەڕەچەڵەك ئەڵمانین. ئەو خەڵکی ناوچەی ڕاین –ڕورە (لە تەنیشت ڕاین) ی زولیگنە.

**ئەو گفتوگۆیانەی لێرەدا هاتوون کورت کراونەتەوە. یەکەمین گفتوگۆ لە ٩ـی سێپتەمبەری ٢٠١٤ ئەنجامدرا.**

- o ئەبوقەتادە، سڵاو دەنگت زۆر کزە.
- • من بە باشی گوێم لە دەنگی تۆیە.
- o زۆر باشە، تاقی دەکەینەوە. پلەی گەرمی لەوێ چەندە؟
- • نازانم بە ڕۆژ نزیکەی ٣٠ بۆ ٤٠ پلەی سیلیزی دەبێت.

- o ئاساییە، خراپ نییە.
- • هێشتا قابیلی خۆراگرییە.

- o پەیوەندییکردن لە ڕێگەی سکایپەوە لە ڕەققە کێشەیە؟
- • ئەگەر بمانەوێ سوود لە ئینتەرنێت وەربگرین، دەبێت بچینە کافی نێت. بەهۆی هۆکاری ئەمنییەوە ناتوانین بە تەلەفۆن قسە بکەین. هەر لەبەر ئەمە پەیوەندییکردن بە تۆوە سەخت و ئاڵۆزە.

---

٢٤- ئەکتەری بەناوبانگی ئیتاڵیایی (Bud Spenser)

o دەمەوێت دووبارە ئەوە بڵێم کە من بەدوای چیدا دەگەڕێم. دەمەوێت بزانم ئێوە بە ڕاستی چیتان دەوێت، ڕێکخستنەکانتان خوازیاری چییە؟ هەروەها زۆرینەی ئەو ئەڵمانیانەی لەوێن چییان دەوێت؟

• زۆر باشە.

o حەزدەکەم لە ناوچە جەنگییەکانی خۆتان چاوم بە ئێوە بکەوێت، بەڵام ئەوەش کارێکی ئاسان نییە.

• بۆچی ناتوانیت؟

o لەم بارەیەوە دەبێت بە ڕاشکاویی گفتوگۆ بکەین، بەهۆی کێشە ئەمنییەکانەوە کە هەیە. تۆش ئەمە دەزانیت. ڕەنگە تۆ بتوانی ئاسایشی من دەستەبەر بکەیت، بەڵام ئەگەر کەسێکیتر سەری پەڕاندم، ئەوکات چی دەبێت؟

• من لەگەڵ ئەوانەی سەرەوەی خۆم قسەم کردووە. لە بنەڕەتدا بابەتەکانی ئەمن و ئاسایش بۆ ئێمە گرنگ نین. ئێمە پاراستن و ئاسایشی تۆ دەستەبەر دەکەین. دەمانەوێت وێنەیەکی واقیعی داعش بە جیهانی دەرەوە پیشان بدەین. کەواتە چاکتر وایە خەڵکی سەردانی ئێرە بکەن. گفتوگۆی سکایپی لە جێگای خۆی، بەڵام ئێمە دەمانەوێت بە دنیای پیشان بدەین، کە لە ڕاستیدا ئێمە خەریکی چین. ئەو دەوڵەتەی ئێمە لێرە دروستمان کردووە، چی کار و کردەوەیەکی هەیە و ژیان لێرە بەراورد بە وڵاتە ئەوروپایی و ئەڵمانییەکان بە چی شێوەیەکە. هەربۆیە چاکتر وایە بۆ ناوچە جەنگییەکانی ئێمە بیت. تا کەمێك پێش ئێستا میدیاکان هەوڵیان دەدا لەگەڵ ئێمە ململانێ بکەن. نازانم تۆ ئاگات لێیە یاخود نا کە ئەوان پەیجەکانی ئێمەیان لەسەر تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان داخستووە و چیتر ئێمە توانای دەستڕاگەیشتنمان بە جیهانی دەرەوەوە نییە.

o گوێم لێیە.

پێشتر لەسەر ئەو کەسانەی کە دەتەوێ و دەتوانیت دیداریان لەگەڵ بکەیت ڕێك دەکەوین، چەند کەسێك تەرخان دەکەین بۆ کاروبارەکانتان و بێگومان شوێنی خەوتن، ماڵ و... هەر شتێکتان پێویست بێت و هەر شتێك لە توانای ئێمەدا بێت بۆتانی ئامادە دەکەین. هەروەکوو چۆن خۆت دەتەوێت دەرفەتی چاوپێکەوتن لەگەڵ چەندین ئەڵمانیدا ڕێك دەخەین.

- o من مرۆڤێکی ترسنۆك نیم. پێشتر بۆ زۆر ناوچەی جەنگی ڕۆیشتووم. بەڵام ئەگەری مەترسی هەیە. ئەگەر بچمە ناوچەیەکی جەنگییەوە بێگومان ئاگاداری خۆم دەبم بۆ ئەوەی نەتەقێمەوە. بە ڕاستیی تۆ چۆن دەتوانیت گەرانتی پاراستنی من دەستەبەر بکەیت. چونکە جگە لە خۆتان لە دەوروبەری ئێوە چەند گروپێکی شۆڕشگێری تریش هەن.
- • نەخێر، لە قەڵەمڕەوی ئێمەدا هیچ گروپێکی تر نییە .

- o چۆن دەتوانم بێم بۆ لای ئێوە؟
- • لە ڕێگای تورکیاوە. ئێمە دوو دەروازەی سنووریمان لەژێر دەستدایە. لە یەکەمین دەروازە، شاری غازی عەنتابی تورکیا هەیە کە نزیکە لەو شوێنەی مووشەکەکانی پاتریوتی ئەڵمانیی دانراوە، هەروەها شاری تەرابلوس لە دیوی سووریای دەروازەکەیە. ئەگەر هەڵە نەبم لە نزیك دەروازەی دووەم، شاری ئەلدەهای(الدهای) تورکیا و گریٚ سپی سووری هەیە.
- o چەند دوورە لە ئێوەوە؟
- • دڵنیا نیم، لە دەوروبەری ١٣٠ تا ١٥٠ کیلۆمەتر دەبێت. من ئێستاکە لە شاری ڕەققەم، لە باکووری سووریام.
- o کێ بەدوای ئێمەدا دێت؟

• ڕەنگە من وەکوو زمانزانێکی ئەڵمانیی لەگەڵتان بم، هاوڕێ لەگەڵ چەند کەسێکی تر، هەروەها دیسان لەوێ پیاوەکانی ئێمە هاوڕێیەتیتان دەکەن. بۆ خۆمان بە شوێنتانا دێین.

o بەڵام گەرانتی پاراستنی من چۆن دەبێت؟ ڕەنگە من بێمە ئەوێ و ئێوەش ببینمەوە و تۆش من بدۆزیتەوە، بەڵام ڕەنگە دواتر کەسێك پەیدا بێت و بڵێت: "ئەو کەسە دوژمنی ئێمەیە. ئەو هەمیشە لە پێش چاوی خەڵکیدا داعشی بەر ڕەخنە و تانەوتەشەر داوە." تۆ چۆن ئاسایشی من دەستەبەر دەکەیت بۆ ئەوەی ئەم کارانە ڕوو نەدات؟

• من نازانم ژمارەی ئەو موسڵمانانە چەندە، کە تۆ دەناسن یاخود ئەوە نازانم ئایا تۆ شارەزاییت لە یاسا ئیسلامییەکاندا هەیە یاخود نا؟ ئەو مەسیحییانەی ئێستا لە شاری ڕەققە دەژین، سەرانەی پاراستن، یان سەرانە بۆ پاراستنی خۆیان لەژێر هەر ناوێکی تردا بێت، دەدەن. ئەمە لە عەرەبیدا پێی دەڵێن(جزیە). بەگوێرەی نرخی ئێستای ئاڵتون بڕی ئەو سەرانەیە نزیکەی ٦٣٠ دۆلاری ئەمریکی دەکات. ئەم بڕە پارەیە بۆ کەسانی دەوڵەمەند دانراوە، هەژار و دەسکورتەکان نزیکەی نیوەی ئەو پارەیە بە دەوڵەت دەدەن. لە بەرانبەردا ئێمە دەیانپارێزین. هیچ موسڵمانێك ناتوانێت ئازاریان بدات و زیانیان پێ بگەیەنێت. لەژێر ڕۆشنایی ئەم قسانەدا ئەگەر کەسێك سەرپێچییەك ئەنجام بدات، ئەوە ڕەوانەی دادگای ئیسلامی دەکرێت و سزاکەی لەسێدارەدان دەبێت.

o بەڵام دوای چی، سزادانی چ فایدەی بۆ ژیانی من هەیە؟

• من دەتوانم لەلایەن خۆمانەوە گەرانتی بە ئێوە بدەم کە هیچ هێرش و شتێکی لەو جۆرە ڕووبەڕووتان نابێتەوە و کەس ئازارتان نادات. ئیدی دواتریش پەیوەندیی بە خۆتانەوە هەیە کە ئایا باوەڕ بە قسەکانی من دەکەن یاخود نا. من تەنها دەتوانم پێشنیارتان پێ بدەم.

o پێدەچێت من لەگەڵ ڕۆژنامەنووسێکدا بۆ ئەوێ بێم، بێگومان ئەویش پێویستی بە زەمانەتی پاراستن هەیە. بە نموونە نامەیەك لەلایەن ئەمیر یاخود خەلیفەکەتانەوە بنووسرێت، کە تێیدا ئەمە هاتبێت: "بەم هۆیەوە ئێوە بانگهێشت دەکەین بۆ ئێرە و کار و ڕەوتی میوانداریی و پاراستنی ئێوە فەراهەم دەکەین." چونکە ئەگەر شتێکی نەخوازراو ڕوویدات ئەوکات سەنگی ئەمیریش لە مەترسیدا دەبێت. بۆ ئەم مەبەستە تەنها نووسینی دوو دێڕ کافییە.

• زۆر باشە.

o ئەگەر ئەم نامە بنووسیت، لە ڕاستیدا بە بەڵێنەکەی ئاسایشی ئێمەی دەستبەر کردووە. من پشت بەم بەڵێننامەیە دەبەستم. بەم پێیە ئەگەر بەڵایەك بەسەر مندا بێت، ئەوکات بۆ بەڵێندەرەکەش خراپ تەواو دەبێت، ئەودەم چیتر هیچ کەسێك باوەڕ بە ئێوە ناکات.

• بەڵێ وایە، بێگومان. ڕەنگە یەکێك لە زەمانەتەکانی ئێوە ئەو شتە بێت، کە دەتوانیت ئەم ڕاپۆرتە لە ئەڵمانیا یان لە میدیاکان یان هەر لایەکیتر بڵاو بکەیتەوە. بۆیە ئەگەر شتێکی نەخوازراو بەسەر ئێوەدا بێت ئەوە مووشەکی فڕۆکەکان یان هەرشتێکی تر چارەنووسی ئێمە دەخاتە مەترسییەوە. ئەوکات دەموچاوی ئێمەش لە میدیاکان ناشیرین دەبێت، ئێمە حەزمان بەو شتانە نییە، کە هەندێك لە میدیاکان لەبارەی ئێمەوە دەیڵێن و بڵاوی دەکەنەوە، بەڵام بەداخەوە زۆرێك لە موسڵمانان، کە جێگای سەرنجی ئێمەن، پاش بیستنی ئەو شتانە ڕووبەڕووی ئێمە دەبنەوە. بێگومان ئێمە نامانەوێت ئەم شتە ڕوو بدات.

o بۆ من ئەوەندە بەسە زەمانەتێك لەلایەن ئەمیرەوە بدەن بە من، تێیدا هاتبێت: ئەم پیاوە بۆ ماوەی یەك هەفتە میوانی ئێمەیە و من زەمانەتی گیانی ئەم پیاوە دەکەم.

- پێ ناچێت کێشـەیەك هەبێـت. نامەکـە ئامـادە دەکـەم. دەتـوانین کـاری مـۆر و ئیمزاکردنەکەشی ڕێك بخەین. چونکە لێرە هەر پارێزگایەك مۆر و ئیمزای تایبـەت بـەخۆی هەیە. پێیان ڕادەگەیەنم کار و ڕەوتی نووسینی نامەکە و مۆرەکەی ڕێك بخەن.

  - مەبەستی من ئەوەیە نامەکە لەلایەن ئەبوبەکر بەغدادییەوە بێـت.

- پـێ ناچـێت بـەو ڕادە پێویسـت بکـات. سـەرانی مـن لـە حـەوزەی کارکردنیانـدا ئازادیی تەواویان هەیە، چونکە خودی ئەمیر بۆ خۆی دەست لەم جۆرە کارانـە وەرنـادات و خۆی تێکەڵ ناکات .

  - بەڵام لێرەدا کێشەیەك هەیە. من هێشتا لە ژیانمدا کۆمەڵێك بەرنامەم هەیـە. بـیر لـەوە بکـەوە چـۆن بتـوانم زەمانـەتی پاراسـتنم لـە ئەمیرەکـەتان بەدەسـتبێنم و ئێسـتا دەکرێت چەند پرسیارێکتان لێ بکەم و دەربارەیان ڕاوێژتان پێ بکەم؟ دەرفەتت هەیە؟

- بەڵێ، ئێستا دەرفەتم هەیە.

  - با بزانم بە کوێ دەگەین، تەمەنتان چەندە؟

- ٣١ ساڵ.

  - چ پاڵنەرێك وای کرد ڕوو لە سووریا بکەیت؟

- مـن ڕێگـای درێـژم بڕیـوە تـا گەیشـتوم بـە سـووریا. ڕاسـتەوخۆ لـە ئـەڵمانیاوە سەفەرم نەکردووە بۆ سووریا. پێشتر لە هەندێك لە وڵاتە عەرەبییەکان بووم. تـازە دوای ئەوە هاتوومەتە سووریا.

  - چەند وەختە لە سووریایت؟

- هممم، ئێستا لە چ ساڵێکداین؟ ٢٠١٤؟

o بەڵێ.

• بەم پێیە بێت... لەسەرەتای ساڵی ٢٠١٣ـەوە لە سووریام.

o لە وڵاتی تورکیاوە چوویتە نێو سووریا؟

• من بە زۆریی لە دەوروبەری شاری حەلەب و ئیدلیب بووم. واتە دروست نزیکی سنووری سووریا.

o لەگەڵ کام ڕێکخراو؟

• لەگەڵ بەرەی نوسرە بووم. ئەوکات هێشتا داعش لە سووریا بوونی نەبوو.

o پاڵنەرەکانتان چ بوو؟ هیوای ڕووخاندنی بەشار ئەسەدتان هەبوو؟ ویستتان لە دامەزراندنی خەلافەتێکی ئیسلامیدا هاوکاریی بکەن؟ یا پاڵنەری ئایدیۆلۆژیتان هەبوو؟

• باسکردن و ڕوونکردنەوەی هێندە ئاسان نییە. بە بەراورد بە وڵاتەکانی تر سووریا چەند ئیمتیازێکی هەیە. فەرموودەی زۆری پێغەمبەران دەربارەی ڕۆژهەڵات، سووریا، فەلەستین، ئێراق، بەشێك لە ئێراق، بەشێك لە تورکیا، ئەردەن و عەرەبستانی سعودی بوونی هەیە. بە دەستپێکردنی شەڕ لە سووریا، خەڵکیی سوودیان لەم دەرفەت و پێگەیە وەرگرت و خۆیان گەیاندە ئێرە. چونکە لە دیدی موسڵمانانەوە و لە ڕووی مێژوویی و ئایینییەوە و بەپێی گوتەی پێغەمبەران بێت ئەم ناوچەیە ناوچەیەکی پیرۆز و تایبەتە.

o بەڵام دەغدەغە و پاڵنەری تۆ چی بوو؟ دەتویست ئیسلامێکی نایاب ئەزموون بکەیت؟ مەبەستتان کۆتاییهێنان بە دیکتاتۆرێك بوو؟ پاڵنەر و بزوێنەری سەرەکیتان چی بوو؟

• هۆکاری سەرەکی ئەوە بوو، کە ویستم بەلای کەمەوە دەوڵەتێکی ئیسلامیی دروست ببێت. بێگومان سەرەتای هاتنەژوورەوەی ئێمە بۆ ئێرە بیرۆکەی دامەزراندنی

دەوڵـەت زیـاتر تیـۆری بـوو تـاوەکوو کرداریـی. لـە سـەرەتادا بـاس لـە یارمـەتیی و هاوکـاریکردنی خـەڵك دەکرا. بـا لـەوە بگـەڕێین ڕۆشـتنە سـووریا ئاسـانتر بـوو تـاوەکوو سـەفەرکردن بـۆ وڵاتـانی دی. لـەم ڕۆژانـەدا ئەگـەر کەسـێك بیەوێـت بـۆ شـەڕکردن دژی ئەمریکییەکان بچێتە ئەفغانستان، ڕەنگە نـەتوانێت لـە ئـەڵمانیاش بێتـە دەرەوە، بـەڵام کۆچـبەرانێکی زۆری ئـەورووپایی و عـەرەبی هاتوونەتـە سـووریاوە و لێـرە دەژیـن. بـە هەزاران کەس. چونکە هاتن بۆ سووریا زۆر ئاسانترە لە ڕۆشتن بۆ ئەفغانستان. هـەروەها جگە لەمەش ژیانی ئێرە بە بەراورد بە ئەفغانستان زۆر نزیکترە بە ژیانی ئەورووپییەکان، هەر بۆیە ژیان لێرە بۆ ئێمە زۆر ئاسانترە. ڕۆشتن بەرەو ئەفغانستان کێشە و سەرێشـەی زۆرە.

- o خەڵکی کام ناوچەی ئەڵمانیایت؟
- • ناوچەی ڕۆر. ماوەیەك کاری ئازادم هەبوو. بەڵام ساڵی ٢٠٠٨ دەستم لە کاری ئازادیش هەڵگرت. لەو ساتەوە کەمتازۆر لە سەفەر و گەڕاندا بوم.

- o کارەکەتان لە چی بوارێکدا بوو؟
- • کڕین و فرۆشتنی سۆفت وێر و هاردوێر.

- o لەنێو جیهانی عەرەبیی یاخود ئیسلامیدا کام دەوڵەتتان خۆش دەوێـت؟
- • هیچیان.

- o هیچیان؟
- • بەڵێ، هەر لە سەرەتاوە خۆشم لێیان نایەت.

- o تەنانەت عەرەبستانی سعودییش؟
- • نەخێر (ئەوە) بێگومان نەخێر.

o بەڵام وڵاتە عەرەبییەکان پشتگیریی دارایی داعش دەکەن، ئایا لەم بارەیەوە من بەهەڵەداچووم؟

• ئەمە پروپاگەندەیە بۆ کەمکردنەوەی هەژموونی و پێشڕەوی دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامی. داعش لە هیچ قۆناغێکدا هاوکاریی دارایی لە دەرەوەی خۆی وەرنەگرتووە. ڕەنگە هەندێك جار دیارییەکی تایبەتی بۆ هاتبێت کە توانیبێتی نزیکەی ۱۰۰۰۰ یان ۱۰۰۰۰۰ دۆلاری ئەمریکیی بۆ ئێمە دەستبخات، بەڵام ئێوە بۆ خۆتان دەزانن بە ۱۰۰۰۰۰ یان یەك ملیۆن دۆلاری ئەمریکی ناتوانرێت خەرجی بچووکترین شەڕیش بکرێت. بەشێکی گەورەی دەسکەوتە سەرەکییەکانمان لە ڕێگای غەنیمەت(دەستکەوتی شەڕ)ەوە کۆدەکرێنەوە.

o من بە درێژایی جەنگی سووریا، شەش جار سەردانی ئەوێم کردووە. لەگەڵ شۆڕشگێڕەکان چاوپێکەوتنم کردووە. لەگەڵ خەڵکانێك لەنێو سوپای ئازاد، بەرەی نوسرە کە تۆ ڕۆژگارێك لەگەڵیان بوویت. هێزەکانی سوپای ئازاد بە منیان گوت کە هاوکارییە داراییەکانیان لە ئەمریکا و شانشینی ئیماراتەوە وەردەگرن.

• بەڵێ، ئەوە ئاشکرایە. لە ڕاستیدا داعش لە ئێراقەوە، ئەو شتەی لە ڕۆژئاوا کەم کەس دەیزانێت، بەرەی نوسرەی هەناردە کرد بۆ سووریا. سەرکردەی نوسرە ئەبومحەمەد ئەلجۆلانی ڕاسپێردرا بۆ ئەوەی بچێتە سووریا و لەوێ نوێنەری دەوڵەتی ئیسلامی بێت، بەڵام ئەو دەستی کرد بە وەرگرتنی پارە لە وڵاتانی دەرەوە و خیانەتی لە ئامانجە هاوبەشەکانمان کرد. پاشان ڕۆژێك بەرەی نوسرە بە ڕەسمی لە دەوڵەتی ئیسلامی جیابوویەوە و بە شێوەیەکی کاتی لەگەڵ سوپای ئازادی سووریا یەکیان گرت، بۆ ئەوەی دژی دەوڵەتی ئیسلامی بجەنگێت. چونکە سەرمایەدارە گەورەکانی ئەوان لە دەرەوە، چی وڵاتە عەرەبییەکان یان ئەورووپییەکان بێت – خوازیاری ئەم مەسەلەیە بوون.

o کام لە وڵاتان خەرجی بەرەی نوسرە لە ئەستۆ دەگرێت؟ عەرەبستانی سعودیی یان ئەمریکا؟

• ڕاستەوخۆ هیچ کامیان، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆش هەردوولایان لە ئەستۆی دەگرن. دواجار هەردوو بارەکەش یەك شێوەیە و فەرق ناکات. عەرەبستانی سعودیی دەتوانێت تەنها پشتگیریی ئەو کەسانە بکات کە ئەمریکا دانی پێدا دەنێت، بۆ نموونە بەرەی بە ناو ئیسلامی.

o یانی ئەمریکا بەم ڕادەیە هەژموونی بەسەر عەرەبستانەوە هەیە؟

• بێگومان، ئەوە ڕوون و ئاشکرایە.

o قەبارەی هێزەکانی دەوڵەتی ئیسلامی لە ئێراق و سووریا چەندە؟ ئامارێکی نێزیکم دەوێت.

• سەختە، ناتوانرێت ئامارێکی ورد بگوترێت. من پرسیارم لە زۆرێك لە ڕابەرانیش کردووە، تەنانەت خودی ئەوانیش بۆ خۆیان دڵنیا نین لە ئامارەکان، بەڵکوو تەنها دەتوانن بە خەمڵاندن ئامارەکان بڵاوبکەنەوە.

o بە گوێرەی هەڵسەنگاندنەکان چەند دەبن؟

• سەرانی من، کە زۆرینەیان لە ئێراقن، بە منیان گوت، لە ماوەی ئەم هەفتە و مانگەکانی کۆتاییدا ژمارەی جەنگاوەرەکانمان لە ئێراق، دە هێندەی پێشتر زیادی کردووە. بە ژمارەیەکی هاکەزایی دەتوانم بڵێم نزیکەی ١٥٠٠٠ تا ٢٠٠٠٠ شەڕکەر دەبن.

o لە ئێراق؟

• نەخێر، لە ئێراق و سووریا هەردوو. تا ئەو جێگەی پەیوەندیی بە لایەنی بەڕێوەبردنەوە هەیە، بە هەژمارکردنی لایەنی دادوەریی، هێزە ئیدارییەکان، پۆلیس، پۆلیسی ئەحکامی ئیسلام و ئەوانی دیشەوە دیسان هەر نزیکی ئەو ژمارەیە دەبن.

o رۆڵی عەشیرەتە سوننە عەرەبەکان و باقی گروپەکانیتر، کە پێویستە داعش لەگەڵیان یەکگرتوو بێت و شان بەشانیان بجەنگێت تا چ ڕادەیەك بەهێزن؟ دروست بە ئەندازەی داعش؟ سوننەکان باسی ئەوە دەکەن زۆر لە داعش بەهێزترن. ئەوان دەڵێن نزیکەی ۲۰۰۰۰ چەکداریان هەیە، بەڵام تۆ دەڵێیت زۆر لەو ژمارەیە کەمترن.

• شان بەشانی ئەوان شەڕکردن ڕاست نییە. لە مانگی جانیوەری ۲۰۱٤، واتا سەرەتای ئەمساڵ چیتر لەگەڵ هیچ گروپێك هاوپەیمانی ناکەین. دەوڵەتی ئیسلامی، چیتر لەگەڵ هیچ گروپێك یەکگرتوو نابێ. مەگەر ئەوەی کە گروپێك خۆی بکاتە وەقفی دەوڵەتی ئیسلامی، چەکەکان و شەڕکەرەکانی تەسلیمی ئێمە بکات. جگە لەمە پێشنیاری هیچ جۆرە هاوپەیمانێتییەك پەسەند ناکەین.

o هەروەها لە سووریاش؟

• بەڵێ، هەروەها لە سووریاش.

o بە بۆچوونی تۆ پێت وایە چەند ئەڵمانی لە نێو داعشدایە و چەند ئەڵمانی لە سووریا لە بەرەکانی شەڕدایە؟ تۆ بەراوردێکی سانا و ئاسان بکە، لە ئەڵمانیا دەڵێن ژمارەی ئەڵمانییەکانی نێو داعش۳۰۰ کەسێك دەبێت.

• من ناتوانم دان بە بوونی ۳۰۰ کەسدا بنێم و هەروەها ناشتوانم بڵێم کە ئەوان ۵۰۰ بۆ ۱۰۰۰ کەس دەبن. بەهەرحاڵ پێم وایە ۹۰٪ی ئەڵمانییەکان ئەندامی دەوڵەتی ئیسلامیی(داعش)ــن. هەرچیش ماوەتەوە لەنێو بەرەی نوسرە و احرار الشامدا دابەشبوون .

o بەڵام پێت وا نییە پێوانەکەتان هەڵەیە؟

• گومانم لەوە نییە، کە دەوڵەتی ئەڵمانیا دەتوانێت لە ئێمە باشتر زانیاریی لەسەر ئەو مەسەلەیە بدات.

o ئایا ئەگەری هەیە ڕۆژێك لەڕۆژان دووبارە بۆ ئەڵمانیا بگەڕێیتەوە؟

• بێ شك نەخێر. (پێ دەکەنێت.)

o ئایا دەربارەی ئەوانیتر چی، ئەو ئەندامە ئەڵمانییانەی، کە لەنێو داعشدان؟ ئایا بەشێکیان خوازیاری ئەوە نین بگەڕێنەوە بۆ ئەڵمانیا یان نا هەموویان دەیانەوێ بمێننەوە؟

• ئەگەر لە دیدی ئیسلامەوە سەیر بکەین، بە دووری دەبینم کەسێك بۆ ئەڵمانیا بگەڕێتەوە، بەڵام پێدەچێت کەسێك بریندار ببێت یان تووشی خەمی غەریبی ببێت، ڕەنگە ئەوکات بیەوێت بۆ لای خێزان و منداڵەکانی بگەڕێتەوە. ئەمانەی باسم کرد فاکتەریترن. ئەگەری ئەوەش هەیە هەندێك بەهۆی ئەم شتانەوە بگەڕێنەوە. لە مانگی جانیوەریدا، لە کاتی دەسپێکردنی شەڕەکان ژمارەیەك لە شەڕکەرەکان دووبارە بۆ وڵاتەکانی خۆیان گەڕانەوە. ئەڵمانییەکان، بەلژیکییەکان، تەنانەت عەرەبەکانیش.

**• لە ئەڵمانیا داواکاری گشتی چاوەڕوانیان دەکات، چونکە هیچ کەسێك مافی ئەوەی نییە لە گروپە تیرۆریستییەکاندا چالاکیی بکات. ئەم کارە تاوانە و سزایەکی سەختی هەیە. شتی لەم جۆرە مەگەر دوودڵیی دروست ناکات؟**

• نا بەم جۆرە نییە، بەڵام بە ڕای من ڕەنگە تۆش ئاگادار بیت، کە هەندێك لە ئەفغانستانەوە بۆ ئەڵمانیا گەڕانەوە. بە بارودۆخێکی تەواو جیاوازەوە. زۆرێکیان چاوەڕوانی زیندانیکردنی هەتاهەتایی بوون. دواجاریش بەرگەی دەگرن، سێ، چوار یا پێنج ساڵ لەوانەیە زۆرتریش. ئەوانەی دەگەڕێنەوە دەبێت خۆیان بۆ ئەم مەبەستە ئامادە بکەن بە هەر هۆیەکەوە بێت .

o لە ئەڵمانیا نیگەرانییەکان لەوێوە سەرچاوە دەگرن، کە ئەم جیهادییانەی دووبارە گەڕاونەتەوە بۆ ئەڵمانیا، سەرپێچیی یاسا و بەها ئەخلاقی و مەزهەبییەکان بکەن. چەندین جار لەگەڵ ئەو کەسانە قسەم کردووە، کە لەم ڕۆژانەدا سەرقاڵی شەڕکردنن لە وڵاتە ئیسلامییەکان. ئەوان بە منیان گوت: بەڵام خۆ ئێمە لەگەڵ ئەڵمانیادا شەڕ ناکەین. ئێمە لە سووریادا دژی ڕژێمەکەی ئەسەد شەڕ دەکەین نەوەك دژی دەوڵەتی ئەڵمانیا. ڕای ئێوە چییە لەم بارەیەوە، ئایا پێویست دەکات ئەڵمانیا لە گەڕانەوەی ئەو کەسانە بترسێت؟

• وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە سەختە. ئەگەر لە ڕوانگەی ئیسلامەوە تەماشای ئەم مەسەلەیە بکەین، ئەڵمانیا بە دوژمنی ئیسلام و ململانێکارێکی دژەئیسلامیی لەقەڵەم دەدرێت .

o لە ڕوانگەی تووە ڕەنگە بەو جۆرە بێت، بەڵام خۆ زۆرینەی جیهانی ئیسلامی ئەو شێوە تێڕوانینەیان نییە.

• سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتی ئەڵمانیا بەرانبەر ئیسرائیل ئاشکرایە، سیاسەتی دەرەوەی ئەڵمانیا بەرانبەر ئەفغانستان ڕوون و ئاشکرایە، ئەڵمانیا بە بکوژی موسڵمانان لە ئەفغانستان و وڵاتانیتر دەناسرێت، هەروەها بە هەناردەکەری چەك بۆ سەرانسەری جیهان دەناسرێت، ئەو چەکانەی کە دژی موسڵمانەکان بەکار دەهێنرێن، ئەڵمانیا لەم بابەتانەدا ناوبانگی هەیە. پێشتر دەربارەی عەرەبستانی سعودیی قسەمان کرد. بۆ نموونە هەمووان ئەوە دەزانن، کە ئەڵمانیا مەشق بە هێزە یەدەگەکان لە عەرەبستان یان بە دەستەواژەیەکی ڕوونتر بیڵێم مەشق بە دەزگای زانیاریی و ئاسایشی عەرەبستانی سعودیی دەکات، دەی هەمووان ئاگاداری ئەوەن، کە چەك و تەقەمەنییان بۆ دەنێرن. جگە لەوەش، بێگومان ئاگاداری ئەوەشن کە کورت ویسترگارد[٢٥] بەهۆی کاریکاتۆرەکانییەوە دژی پێغەمبەری ئیسلام لەلایەن (ئەنگێلا میرکل)ـەوە ڕێزی لێ گیرا و پێشوازیی لێ کرا و خەڵاتی پێ بەخشرا. لە ڕووی شەرعی و یاساییەوە سزای ئەم جۆرە کەسانە کوشتنە. دواجار ڕوون و ئاشکرایە، کە ئەڵمانیاکەی ئێوە دوژمنی ئیسلامە.

o بەڵام هەموو خەڵکی ئەڵمانیا بەو جۆرە نییە.

• هیچ جیاوازییەکی نییە، بە تایبەت ئەگەر تەماشایەکی سیستمی دیموکراتیکی ئەڵمانیا بکەین، دەوڵەت پێکهاتووە لە خەڵك، بەم پێیەش خەڵك لە کردەوەکانی دەوڵەت ڕازییە. یان بەلای کەمەوە بە چەند خاڵێکی ڕەزامەندن. ئەم مەسەلەیە لە ڕاپرسییەکاندا

---

25- Kurt Westergaard-

وێنەکێشی دانیمارکیی کەوا کاریکاتێرەکانی لەسەر پێغەمبەری ئیسلام (درودی خوای لەسەر بێت.) لە ساڵی ٢٠٠٥ لە گۆڤاری دانیمارکیی جیلدنز پوستن" بڵاوکرایەوە.

بە ڕوونی دەردەکەوێت و دەتوانرێت تێبینیی بکرێت. ئەگەر گەشتێك بە نێو سایتەکانی ئینتەرنێت یاخود تۆڕەکانی هەواڵدا بکەین، ئەوکات دەبینین زۆرینەی خەڵك پشتگیریی مەسەلەی شەڕی دژ بە ئیسلام دەکەن. پێشوازیکردن لە شەڕی بەناو دژ بە تیرۆریزم. دواجار لە ئاکامدا دەبینین کە ئەڵمانیاش بۆ خۆی دوژمنی ئێمەیە.

o ڕەخنەکانی ئێوە دژی سیاسەتی دەوڵەتی ئەڵمانیا، دەچێتە ڕیزی ئەو هەڵوێست و کارانەوە، کە هەندێك جار منیش ئەنجامیان دەدەم، بەڵام تۆ ئەڵمانیا بە دوژمن دەزانیت. مانای ئەم قسەیە چییە؟ مانای ئەوەیە کە ئەو کەسانەی لە جەنگ دەگەڕێنەوە بۆ ئەڵمانیا هێرش دەکەنە سەر دەوڵەت و بەردەوام دەبن لە جەنگ ؟ ئایا ئەڵمانیا پێویست دەکات نیگەرانی شەڕکەرە گەڕاوەکانی نێو داعش بێت بۆ ئەو وڵاتە؟ ئایا ئەڵمانیا پێویست دەکات نیگەرانی ڕوودانی پیلانەکان بێت؟

• لە ئێستادا سیاسەتی ئێمە بە هیچ شێوەیەك بەم جۆرە نییە. هەنوکە ئەم جۆرە سیاسەتە پەیڕەو ناکەین. ئەگەر لێمان گەڕێن بە ئارامیی بژین، ئەوە ئێمەش ئارامیی ئەوانیتر دەپارێزین. هەڵبەت ئەو ڕۆژەی سنووری دەوڵەتەکەی ئێمە بگاتە ئەڵمانیا لەگەڵ خەڵکی ئەوێشدا بەشەڕ دێین، بەڵام لە ئێستادا هەر پیلان و کردەوەیەك کە باس دەکرێت، دوورە لە ڕاستییەوە. لانیکەم لە ئێستادا نا...

o واتە بە بۆچوونی ئێوە ئەو کەسانەی دەگەڕێنەوە ئەڵمانیا کاری تێکدەرانە و پیلانگێڕیی ناکەن؟

• ڕەنگە لە فەڕەنسادا دیبێتتان. کەسێکی بەلژیکی یان بە پێچەوانەوە کەسێکی فەڕەنسی لە بەلژیکا کاری پیلانگێڕانە و تێکدەرانەی کردەوە، دروست نازانم لە کوێ بوو، لە بیرم چووە، ئەو پیاوەی ڕۆشبووە سەر مۆزەی یەهودییەکان و بە کلاشینکۆفەکەی چەند کەسێکی کوشتبوو. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەو چاوەڕێی دەستووری کەسێکی تری نەکردووە، بۆ خۆی ئەم کارەی ئەنجام داوە، تەنها بڕیاری خۆی بووە. ئەسڵەن دوور نییە کار و ڕووداوی لەم جۆرە جارێکیتر ڕووبداتەوە. ئەگەر بڵێم ئەم ڕووداوە هەرگیز جارێکیتر دووبارە نابێتەوە، ئەوە درۆ دەکەم .

o بۆچوونی خەلیفە دەربارەی ئەم سەرپێچییانە چییە؟

• هەر وەکوو گوتم، لە ئێستادا سیاسەتی دەوڵەتی ئیسلامیی ئەمە نییە. دەتوانین چی بڵێین، ڕووداوێکە و ڕووی داوە.

o چاوەڕوانیتان لە بەرفراوانبوونی دەوڵەتی ئیسلامی تا چ ئاستێکە؟ قەرارە ئەم دەوڵەتە تا کوێ بەرفراوان بێت؟

• بە پشتبەستن بە فەرموودەکانی پێغەمبەری ئیسلام(درودی خوای لەسەر بێت.) دەزانین کە، ڕۆژێك دێت ئیسلام دەست بەسەر هەموو جیهاندا دەگرێت و حوکمی دەکات. ئەمەش دێتە دی، ئەمەش بەشێکە لە بیروبۆچوونی ئێمە و لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانم بڵێم دەوڵەتی ئیسلامی لەسەرانسەری جیهاندا حوکم دەکات.

o بەڵام قورئان دەڵێت هیچ ناچارکردنێك لە بواری بیروباوەڕدا نییە، مەسیحییەکان و یەهودییەکان دەتوانن دینی خۆیان بپارێزن. ئەوان تەنانەت دەتوانن لەژێر دەسەڵاتی محەمەد(درودی خوای لەسەر بێت)یشدا دینەکەی خۆیان بپارێزن و لەسەر دینەکەیان بمێننەوە.

• بێ شك ڕاست دەفەرمووێت. ڕەنگە ئاگادار بیت لەوەی کە لە شاری ڕەققە دەتوانم بڵێم پەیمانی ئاشتیی جیبەجێ دەکرێت. پێشتر لەمبارەیەوە قسەمان کرد کەوا مەسیحیەکانی ڕەققە بەرانبەر پاراستنی ماڵ و گیانیان سەرانە دەدەن. مەسیحییەکان مافەکانی خۆیان پێ دەدرێت، دەتوانن مەراسیمی پەرستش و عیبادەتەکانیان ڕێك بخەن، لە سایەی ئاسایشدا دەتوانن دوعا و پاڕانەوە و باقی عیبادەتەکانیان ئەنجام بدەن. مەسیحییەکانی موسڵ بەم شتانە ڕازیی نەبوون. دواتر سێ هەفتە مۆڵەتمان پێ بەخشین بۆ ئەوەی لەگەڵ هێزەکانی دەوڵەتی ئیسلامییدا چاوپێکەوتن بکەن و لەم بارەیەوە بە ڕێککەوتن بگەن. ئەوان ئەم کارەیان نەکرد. دواتر سێ ڕۆژ مۆڵەتمان پێ دان یان سەرانە بدەن یا ئەم وڵاتە بەجێ بهێڵن یان ئەوەی دەکوژرێن.

o به بۆچوونی تۆ ئەم کارە باشە؟

• بێگومان بەڵێ. ئەگەر وا نەبووایە من لێرە ئەندامی دەوڵەتی ئیسلامی نەدەبووم. ئەمە ڕاستییە و یاسای ئیسلامە. ئەڵمانیاش بە موسڵمانان دەڵێت دەبێت چی بکەن و چی نەکەن. ئێمەش دروست هەر ئەو کارانە لەگەڵ مەسیحییەکان دەکەین.

o بەڵام ئەمە زۆر هەڵەیە. من هەموو ڕۆژانێکی شەممە لەگەڵ هەندێك لە موسڵمانە ئەڵمانییەکان یاریی فوتبۆڵێن دەکەم، موسڵمانەکان لە هەڵبژاردنەکاندا دەنگ بەو حیزبەی کە پێیان باشە، دەدەن، هاوڕای دەوڵەتن یان موخالیفین. بۆ نموونە بەشێکی زۆری هاوڵاتیان دژی شەڕی ئەفغانستانن. موسڵمانان ناچار نین گوێڕایەڵی هیچ وڵاتێك بکەن.

• ئەو شتەی تۆ دەیڵێی هێندە ڕاست نییە. بەڵگەش بۆ ئەمە داخستنی ئەو مزگەوتانەیە کە بە دڵی کاربەدەستە ئەڵمانییەکان نەبوو. ئازادیی مەزهەبیی لەم شێوەیەی موسڵمانە ئەڵمانییەکان بە زاراوەیەکی باشتر بیڵێم زۆر بێمانایە و بەڵگەیەکی دیاریشە بۆ ئەم مەسەلەیە.

o لەو شارەی کە من تێیدا دەژیم، مونیخ، لە ئێستادا خەریکی دروستکردنی مزگەوتێکی نوێن.

• تۆ ناوی ئەو شوێنە بە مزگەوت دەبەیت. ئێمە لە ئیسلامدا ئەو شوێنە بە مزگەوت دانانێین. ئەگەر سوورەتی نۆیەمی قورئان بخوێنێتەوە، چەند ئایەتێك دەربارەی مزگەوت دەخوێنیتەوە، کە خەڵکی دەچنە ئەو شوێنە تا بە ئاگاییەوە زیان لە ئیسلام بدەن. ئەم مەسەلەیە زۆربەی مزگەتەکانی ئەڵمانیا دەگرێتەوە. لەو مزگەوتانە و لە وتارەکاندا پشت بە ئیسلام نابەسترێت، بەڵکوو شتێلێکیتر بە خەڵك دەگوترێت. لەوێ بنچینەکانی بیروباوەڕی خۆیان لەگەڵ بنچینەکانی دیموکراسیی و ڕێبازەکانی تر وەکوو مەسیحییەت یا هەر ئایدیۆلۆژیایەکی تر تێکەڵ دەکەن. دواتریش سەرەڕای گومراکردنی خەڵك ئەم شتانە وەکوو ئیسلامەتی بە موسڵمانان دەفرۆشنەوە .

o لەم بارەیەوە ناتوانم درکی بۆچوونەکانتان بکەم. تۆ خۆت بە سەلەفی دەزانیت یان وەهابی؟

• کێشە ئەوەیە کە تەواوی ئەم چەمکانە، سەلەفی یان وەهابی، چەمکێلێکن، کە لە بنەڕەتدا هیچ پەیوەندییەکیان بە دینەوە نییە، بەڵام ئەگەر لێم دەپرسیت کە من شوێنکەوتەی محەمەد (درودی خوای لەسەربێت) و پەیڕەوی لە ئەو دەستە فێرکارییانەی ئەو دەکەم، کە لە ماوەی ژیانیدا بەرگریی لێ کردوون، ئەوە دەڵێم بەڵێ، من لەم ڕوانگەیەوە سەلەفییم. کەواتە بە دڵنیاییەوە ڕاستە من سەلەفییم.

o پێشتر گوتتان کە حەزتان بە هیچ وڵاتێکی عەرەبی نییە، تەنانەت شانشینی عەرەبستانی سعودییش، بەڵام خۆ عەرەبستانی سعودی بەتەواوی توانای پشتگیریی ڕەوتی سەلەفیزم و وەهابییەت دەکات.

• ئەمەش دیدێکی ڕواڵەتییانە و سادەیە. ئەو داڕوخانە ئەخلاقییەی کە لە وڵاتەکانی تردا هەیە بە وردیی لە عەرەبستانی سعودیشدا دەبینرێت. لە عەرەبستان، ئەحکامی ئیسلام تەنها بەسەر ئەو کەسانەدا جێبەجێ دەکرێت کە لە خزمان و خانەدانانی پاشا نین، یاخود خاوەنی پێگەیەکی سیاسیی بەرز نین، واتا خەڵکی سادەوساکار.

o ئایا دەوڵەتێك هەیە لەم جیهانە بەگوێرەی بۆچوونەکانی ئێوە نزیك بێت لە دەوڵەتێکی ئیسلامییەوە؟ ئایا وڵاتێکی ئیسلامیی بەدی ناکەیت کە دەربارەی بڵێیت: کاروکردەوەکانیان خراپ نین؟

• بێگومان نەخێر. هیچ وڵاتێکی ئیسلامی نییە کە ئەحکامەکانی ئیسلام تاڕادەیەکیش جێبەجێ بکات، یاخود پەیڕەوی لەو ئەحکامانە بکات.

o لە درێژەی لەشکرکێشییە جیهانییەکانتاندا ئەگەری هەیە هێرش بکەنە سەر تەواوی ئەم وڵاتە ئیسلامییانە؟

• بێگومان ئەم شتە ڕوودەدات.

o ئەگەر باوەڕتان بەوە هەیە، کە ڕۆژێك دێت دەوڵەتی ئیسلامی دەسەڵاتی هەموو جیهان دەگرێتە دەست، بە گوێرەی زانیارییە جوگرافییەکان بێت سەرەتا دەبێت هێرش بکەنە سەر وڵاتە عەرەبییەکان.

• ئەو وڵاتەی دواتر هێرش دەکەینە سەری، ئەگەری هەیە عەرەبستانی سعودیە یاخود ئەردەن بێت و دواتر بەم شێوەیە لە پێشڕەویدا دەبین.

o بەڵام ئەمە دەبێتە مایەی خۆشحاڵکردنی عەرەبستانی سعودی.

• من بەم شێوەیە بیرناکەمەوە.

o ئەگەر ئەم بابەتانە ئەوها بە ڕاشکاویی دەربڕیت، ئەوە دوژمنەکانتان ژمارەیان زیاتر دەبێت. ئەو دەم دنیا تەنها بینەری پێشهاتەکان نابێت. ڕاستی، بۆچی دەوڵەتی سووریا هێرشی توندتر بۆ سەر مۆڵگەکانتان ئەنجام نادات؟ ئەوانە جۆرە فڕۆکەیەکیان هەیە، کە دەتوانن بە شێوەیەکی توندتر هێرش بکەنە سەر بارەگا و مۆڵگەکانی ئێوە لە ڕەققە.

• بێگومان ئەم هەواڵەت خوێندوەتەوە: "هێرشی توندمان بۆ سەر مۆڵگەکانی ئەسەد دەست پێکرد." دوای ئەوەی کە توانیمان گروپەکانی تری وەك بەرەی ئیسلامی لە ناوچەکانمان دووربخەینەوە، کەمێکیش هەناسەی ئاسوودەییمان هەڵکێشا. پاش ئەوە پێگەی سەربازی ڕەققەمان کردە ئامانج بۆ هێرشەکانمان. لە ماوەی دوو ڕۆژدا بە تەواویی توانیمان ئەوێ کۆنترۆڵ بکەین. بێگومان لە ئێستادا هێرش و پەلامارەکانی ئەسەد توندتر دەبن. دۆخەکە لە ئێستادا بەو جۆرەیە، کە ئەسەد موشەك و فڕۆکەی زیاتر ئاراستەی ئێرە دەکات. تەنها لە ماوەی دوو ڕۆژی ڕابردوودا ئەسەد چوار موشەکی لە جۆری ئیسکادی هەڵداوەتە ناوچەکانی ئێمە، بەڵام موشەکەکان بێ زەرەروزیان بوون و بەر ناوچە گرنگ و هەستیارەکان نەکەوتوون .

o بەڵام پێدەچێت ئەسەد دیسان فڕۆکەی زیاترتان بۆ بنێرێت.

• فڕۆکەکان هەموو ڕۆژێك دێن. ئەمە شتێکی تازە نییە لێرە. هەموو ڕۆژێك دێن و شوێنێك بۆردومان دەکەن، بەڵام هەدەفگیریی و پێکانەکانیان زۆر ورد و دەقیق نین. هەروەها ناردنی یەك یان چەند فڕۆکەی جەنگی بۆ ئەوان تێچوونێکی زۆری دەوێت. کێشەی زۆربەی وڵاتەکان بەهەدەردانی خەرجییەکی زۆرە لە ڕێگەی جەنگەوە. لە ڕاستیدا جەنگ پێویستی بە خەرجی و تێچوونێکی زۆرە.

ڕەنگە تێچوونی جەنگەکانی ئەمریکا بزانیت. شەڕی ئەفغانستان و ئێراق، کەمتازۆر ئەمریکای تووشی تێکشکان کردووە. بەهەرحاڵ بەلای کەمەوە کێشەی دارایی بۆیان دروست کردووە، چونکە وڵاتەکەیان بە سەختیی بەڕێوە دەبەن و لە ئێستادا قەرزێکی نێودەڵەتی زۆریشیان لە ئەستۆدایە.

o هەفتەی پێش بۆ ماوەی چوار ڕۆژ لە شاری غەززە بووم. لەوێ فڕۆکەکانی ئیسرائیل ناوبەناو هەندێك لە ئامانجەکانیان زۆر بە وردیی بۆردومان کردبوو. هەڵبەتە زۆرتر خەڵکی بێلایەن و مەدەنییان کردبووە ئامانجی هێرشەکانیان .

• بەڵام ئیسرائیلییەکان پارەیان زۆرە. هەروەها لێرە جەنگی ناوخۆی سووریا ئەوە ماوەی ٣ ساڵ دەبێت، کە بەردەوامە. ئەم جەنگە بە ملیارد پارەی خستۆتە سەر شانی دەوڵەتی سووریا. بەردەوامبوونی جەنگی لەم شێوەیە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن کارێکی سەخت و دژوارە.

o بە پێچەوانەوە ئێوەش پارەیەکی زۆرتان هەیە. ڕۆژنامەکان نووسیویانە داعش لە ئێراقدا غەنیمەتێکی گەورەی بەدەستهێناوە، زیاد لە یەك ملیارد دۆلاری ئەمریکی دەبێت. ئەمە ڕاستە؟

• بەڵێ.

o جارێکیتر بە کورتیی دێمەوە سەر باسی مەسەلەی ئەڵمانیا. ئەڵمانیا لای تۆ مانای چی دەگەیەنێت؟ ئایا فوتباڵی ئەڵمانیا بەلای تۆوە سەرنجڕاکێش نییە؟

• نەخێر، بە هیچ جۆرێك. پێشتریش بۆ من شتێکی سەرنجڕاکێش نەبووە.

o ئەو دەمەی هێشتا نیشتەجێی ئەڵمانیا بوویت، شتێکی تایبەت نەبوو کە حەزتان لێی بێت یان سەرنجتان ڕابکێشێت، یاخود شتێك لەوێ نەبوو کە خۆشحاڵتان بکات؟

• وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر سەخت و دژوارە. بێگومان لە ڕووی جوگرافیاوە ئەڵمانیا بۆ من پتر لەژمارەیەك لە وڵاتە عەرەبییەکان بە سەحرا و ناوچە گەرمەکانیانەوە خۆشتر بوو. بەڵام بۆ تاکێکی موسڵمان شتێلێکی گرنگتر هەن.

o لە هەڵبژاردنەکانی ئەڵمانیا دەنگت بە کام حیزب داوە؟

• من هەرگیز بەشداریی دەنگدانم نەکردووە. تەنانەت ئەو دەمەشی کە موسڵمان نەبووم.

o ڕاتان لەسەر خانمی مێرکڵ چییە؟

• ئەگەر ژنێك ببێتە پێشەوای هەر وڵاتێك ئەوا دڵنیابە ئەو وڵاتە نابووت دەبێت. ئەگەر کەسێك شارەزای ژیان و مێژووی سیاسیی مێرکڵ بێت، دەزانێت کە لە پشتی سیاسەتەکانی مێرکڵەوە جگە لە بەرژەوەندییخوازیی هیچ شتێکیتر بەدی ناکرێت، بە تایبەتی لە بواری گەیشتن بە دەسەڵات و مانەوەی لەسەر لوتکەی دەسەڵات.

o لەم بابەتەدا من هاوڕات نیم. بە بڕوای من خانمی مێرکڵ زۆر شایستەیە، بەڵام با مەسەلەکە بگۆڕین. خۆشترین یادگاریی تەمەنی لاوێتییتان لە ئەڵمانیا چییە؟

• نازانم چۆن وەڵامی ئەم پرسیارەت بدەمەوە. بێگومان لەو تەمەنەدا مرۆڤ هەندێك کار و هەڵسوکەوت دەکات، کە لە دیدی ئیسلامەوە پەسەند نین، بەڵام هەندێك جار یادگاریی جوان و خۆشیش دێتە پێشێ، کە ناتوانی چاوپۆشیی لێ بکەیت. تەنانەت ئەگەر درکپێکردنیشی بۆ هەندێك کەس سەخت بێت.

o تۆ وەکوو تاکێکی موسڵمان لە ئەڵمانیادا بە شێوەیەکی باش یان خراپ مامەڵەت لەگەڵدا کراوە؟ ڕووبەڕووی کێشەی ڕەگەزپەرستی بوویتەتەوە یاخود نا؟

• بە دڵنیاییەوە ڕووبەڕووی ڕەگەزپەرستی بوومەتەوە. من ساڵی ٢٠٠٣ موسڵمان بووم. پاش ماوەیەکی کەم بوو کە لە کۆمپانیایەکی گەورە دەورەی فێربوونی بەڕێوەبردنی بازرگانییم دەست پێ کردبوو. بواری کارکردنەکەم زۆر لەگەڵ ئەرك و فەرمانە ئیسلامیەکاندا گونجاو نەبوو، لەوانە وەکوو مۆڵەتدان بۆ ئەنجامدانی نوێژی هەینی. بێگومان ئەمە ڕەگەزپەرستییە. ئەرکی ئایینیت هەیە، بەڵام ناتوانی ئەنجامی بدەیت. تەنانەت ئەگەر ڕێککەوتنت لەگەڵ سەرۆکیشدا تاقی کردبێتەوە. من تەنها کەسێك نیم کە ڕووبەڕووی کێشەی ڕەگەزپەرستیی بوومەتەوە، خەڵکی زۆر هەن دووچاری ئەو کێشە بوونەتەوە.

o بەڵام من هاوڕێیەکی موسڵمانم هەیە ڕۆژی پێنج جار نوێژ دەکات. هیچ کەسیش نابێتە ڕێگر لەپێشی بۆ ئەوەی ئەم کارە ئەنجام نەدات. خۆیشی ڕێگە نادات کەسێك ببێتە بەربەست و ڕێگریی لێ بکات.

• بەڵام ئێمە زۆرینەی خەڵکی ئەڵمانیا لەبەر چاو دەگرین و ئەوان مۆڵەت بە ئەم جۆرە کارانە نادەن. ئەڵمانیا بۆ هەموو جیهان قسە لەسەر دیموکراسیی و ئازادیی دەکات. هەر کەس بۆ خۆی دەتوانێت هەر کارێکی حەز لێ بوو ئەنجامی بدات و بە هیچ جۆرێك دەستدرێژیی ناکرێتە سەر کەرامەتی، بەڵام بۆ ئازادیی ئایینی و هاوشێوەکانی کۆمەڵەیاسایەکیان داناوە، بەڵام دواتر کۆمەڵە مامۆستایەك پەیدا دەبن کە خوازیاری ئەوەن تەنها سەرپۆشێکی وشك و خاڵی لەسەر بکەن، یان باڵاپۆشییەك کە لە دیدی ئیسلامیشەوە قابیلی قەبوڵ نییە، سەرەڕای ئەوە ڕێگریشیان لێ دەکرێت. دوای ئەمە تۆ هاتووی لێم دەپرسیت ئایا ڕەگەزپەرستی هەیە یاخود نا؟

o پێش ئەوەی موسڵمان بیت، چی ئایینێکت هەبوو؟

• مەسیحیی پرۆتستانتی بووم، بەڵام منیش وەکوو باقی ئەڵمانییەکانی تر هیچ سەروکارێکم لەگەڵ دینەکەمدا نەبوو.

o دایك و باوكت خەڵكی كام وڵاتن؟ وڵاتە ئیسلامییەكان یاخود ئەڵمانیا؟

• دایك و باوكم هەردوو خەڵكی وڵاتی ئەڵمانیان. داپیرە و باپیرەشم هەر ئەڵمانی بوون، هەروەها ئەژدادیشم ئەڵمانی بوون.

o هۆكاری هۆگریی تۆ بۆ ئیسلام چ بوو؟ چی ڕووداو و پێشهاتێك بووە مایەی ئەوەی ڕوو لە ئیسلام بكەیت؟

• ئەمە لە ماوەی پرۆسەیەكی چەند ساڵیدا ڕوویدا كە بە موسڵمانبوونم كۆتایی پێ هات. چونكە لەگەڵ ئیسلامدا پێوەندییم هەبوو.

o كام لە تایبەتمەندییەكانی ئیسلام لە مەسیحییەت بە باشتر دادەنێیت؟

• باسوخواسی دووورودرێژە.

o بەڵام دینەكان نزیكن لەیەكترەوە؟

• بەڵێ.

o ئایا الله هەر ئەو خوایە نییە كە مەسیحییەكان دەیپەرستن؟ تەنها یەك خوا بوونی هەیە.

• بەڵێ و نەخێریش. بیروڕای مەسیحییەكان دەربارەی خوا، سێیەتی، سێ بەشكردن، لەگەڵ یەكتاپەرستییدا نارێكە و جیاوازیی هەیە. ئەمە بۆ من شتێكی گرنگ بوو تاوەكوو بڕیار لەسەر ئەوە بدەم كە ئیسلام لە مەسیحییەت ڕاست و ڕەوانترە.

o زۆربەی جوولەكەكانیش باوەڕیان بە یەكتایی خوا هەیە.

• ئەم مەسەلەیە چەند كاتژمێرێك گفتوگۆی دەوێت. گفتۆگۆكردن لەسەر جیاوازییەكان و ئەو شتانەی كە لە ئایینەكانی دیكەدا نادروستن، بە بۆچوونی من گەورەترین بەڵگە لە ڕاستێتی ئیسلام ئەوەیە، كە تەورات وەكوو ڕۆژی ئەوەڵی دابەزینی

بە پاکی و نەگۆڕیی نەماوەتەوە. لەکاتێکدا قورئانی ئەمڕۆ، دروست هەر ئەو قورئانەیە کە بۆ پێغەمبەر دابەزیوە. ئەگەر کەسێك حەز دەکات بزانێت خوا داوای چی لێ دەکات، پێش هەموو شتێك پێویستی بە دەستوور و ڕێکارێکی جوان هەیە بۆ کاروکردەوەکانی و دەبێت لەو دەستورەدا ئەو شتانە ڕوونکرابێتنەوە کە خوا لە بەندەکانی داوا دەکات، بەڵام ئەگەر ئەم دەستوور و ڕێکارە گۆڕدرابوون یان باوەڕپێکراو نەبوون، چیتر شایستە نین و بە دەردی هیچ شتێك ناخۆن.

o من چەندین جار قورئانم خوێندووەتەوە. بە حەز و خولیا و بەهرەمەندییەوە. بە کورتی لە قورئاندا هاتووە: "ئەگەر کەسێك مرۆڤێك بکوژێت، وەکوو ئەوە وایە هەموو مرۆڤایەتی کوشتبێت، ئەگەریش مرۆڤێك لە مردن ڕزگار بکات، هاوشێوەی ئەوەیە هەموو مرۆڤایەتی ڕزگار کردبێت." گرتەیەکی ڤیدیۆیی دەوڵەتی ئیسلامییم بینیوە کە تەنها کوشتن و بڕینی تێدا ئەنجام دەدەن. تۆ ئەو گرتەڤیدیۆییەت بینیوە کە مانگێك پێش ئێستا بڵاوکرایەوە. لەم گرتە ڤیدیۆیەدا ترۆمبێلێك بەسەر ڕێگا شەستییەکەدا لێ دەخوڕێت، هەر کات ترۆمبێلێکی تر بەلایدا تێدەپەڕێت یان پێشی دەکەوێت، ئەو شووشەکەی دێنێتە خوارەوە و پاشان ڕەشاشەکەی دێنێتە دەرەوە و هێندە تەقە لە ترۆمبێلەکان دەکات تاوەکوو تەواوی سەرنشینەکانی نێوی دەکوژێت. بە بۆچوونی تۆ ئایا ئەم کارە کارێکی ئیسلامییانەیە؟

• ئەو کەسانەی کە گوللەباران کران، هەموویان ئەندامی سوپای ڕژێمەکەی مالیکی بوون لە ئێراق. ئەوەش بزانە کە خەڵکیش هێندە بێگوناح نین. ئەوانە بەهۆی کوشتنی موسڵمانانەوە گوناحکارن. بەهۆی خیانەتکردن لە دینەکەیان تاوانبارن. ئەگەر لەم ڕوانگەیەوە تەماشا بکەین بە قەولی ئەڵمانییەکان سزایەکی دادپەروەرانە چاوەڕێی دەکردن. بەو شێوەیە نییە کە دەوڵەتی ئیسلامی ڕوو لە هەر کوێیەك بکات بە ڕۆژی نیوەڕۆ کەسێکی بێتاوان، کە هەرگیز لەگەڵ داعش شەڕی نەکردوە و هیچ کارێکی دژی ئیسلام ئەنجام نەداوە، گوللەباران بکات.

o بەڵام مەگەر پێشتر بە وردیی چەکدارە تەقەکەرەکان دەیانزانی کێ لەنێو ئۆتۆمبیلەکان دایە؟

- بەڵێ، بێگومان. ئەم هێرشانە پێشوەخت پلان و بەرنامەی بۆ دڕێژرابوو.

o ئەو هێرشانە زۆر توند و بێبەزەییانەبوون. من دەربارەی محەمەد(درودی خوای لەسەر بێت) زۆر شتم خوێندووەتەوە. محەمەد و خوای قورئان هیچ وەختێك هێندەی داعش بێڕەحم نەبوون. هەرگیز تا ئەم رادە زبر نەبوونە. من هەمیشە دینی ئیسلامم بە دینی مرۆڤایەتیی دادەنا، زیاتر لە ٥٠ ساڵ دەبێت کە بە هەموو دنیادا دەگەڕێم، بەڵام تاکوو ئێستا لە هیچ قوژبنێکی ئەم جیهانەدا جیهانێکی پڕ لە مرۆڤدۆستی وەکوو جیهانی موسڵمانان نادۆزمەوە .

- ئەوهاش نییە کە داعش هەرگیز مافی هەڵبژاردن بە خەڵك نەدات. ڕەنگە لە مانگی جانیوەری ئەو کاتەی کە گروپەکانی تر لە سووریا شەڕیان دژی ئێمە دەست پێ کرد، بەدواداچوونت بۆ ئەم بابەتە کردبێت. هەر ئەو دەمەی بەغدادی لە ڕێگەی سیدییەکەوە پەیامێکی دەنگیی دژی دوژمنەکانمان بڵاوکردەوە. وی لەو پەیامەدا دەڵێت:"چەکەکانتان دابنێن، پاشگەزبوونەوەتان لێ قبوڵ دەکەین، دەتوانن بێنە نێو ڕیزەکانی ئێمەوە، ئێمە دەست لە دوژمنایەتیتان هەڵدەگرین، لەگەڵ ئێوەدا بەشەڕ نایەین و هتد... بەڵام لە کاتی بەردەوامبوونی هێرشەکان، ناچارین هێزەکانمان لە بەرەکانیتر بکشێنینەوە و لەگەڵ ئێوەدا بەشەڕ بێین. بە یارمەتیی خوا تەفروتوناتان دەکەین." بەڵام پاش ئەوەش ئەوان هەر بەردەوامبوون لە شەڕ دژی ئێمە. لەم ڕوانگەیەوە ئێمە بە سەختی ڕووبەڕوویان بووینەوە. ئەوان بە تەواویی لە ناوچەکانی ئێمە دوورخرانەوە و چەکەکانیان لێ وەرگیرا. لە ڕووی غەنیمەتی شەڕیشەوە بە ملیۆنەها پارەمان خستە گیرفانەوە. تەواوی ئەو شتانەمان بە غەنیمەت دەستکەوت، وەکوو چەك و پارە و بیرەنەوت و گاز کە لەژێر کۆنترۆڵی ئەواندا بوون. ئەو دەمە سەدان و بگرە هەزاران کەس لە خەڵکی کوژران، بەڵام بەو جۆرە نەبوو کە مافی هەڵبژاردنیان نەبێت.

o به رای تۆ کوشتنی کەسانی بێدەسەڵات و خەڵکی مەدەنی ڕەوایە؟ داعشیش خەڵکی مەدەنی و بێ دەسەڵات دەکوژێت.

• نەخێر، هەرگیز بەوجۆرە نییە. هەر کەس ئەم جۆرە پڕوپاگەندەیە دەکات درۆ دەکات.

o دواتر دێمەوە سەر ئەم باسە. بەڵام شتێکی گرنگ، هەڵەی میدیا ڕۆژئاواییەکان لە چیدایە؟ بە بۆچوونی تۆ درۆی ڕاستەقینە کامەیە؟

• هەر بۆ نموونە، هەواڵێك کە چەند ڕۆژ لەمەوبەر لە میدیاکانی ڕۆژئاوا پەخش بوو. دەڵێن داعش بڕیاری خەتەنەکردنی لەسەر ئافرەتان ئیجبار کردووە .

o بەڵام ئەم هەواڵە ڕاستەوخۆ بە درۆ خرایەوە. بەرپرسی مافی مرۆڤ شتێکی بە هەڵە وەرگێڕابوو یان ئەوەی باوەڕی بە پڕوپاگەندەیەك کردبوو. ئێستا بە توندیی ڕووبەڕووی ڕەخنە بۆتەوە .

• بەڵام کەمێك لەوەوپێش، شتێکی هاوشێوەی ئەم هەواڵەیان بڵاوکردەوە. گوایە لە موسڵ، بەزۆر ژنان لە سەربازەکانی داعش مارە دەکرێن. ئەوانە هەمووی قسەی پووچ و بێبنەما بوون. کۆمەڵێك میدیای دیکە بانگەشەیان بۆ ئەوە کرد کە گوایە تەواوی ئەو کەسانەی کە تووشی هەر جۆرە گوناهێك بوونە یان هەر کارێکی هەڵەیان کردووە، ئێمە هەموو ئەو کەسانەمان بە کافر لەقەڵەم داوە و دواجار کوشتومانن و هەموو ڕۆژێك بەم جۆرە دەگوزەرێت. تۆ دەتوانیت بێیتە ڕەققە و دڵنیابیت لەوەی کە هەموو ئەم شتانەی دەگوترێن دەربارەی ئێمە درۆی پوچ و بێ بنەمان. بەم پێوەرە بێت، ئێستا دەبوایە هەموو خەڵکی سووریامان کوشتبایە. چونکە هەموویان جگەرە دەکێشن، هەموویان تووشی یەك دنیا کاری ناشەرعیی دەبن، لەگەڵ ئەمەشدا هیچ کەسێك بەم هۆیەوە ناکوژرێت. بەدەر لەو کارانەی کە بەگوێرەی یاساکانی ئیسلام، بۆ ئەنجامدەرانی، سزای کوشتن دیاری کراوە.

o دەربارەی شیعەکان بۆچوونتان چۆنە؟

• لە دیدی ئیسلامەوە شیعەکان هەڵگەڕاوە و لەدین دەرچوون. دەرچوونیان لە ئیسلام بەمانای حوکمی کوشتنیانە.

o چەمکی هەستپێکراو چییە؟

• شیعەکان دوو ڕێگایان لە پێشدایە: یان ئەوەی پاشگەز دەبنەوە و بە ڕاستیی بۆ سەر ئیسلام دەگەڕێنەوە، یان ئەوەی دەکوژرێن.

o واتا ئەگەر ئەو ٨٠ ملیۆن شیعەیەی کە لە ئێران، سووریا و ئێراق هەن لە ڕێبازەکەیان پاشگەز نەبنەوە و بە ڕاستیی ئیسلام پەسەند نەکەن، هەموویان دەکوژرێن؟

• بەڵێ، زۆر ڕاستە، بێگومان بەو جۆرە دەبێت.

o 80ملیۆن کەس؟

• ئەگەر پێویست بکات، بەڵێ. (پێ دەکەنێت.) مەبەستم ئەوەیە کە چۆن بیڵێم، زۆر خۆش دەبێت....

o بە ڕاستی تۆ بە خۆشی دەزانی...

• داعش لە هەوڵی ئەوەدایە بەرانبەر شیعەکان سیاسەتێکی تر پەیڕەو بکات. ساڵی ٢٠٠٦، وەختێك داعش بۆ یەکەم جار دەستی بەسەر ناوچەکانی فەللوجە و ئەنباری ئێراقدا گرت، هەوڵی دا شیعەکان لەو ناوچانە دەربکات. بۆیە پێیان ڕاگەیاندرا کە شوێنێکی تر بۆ بەردەوامی ژیانیان هەڵبژێرن. بە دەستەواژەیەکیتر هەموویان دەرکران. بەڵام بەداخەوە ئەم سیاسەتە سەرکەوتوو نەبوو. چونکە ئەو کەسەی کە دەردەکرێت، هەمیشە لە ڕێگەی دەسەڵات و هێزەوە ململانێ بۆ گەڕانەوە دەکات و هەر بەم شێوەیەش دەرچوو.

o بە بۆچوونی تۆ ئەو شتانەی لەسەر ئێران، ئێراق و سووریا دەگوترێت، هەقیقەتی هەیە؟ پێت وا نییە کە بەشێکی ئەو قسەلۆکانە ساختە و درۆ بن؟

• تا ئەو جێگەی پەیوەندیی بە ئێرانەوە هەیە، سەبارەت بە بەرنامەی ئەتۆمی و ئەو شتانە ناتوانم هیچ بڵێم، بەڵام ئەو شتانەی کە پەیوەندیی هەیە بە زوڵم و ستەم دەرحەق بە موسڵمانان و دەرحەق بە ئەهلی سوننەت، هەرگیز درۆ و ساختەی تێدا نییە. بەداخەوە بە هەزاران و ملیۆنان خەڵك گەواهی دەدەن کە ئەم شتانە هەیە و ڕاستن.

o ڕاتان لەسەر حیزبوڵڵا، (حەسەن نەسروڵڵا) چییە؟

• هیچ، (پێ دەکەنێت.) دەی ئەویش شیعەیە.

o ڕاتان دەربارەی حەماس چییە؟

• دیسانەوە هیچ. حەماس هیچ جیاوازیی لەگەڵ حیزبوڵڵادا نییە، حیزبێکی دیموکراتە لەژێر عەبایەکی ئیسلامی دایە. ئەگەر ٢٠ تا ٣٠ساڵ بچینە دواوە، ڕەنگە حەماس بە شێوەیەکی تر ببینین، بەڵام لە ئەمڕۆدا چاوەڕوانی هیچیان لێ ناکرێت. ڕوونتر بیڵێم: براکانی ئێمە لە غەززە بەو شێوەیە زانیارییان بە ئێمە داوە: "حەماس بۆ ئێمە بە دوژمنێکی خراپتر لە ئیسرائیل هەژمار دەکرێت".

o پێشتر گوتت کە لە ئێستادا داعش نزیکەی ١٥٠٠٠ تا ٢٠٠٠٠ شەڕکەری هەیە، ئەمە ڕاستە؟

• بە مەزەندە، بەڵێ.

o جگە لە مەسیحیی و جوولەکەکان کە لە ئێستادا دەتانەوێ لەگەڵیاندا بگونجێن، ئایا لەگەڵ هەر کەسێك کە بە تەفسیرەکانی داعش بۆ ئیسلام ڕازیی نەبێت، بڕیاری جەنگ دەدەن؟ ئێوە ئامانجتان فەتح و ڕزگارکردنی هەموو دنیایە. هەموو دنیا ئاگادارە لەوەی کە هەڵسوکەوتی ئێوە بەرانبەر دوژمنەکانتان زۆر بێبەزەییانەیە. ئایا پێ ناچێت کە بەمزووانە تەواوی وڵاتە عەرەبییەکان بەم هۆیەوە ڕێککەوتن بکەن و دژ بە ئێوە یەکبگرن و بڵێن: ناتوانین لە بەرانبەر ئەم ٢٠٠٠٠ کەسەی کە دەیانەوێت هەموومان بکوژن تاقەت بێنین؟

• ئێمە گریمانەمان کردووە، کە ئەم شتە ڕوو بدات. بە دڵنیاییەوە ئەم شتە هەر ڕوو دەدات. هیچ لەم بابەتە ناترسین، هەندێك جار ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتانە کەمێك سەخت و دژوار دەبێت. ئەگەر پێش سێ مانگ لێرە پرسیارت لە هەر کەسێك بکردایە بەوەی: ئایا داعش دەتوانێت سەرکەوتنی بێ وێنەی هاوشێوەی ئەم سەرکەوتنانەی چەند مانگی پێشی لە ئێراق و سووریا بە دەست بێنێت؟ سەدا لەسەد هەموویان دەیانگوت:"نەخێر هەرگیز ناتوانێ!" بەڵام ئێمە باوەڕمان بە خوایە و پشتمان بەو زاتە بەستووە و هەر ئەو ڕێنوێنیکەری هەموو شتێکە، لەژێر ئەم ڕووناکییەدا باوەڕی تەواومان هەیە، کە لە کارەکانماندا سەرکەوتوو دەبین. تەنانەت ئەگەریش تەواوی دنیا لە دژی ئێمە یەکبگرێت! . مێژووش ئەم ڕاستییە پشتڕاست دەکاتەوە و ئەم هەقیقەتە دەسەلمێنێت. پێغەمبەریش دوژمنەکانی و ئەو هێزانەی هێرشیان دەکردە سەری لە خۆی پڕچەکتر و بەهێزتر بوون، بەڵام سەرەڕای ئەوە ئیسلام بەسەر ئەو دوژمنانەدا سەرکەوت. مێژووش دووبارە دەبێتەوە.

o بەڵام محەمەد پێشەوا و پێغەمبەری سۆزوبەزەیی بوو، لەبەرانبەر دوژمنەکانی زۆر لێبوردە بوو. لە کاتێکدا پێم وایە ئێوە هەرگیز لە بەرانبەر دوژمنەکانتان لێبوردەییتان نییە؟

• ئەمە ڕاست نییە، باشترین نموونەتان بۆ باس دەکەم، لە پاش گرتنی موسڵ ٤٥٠٠ سەربازی سوپای مالکی لەلایەن ئێمەوە بەدیل گیران، ١٧٠٠ کەسیان کوژران بەڵام ئەوانی تر ئازاد کران....

o بۆچی ١٧٠٠ شیعەتان کوشت؟ تەنها لەبەر ئەوەی شیعە بوون؟

• نەخێر، پەلە مەکەن، ئەوە شتێکیتر بوو. ئێمە زۆرجار ئەوانی تریشمان گوللەباران دەکرد. بڕیاری ئیسلام دەربارەی ئەم مرۆڤانە ڕوون و ئاشکرایە، ئەوان بە خواستی دەوڵەت لە دژی ئیسلام بەشەڕ هاتبوون، ئەمەش بە مانای گومڕابوون دێت. بەڵام چونکە سوننە بوون و سوێندیان خوارد، کە چیتر ئەم کارە دژی داعش نەکەن بڕیاری لێخۆشبوونمان بۆ هەموویان دەرکرد. هەرچەندە کاری کوشتنیان بەلای ئێمەوە کردەیەکی ئاسانتر بوو لە ڕزگارکردنیان. دواجار ئاشکرایە لێبوردەییەکەی پێغەمبەر تاکوو ئەمڕۆش بەردەوامە.

o تۆ ئەم کارە ناو دەنێی لێبوردەیی؟

• بەڵێ من بە لێبوردەیی دەزانم.

o ئێستاش لەگەڵ دایك و باوکت پەیوەندییت هەیە؟ خۆ دەتوانیت لە ڕێگەی سکایپەوە پەیوەندییان پێوە بکەیت؟

• هەندێك جار بەڵێ.

o ئەی دەربارەی ئەوەی کە ئێستا بووی بە شەڕکەرێکی بێبەزەیی، دایك و باوکت چی دەڵێن؟

• دایك و باوکم ئەوە دەزانن من بەبێ بەڵگە و بە ناڕەوا هیچ کەسێك ناکوژم.

o تا ئێستا مرۆڤت کوشتووە؟

• ناتوانم وەڵامی ئەم پرسیارەتان بدەمەوە. (پێدەکەنێت)، دووریش نییە کوشتبێم. (پێ دەکەنێت.)

o لارییت نییە ئەگەر بۆ جارێکیش بووە لەگەڵ دایك و باوکت قسە بکەم؟ یان لەگەڵیان چاوپێکەوتنێك ئەنجام بدەم؟ من لە زۆر بابەتدا لەگەڵ ئێوە هاوڕا نیم، بەڵام حەز دەکەم لەگەڵ دایك و باوکیشتدا گفتوگۆیەك بکەم.

• بەڵێ دەتوانیت.

o بواری قسەکردن لەگەڵ خەلیفەدا هەیە؟ دەتوانم لەگەڵ بەغدادی قسە بکەم؟

• نەخێر، بێگومان نەخێر.

o بەڵام هەر دەبێت ڕۆژێك بەغدادی چاوپێکەوتن و گفتوگۆیەك ئەنجام بدات.

• من لەگەڵ سەرەوەی خۆم لەم بارەیەوە قسەم کرد، بەڵام پێم وایە تاکوو ساڵێکی تر بارودۆخەکە بەم شێوەیە دەمێنێتەوە. خەلیفە بە هیچ شێوەیەك گفتوگۆ و چاوپێکەوتن لەگەڵ هیچ کەس ناکات. ڕەنگە ئەگەرێك بێتە پێشێ لە ڕێگەی گرتەیەکی ڤیدیۆیی یان شتێکی لەم شێوەیەوە دەربکەوێت .

o ئەوەی کە لە مزگەوتەکەدا بوو، بە ڕاستی خودی خەلیفە بوو؟

• بەڵێ، ئەوە خەلیفە بوو. تۆ دووەمین ڕۆژنامەنووسیت، کە ئێمە لەگەڵتا قسە دەکەین. یەکەمین کەس ڕۆژنامەنووسێکی ڤایس نیوز بوو. بەڵام تۆ یەکەمین ڕۆژنامەنووسی ڕۆژئاواییت. کارمەندەکەی ڤایس نیوز موسڵمان بوو.

**پاش دوو هەفتە لە ٢٠١٤/٩/٢١ دووبارە لەگەڵ ئەبوقەتادە دەستمان بە گفتوگۆکردن کردەوە:**

o هیچ کەس لەم دنیایە سەر دەرناهێنێت بۆچی داعش سەری مرۆڤە بێتاوانەکان لێ دەکاتەوە. بە ڕاستی مایەی شەرمەزارییە، چی بەهانە و بەڵگەیەکی بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە ئاشکرایەی هەیە؟ بۆچی ئەم مرۆڤانە لە ئاپۆڕای جەماوەر و بە پێش چاوی دنیاوە دەکوژێت؟ ئێوە بێئەندازە بێبەزەیی و دڵڕەقن. تەنانەت دڵڕەقتر و بێبەزەییتر لە ڕێکخراوی قاعیدە. چیت هەیە بۆ وتن لەم بارەیەوە؟ هەرچەندە گفتوگۆکردن سەبارەت بەم مەسەلەیە بێسوود و بێ ئەنجامە.

• ئێستا دەربارەی ئەمریکییەکان یاخود دەربارەی بەریتانییەکان قسە دەکەیت، یان مەبەستت لە سەربازەکانی ئەسەدە؟

o لە ڕاستیدا دەربارەی هەموویان، بەڵام لە سەرەتادا دەربارەی دوو ئەمریکییەکە دەپرسم.

• پێ دەچێت گرتە ڤیدیۆییەکانت دیتبێ. دواجار ئەوەی ڕوویدا بڕیاری ئێمە نەبوو. وڵاتانی ئەو سەربڕاوانە زیاد لە یەک جار دەرفەتی ڕزگارکردنی هاووڵاتییەکانی خۆیانیان هەبوو، بەڵام ئەوان بە ئەنقەست ئەم دەرفەتەیان پشتگوێ خست.

o تۆ گوتت ڕێنوێنیکەری ئێوە بریتییە لە قورئان، چەندین جار و پێشتریش پێم گوتن من باوەڕم وایە قورئان بەخشندەیە. لە کوێی قورئاندا هاتووە، کە کوشتنی مرۆڤی بێتاوان ڕەوایە؟ مرۆڤی بێتاوان دەڵێم. بۆ نموونە (جیمز فولی) تەنها ڕۆژنامەنووسێك

بوو. ئەو هیچ دژایەتییەکی ئێوەی نەکردبوو. بە هیچ جۆرێک هیچ یەکێك لەو دوو ڕۆژنامەنووسە دوژمن و بەرهەڵستکاری ئێوە نەبوون.

- تۆ باشتر لە من دەزانی کە لە بنەڕەتدا میدیاکان و ڕۆژنامەنووسەکان زۆر لە سەربازەکانی ڕووی زەوی مەترسیدارترن .

o هۆکاری سەرەکی ڕازیبوونی ئەمڕۆی خەڵکی جیهان لەمەڕ بۆردومانەکانی ئەمریکا بۆ سەر داعش، دەگەڕێتەوە بۆ کوشتن و و سەربڕینی خەڵکی بێتاوان لەلایەن ئێوەوە و لە پێش چاوی هەموو جیهاندا. دەزانم لە جەنگدا خەڵکانێکی بێتاوانی زۆر دەکوژرێن، بەڵام ئەو کوشتنانە بە ئەنقەست نییە. لە کاتێکدا ئێوە خەڵکی بێتاوان بە ئەنقەست و بە ئاگاییەوە دەکوژن، ئەم کارانەی ئێوە ڕای گشتیی خەڵکی بە تەواویی گۆڕیوە و هیچ کەسێك پێی ڕازیی نییە .

- ڕەنگە بەو جۆرە بێت، بەڵام ئێمە لە هێرشە ئاسمانییەکانی ئەمریکا ناترسین. هێرش ئەمڕۆ بێت یاخود سبەی هەر ئەنجامی دەدەن. ئەگەر ئەوان بەدوای ئێمەدا نەیەن، ئەوە ئێمە بەدوای ئەواندا دەچین. ئەو کاتە بینەری پێکدادانەکە دەبن. ئەگەر بە وردیی تەماشای شتەکان بکەین، دەبینین ئەمریکییەکان و هاوپەیمانەکانیان هیچ بەرنامە و سراتیژیی و بیرۆکەیەکیان بۆ ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ داعش نییە. ئەوەی کە ئەمڕۆ ڕوو دەدات، لە بنەڕەتدا دەرئەنجامی شەڕی ئەمریکییەکانە دژ بە ئێراق، کە لە ساڵی ٢٠٠٣ ڕوویدا. براوەی شەڕەکە ئەمریکا نەبوو، ئەوان بە ئاشکرا لە جەنگی ئێراق شکستیان خوارد. ئەو دەوڵەتە شیعەیەش کە پاش خۆیان بەجێیان هێشت، خۆڕاگر و جێگیر نەبوو. وڵاتێکی پڕ لە وێرانە بوو. بەهەرحاڵ هێشتا ڕوون نییە ئەو سەربڕینانەی کە تۆ ڕەخنەی لێ دەگریت باشن یان کوشتن بە دەمانچە. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەنجامدانی ئەم کارە هاندەر و وروژێنەرانەیە بە ئەنقەست بووە. مەبەستی ئێمە لە سەربڕینەکان پیشاندانی ئەو جۆرە کردەوانەیە دەرحەق بە ئەمریکییەکان .

o تەواوی دنیا دەپرسن بۆچی خەڵکی بێگوناهـ سەردەبڕن؟ قورئان ڕێگەی ئەم کارەی نەداوە و تاوانی کوشتنی منداڵەکان چییە؟ چونکە منداڵیش کوژراوە.

• یەکەم جار دەبێ ئەوە بسەلمێنرێت کە ئێمە منداڵمان کوشتووە.

o وێنەی کیژۆڵەیەکم بە سەربڕاوی بینیوە.

• ئەم وێنانە ئێزیدی و کوردەکان دروستی دەکەن. کاری پڕوپاگەندەی ئەوان زۆرباشە. ئەم وێنانە ساختەن. داعشیش هەرگیز و هیچ کات وێنەی لەم شێوەیەی منداڵان بڵاوناکاتەوە.

o دیسانەوە دێمە سەر باسی ڕۆژنامەنووسەکان. من جێمز فولیم بەچاکی دەناسی، چونکە لە لیبیا پێکەوە بووین، ئەو کاتەی شۆرششی لیبیا سەریهەڵدا، ڕۆژانێکی زۆر پێکەوە لە هوتێلێکدا بووین. بۆچی داعش وا دەزانێت کە کوشتنی ڕۆژنامەنووسان هێندە ئاسانە؟

• ئەم بابەتە دەبێ بە گشتی بەدواداچوونی بۆ بکەیت. ئەوانە تەنها ڕۆژنامەنووس نەبوون، بەڵکوو کەسانێك بوون کە پێشتر لە ئێراق دژی دوڵەتی ئیسلامی ڕاپۆرتیان نووسیبوو. کەسی دووەم، ئستیڤن ساتلوڤ، لە سوپاشدا چەند ساڵێك خزمەتی کردبوو، سێیەمیش هەر بەو جۆرە بوو. ئەسڵەن ئەوان ڕۆژنامەنووسێلێك بوون کە دەستیان بە خوێن پیس بوو.

o نووسین دژی داعش، بەگوێرەی ئەم قسەیە بێت منیش نووسینم دژی داعش هەیە و ماوەیەك پێش ئێستا بوو کە ئەندامانی ڕێکخراوێکی مەدەنیتان[٢٦] کوشت؟ هەرچەندە تووشی شۆکت کردم، بەڵام لۆمەتان ناکەم. چونکە هەر وەك پێشتر گوتم بەم کردەوانە ڕای گشتییان گۆڕیوە.

---

26- NGO

•ڕای گشتیی بۆ خۆی دەتوانێ هەر شتێك هەڵبژێرێت. لە ڕاستیدا ئێمە هیچ بەلامانەوە گرنگ نییە. هەڵبەتە تۆ باشتر لەوانیتر دەزانیت کە ئەمریکییەکان لە ئاکامی پەسەندکردنی یاساکانی خۆیان بۆ دەستپێکردنی شەڕ، تەنها لە ئێراق زیاد لە یەك ملیۆن منداڵیان کوشتووە. منداڵەیلێکی بێگوناح . بۆ کەس ئاوڕی لەم بابەتە نەدایەوە. کەچی لە ئێستادا لە پێناوی چەند کەسی ئیزیدی و سێ ڕۆژنامەنووس کە وڵاتەکانیان دەیانتوانی ئازادیان بکەن، هەموو دنیا خرۆشاوە و هەموو شتەکان بە میدیایی دەکرێن.

ئێمە ڕۆژنامەنووسی تریشمان دەستگیر کردووە کە بە یارمەتیی وڵاتەکانیان ڕزگارکراون، لەوانە فەرەنسییەکان ئازادی هاوڵاتییەکانی خۆیان کڕییەوە، نازانم تۆ ئاگاداربوویت یان نا کە ئێمە ڕۆژنامەنووسێکی ئەڵمانیشمان لا دیل بوو، بەڵام ئەوەیان بنەماڵەکەی ئازادیان کرد، چونکە دەوڵەتی ئەڵمانیا گرنگی نەدا بە ئازادکردنی ئەو ڕۆژنامەنووسە. بنەماڵەکەی بە بڕی یەك ملیۆن یۆرۆ ئازادیان کرد. ئەم ڕۆژنامەنووسە بیانیانە و سێ زیندانییەکەیتر کە سەربڕان پێکەوەبوون. ئۆباما گوتویەتی بۆ پاراستنی کارمەندانی ئەمریکایی لە هەولێر یەکەمین هێرشی ئاسمانی ئەنجام داوە، ئێمە بواری ڕزگارکردنی هاووڵاتییە بەندکراوە ئەمریکییەکانمان بە ئۆباما دا، بەڵام ئەو لەسەر بنەمای ئەوەی کە «لەگەڵ تیرۆریست گفتوگۆ ناکەین، هیچ گرنگییەکی بە قسەکەی ئێمە نەدا و پشتگوێی خست.

o بۆچی لە سەربڕینەکاندا گرتەی ڤیدیۆییتان تۆمار کرد؟

• بۆ ئەوەی هەموو جیهان چاوی لێ بکات. دەزانی ئەمانە پێش ئەوەی سەریان بڕین چییان گوت؟ دەزانی بەریتانییەکە کە ناویم بیرچووەتەوە، چی گوت؟ گوتی:"دەیڤید کامیرۆن، من تۆ بە تاوانبار دەزانم، تۆ بەرپرسیاری لە مەرگی من." بۆچی؟ چونکە سەرۆکوەزیری ئەو وڵاتە دەیتوانی ئەو ئازاد بکات. بۆ دەوڵەتی بەریتانیا وتووێژکردن لەگەڵ وڵاتێکی تردا کارێکی ئاسانە. هەروەها بە ئەمریکییەکانمان ڕاگەیاند، کە ئێمە داوای ئازادکردنی عافیە سدیقی[٢٧] دەکەین، ژنێك لە بەرانبەر پیاوێکی زیندانی ئێوە. بەڵام ئەوان ڕازیی نەبوون.

---

27- Aafia Siddiqui

- ئایا ئەو کەسانەی لە پێش چاوی خەڵك و ئاپۆڕای خەڵك سەرتان بڕین، بێهۆش بوون؟ یاخود شتێکیان دەرخوارد درابوو؟
   - نا هەرگیز بەو شێوەیە نییە.

- ئەی بۆچی لەکاتی سەربڕیندا هیچ جووڵە و پەرچەکردارێکیان نەبوو؟
   - چونکە مردنیان پەسەند کردبوو. هەموو مرۆڤێك لە دوا چرکەساتەکانی ژیانیدا دەزانێت بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە.
- لە هەولێر لە پێشمەرگە کوردەکانم بیستووە کە دیلی داعشیان هەیە. لەوانم پرسی:"ئایا ئامادەن دیل ئاڵوگۆڕ بکەن؟ چونکە ژنان و پیاوانی کوردیش لای داعش دیلکراون، ئەگەر خوازیاری ئاڵوگۆڕکردنی دیلەکانن بە من بڵێن، من پڕ بە دڵ هاوکاریتان دەکەم تا ئەو کاتەی دیلەکان ئازاد دەکرێن."
- کەمێك پێش ئێستا پرسیارم لە تۆ کرد، ئایا لە ئەڵمانیاش کاروچالاکیی تیرۆریستیی ئەنجام دەدەن، وەڵامتان بە نەخێر بوو، لە ئێستادا، کە ئەڵمانیا چەکی بۆ کوردەکان هەناردووە ئایا ئەم بابەتە ستراتیژی داعشی نەگۆڕیوە؟
   - من ناتوانم وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە. چونکە لە چوارچێوەی دەسەڵاتی مندا نییە .

- دەتوانی سەبارەت بەم مەسەلەیە زانیاریی زیاتر بەدەست بێنیت؟
   - کاتێك وڵاتێکی وەکوو ئەڵمانیا بە شێوەیەکی چالاك بەشداریی ئەم پەلامارانە دەکات، نەوەك پێشتر سست، بەڵکوو ڕاستەوخۆ چەك و تەقەمەنیی و ڕاهێنەری سەربازیی هەناردەی ئێراق دەکات، یاخود ئەوەی کە کوردەکان دەباتە ئەڵمانیا بۆ ڕاهێنان، دەی کەواتە جێگای سەرسوڕمان نییە ئەگەر ئێمەش سیاسەتی خۆمان بەرانبەر ئەڵمانیا بگۆڕین.

---

یەکێکە لەو پاکستانیانەی کە بە تیرۆر تاوانبار کراوە و لە ئەمریکا بڕیاری ٨٦ ساڵ زیندانیی بۆ دەرکراوە.

- ئەڵمانیا بە توندی لەژێر فشاردا بوو. ئێوە ئاگاتان لەمەیە؟

- هەرگیز. مرۆڤ پێویستە بوێر بێت لەوەی کە بڵێت نەخێر. دەبێت بە ڕوونی بڵێت نەخێر. ئەڵمانیا خۆی بە شێوەیەکی بەرچاو کێشە و سەرێشەی هەیە، لە ڕاستیدا دەبووایە سیاسەتمەدارەکان لە جێگای دەستێوەردان لە کۆمەڵێك کێشە کە پەیوەندیی بە ئەوانەوە نییە، لە بیری چارەسەرکردنی کێشەکانی خۆیاندا بن، هەربۆیە ئەگەر ئەڵمانییەکان خوازیاری ئەوەن ڕۆڵی هاوپەیمانیی ببینن، دەی دواتر هەر دەبێت ئەو چێشتە بخۆن، کە خۆیان لێیان ناوە .

- باشە، بەڵام ئەڵمانییەکان بەشداریی بۆردومانکردنیان نەکرد؟

- ئەمەش بەهۆی لێهاتویی و زیرەکی ئشتانمایەرەوە بوو.

- هەروەها سیاسەتی مێرکڵیش؟

- خەڵکی دەبێت سەبارەت بە مەسەلەکانی تایبەت بە داعش زیاتر بە گوێی قسەکانی ئشتانمایەر بکەن، تەنانەت لە بابەتەکانی تری تایبەت بە سیاسەتی گشتی ئەڵمانیاش، هەر دەبێت گوێ لە ئشتانمایەر بگرن، ئەگەریش بۆ ئێمە هیچ سوودێکی نەبێت.

- باشە ئەو دەربارەی داعش چی گوتووە؟

- ئەوەی کە وەستاندنی ئێمە کارێکی سەخت و دژوارە. تۆ لە منت پرسی: "یانی داعش دەیەوێت لەگەڵ تەواوی دنیادا شەڕ بکات؟" منیش پشتڕاستم کردەوە و گوتم بەڵێ. ئەمریکییەکان ساڵی ٢٠٠٣ هاتنە نێو ئێراقەوە و ساڵی ٢٠١١ بە شکست و ملیاران دۆلار زیان و هەزاران سەربازی کوژراوەوە بە ناچاریی ئێراقیان بەجێ هێشت. بۆ ئەوەی لە چرکەساتەکانی دواییدا کەمێك ئابڕووچوونی خۆیان بپارێزن. ئەو دەمە دەوڵەتی ئیسلامی لە ٥٠٠٠ کەس پێکهاتبوو، کەمتازۆر شەڕی پارتیزانییان دەکرد و هیچ جۆرە تانك و تۆپخانەیەکی قورسیان بەدەستەوە نەبوو. بەگوێرەی دوایین ڕاپۆرتەکانی(سی،

ئای، ئەی) ئێستا ٣٥٠٠٠ کەسین و زیاتر لە ١٠٠ تانك، فڕۆکە و تۆپخانەی قورسمان هەیە. هەر بەڕاست ئەمریکییەکان وا بیردەکەنەوە دەتوانن شکست بە ئێمە بهێنن؟

o ئەو ژمارانەی کە (سی، ئای، ئەی) بڵاوی کردۆتەوە ڕاستن؟

• سەختە بتوانرێ بگوترێ ڕاستن یاخود نا. بەڵام من دەتوانم ئەم ژمارانەتان پێ بڵێم، ڕۆژانە ٥٠ کەس لەو ناوچانەوە، کە ڕووسیی زمانن دێنە نێو ڕیزەکانمانەوە، هەروەها دەنگۆی ئەوە هەیە، کە لەم مانگانەی دواییدا زیاد لە ٦٠٠٠ شەڕکەری تازە بۆ نێو ڕیزەکان هاتوون. لە دوای گرتنی موسڵ ژمارەی شەڕکەرەکانمان لە ئێراق دە هێندە زیادی کردووە. تەواوی سوپا ڕۆژئاواییەکانیش ئاواتەخوازی پێشوازیی لەم شێوەیەن. یەکێك لە فەرماندەکانی پەیەدەش، کە لە ئێستادا لە سنووری تورکیا لەگەڵیان لە شەڕدان، ئەم هەواڵانەی پشتڕاست کردۆتەوە. ئەو گوتوویەتی، نزیکەی ٢٠ساڵ ئەزموونی شەڕکردنی هەیە، لە بەرانبەر تورکیا خەباتی کردووە، ڕووبەڕووی کۆپتەرەکان و فڕۆکەکان و هەر شتێکی تر، بەڵام تاوەکوو ئێستا شەڕکەری هاوشێوەی سەربازەکانی داعشی نەبینیوە. بە گوتەی ئەو، کاتێك ئەوان ترۆمبێلەکانیان دەتەقاندەوە بەدوای ئەوەدا دە ئۆتۆمبیلی تریش بەیەکتریاندا دەکێشا. ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت، کە پیاوەکانی ئێمە ئاواتەخوازن گیانیان لە پێناوی دەوڵەتی ئیسلامیدا بەخت بکەن. مێژوو هەمیشە خۆی دووبارە دەکاتەوە. وەستاندنی سوپایەك کە ئامادەیە خۆی بەخت بکات، زۆر سەخت و دژوارە .

o لە نێوان جیهادییە ئەڵمانییەکان و سەربازەکانی داعش، کەسانێك هەن، کە پێشتر ئەندامی سوپای ئەڵمانیا بووبێتن؟

• بێگومان بەڵێ! من وای دادەنێم، کە زۆرێك لەوان پێشتر ئەندامی سوپای ئەڵمانیا بووبێتن. بە تایبەت ئەو کەسانەی کە ئایینی خۆیان گۆڕیوە، وەکوو (ڕابرت بی) کە ئەویش لە سوپای ئەڵمانیادا خزمەتی کردووە و دواتر پەیوەندیی بە داعشەوە کردووە .

o لە هەندێك لە ڕۆژنامەکاندا نووسراوە ئەو کەسانەی کە ئەندامی سوپا نەبوون و هیچ ئەزموونێکیتری شەڕکردنیشیان نییە، وەکوو قوربانییەك بۆ هێرشە خۆکوژییەکان هەڵدەبژێردرێن. چونکە شەڕکردن نازانن.

• درۆیەکی بێ بنەمایە، پیاوەکانی ئێمە بۆ ئەنجامدانی هێرشی خۆکوژیی بە ویست و ئارەزووی خۆیان ئەو کارە دەکەن و بڕیاری ئەو کارە دەدەن. هیچ بڕیارێك لەسەرەوە نییە بۆ ئەوەی کەسێك هەڵبژێرێت بۆ ئەوەی ئەو چالاکییە ئەنجام بدات یاخود بە پێچەوانەوە. ئەگەر بەو جۆرە بووایە کە تۆ دەیڵێی، ئەوە دیسانەوە دەبووین بە بنێشتەخۆشەی دەم میدیا ڕۆژئاواییەکان. ئەوان ئەم جۆرە ڕاپۆرتانە بە مەبەستی ڕێگریکردن لە گەنجەکان بڵاودەکەنەوە، بۆ ئەوەی ڕوو لە ریزەکانی داعش نەکەن.

o جاری پێشووتر گوتت کە وێنە کاریکاتێرییەکانی(ڤسترگارد)لەسەر پێغەمبەری ئیسلام کوفر بوون، کەچی ڤسترگارد لەبەر ئەم کارەی لەلایەن (مێرکل)ـەوە خەڵات کراوە، سا بەهۆی ئەم کارەوە بڕیاری کوشتنیان دەرکراوە. ئایا مەبەستتان لە کوشتن، کوشتنی ڤسترگاردە یاخود مێرکل؟

• بۆ هەردووکیان.

o پێشتر سەبارەت بە دڵڕەقی و بێبەزەیی بوون گفتوگۆمان کرد. من گوتم کە بێرەحمی داعش لە چەند گرتەیەکی ڤیدیۆشدا دەردەکەوێت بە تەواویی بیروبۆچوونی خەڵکی ئەڵمانیای سەبارەت بە داعش گۆڕیوە. من هەمیشە لە ڕۆژنامەکاندا دەنووسم و بۆردومانەکان بە کردەیەکی چەوت ناو دەبەم. هەرچەندە تۆ دەزانیت، کە من لەگەڵ داعشیشدا هاوڕا نیم، بەڵام لە ڕاستیدا گرتە ڤیدیۆییەکان و هەڵوێستە بێ ڕەحمانەکانتان هیچ پاساوێك بۆ گوتن ناهێڵنەوە. ئایا منداڵەکان لەبەر کافربوون کوژران و سەریان لێ کرایەوە. گرتە ڤیدۆییەکانتان بە ئاشکرا ئەوە پیشان دەدەن کە ناتوانرێ بگوترێ هەموو شتێك پڕوپاگەندەی میدیاکانی ڕۆژئاوایە، هەڵبەت دەرئەنجامی کردەوە بێبەزەییەکانی خۆتانە لەنێو ئەو ڤیدیۆیانەدا.

- مەبەستتان لەم قسانە چییە؟
    - مەبەستەم لەوەیە کە تۆ لێرەدا دەتەوێ وا پیشان بدەیت کە ئێوە کەسانێکی بێڕەحم نین، وەك بڵێی زۆرێك لە کارە قێزەونەکان کاری ئێوە نەبوون!
- بێڕەحمیی شتێکی ڕێژەییە. تۆمارکردنی ئەو گرتە ڤیدیۆییانەش بۆ ئەوەیە دەمانەوێت بێڕەحمانەترین بەشی بە بینەران پیشان بدەین، ئەگەر دەربڕینەکەم دروست بێت، بەڵام سەبارەت بە گرتەڤیدیۆییەکانی تر، وەك ئەوەی کە ئۆتۆمبیلێك بە تەنیشتی ئۆتۆمبیلەکانی تردا تێ دەپەڕێت و تەقەیان لێ دەکات، لەوێدا سوپای مالکی کراوەتە ئامانج نەك خەڵکی بێتاوان.

    - بەڵام ژمارەیەك منداڵیش لەبەر کافربوون کوژران. چەند وێنەیەك بڵاوکراونەتەوە کە تێیدا چەند کیژۆڵەیەکی بچووك بەسەری براوەوە دەردەکەون، دەبێت دیسانەوە ئەوە بپرسم: تۆ چۆن کاری لەم جۆرە لەگەڵ قورئاندا وێك دەخەیت؟
- زۆر گومان هەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم وێنانە ڕاست بن و ئێمە کاری بەربەرێتیی لەو شێوەمان ئەنجام دابێت. لەسەر بڵاوکردنەوەی ڤیدیۆکان لە گۆگڵ خزمەتگوزارییەك هەیە، کە نازانم تۆ شارەزاییت لەسەری هەیە یاخود نا، لەوێدا دەتوانی وێنەیەك ئاپلۆد بکەیت و گۆگڵ لەسەر بنەمای زانیارییەکانی وێنەکە، وێنەکە ئاپلۆد دەکات. لەکاتێکدا دەبێ زانیاریی ئەم وێنەیە لەگەڵ تەواوی وێنەکانیتری ماڵپەڕی گۆگڵ وەك یەك بێت، لەوێدا دەتوانی تەماشای سەرچاوەی سەرەکی وێنەکە بکەیت، هەروەها دەتوانی تێبینی ئەوە بکەی کە چ کەسێك بۆ یەکەمین جار وێنەکەی ئاپلۆد کردووە. خەڵکانێکی زۆر ئەم کارەیان تاقی کردۆتەوە و دواتر بۆیان ئاشکرا بووە کە سەرچاوەی سەرەکی ئەم وێنانە بۆ شەڕی غەزە، ئێراق و ئەسەد و ئەوانیتر دەگەڕێتەوە. بە کورتی مەبەستم لەوەیە کە ئەو وێنانە کۆنن و لە ئێستادا بە هەڵە دەخرێنە ئەستۆی ئێمە.

چەند وێنەیەك کە لە لایەن کوردەکانەوە بڵاوکراوەتەوە، بینەر وەختێك تەماشای دەکات وا تێدەگات کە داعش دەستدرێژیی دەکاتە سەر ئافرەتە کوردەکان، بەڵام دواتر

دەرکەوت، کە ئەم وێنانە لە فیلمەکانی بالیودی هیندیدا گیراون و لە ئێستادا بە ئەنقەست ئەم وێنانە دەخرێنە ئەستۆی ئێمە. ئەمە درۆیەکی ڕوون و ئاشکرایە کە بێگومان ئەو کەسانەی بە درۆ بەناوبانگن جگە لە کاری لەم شێوەیە شتێکی تریان لێ چاوەڕوان ناکرێت. سەرم سووڕ دەمێنێ لەوەی کە تۆ فریووی ئەم درۆ و پڕوپاگەندە بێبنەمایانە دەخۆیت.

o بەڵام خۆ وێنەی سەربڕینەکانی شاری ڕەققە ڕاست بوون.

• بێگومان ڕاست بوون، من نکۆڵی لەوانە ناکەم، کاتێك بابەتی سەربازان یاخود گرووپە بەرهەڵستکارەکانی وەك بەرەی بەناو ئیسلامی دێتە پێشەوە، بەهەرحاڵ دوور نییە کە ئێمەش کاری وا ئەنجام بدەین، پاشان ئەو کردەوانە بە دڵنیاییەوە لە ئەستۆی دەگرین و ئەو ڕاستییە قبوڵ دەکەین.

o بەڵام بۆچی سەریان لێ دەکەنەوە و لەپێش خەڵکیش دایدەنێن؟ وەختێك دوژمن کوژراوە چ پێویست دەکات پارچەپارچە بکرێت و بە پیشاندانی خاوەنەکەی سووك و ڕیسوا بکرێت.

• باشە هەندێك جار دوژمن بەم شێوەیە کوژراوە و سزاکەی بەم جۆرە بووە. دەتوانم نمونەیەکت بۆ بهێنمەوە، نزیکەی سێ مانگ لەمەوبەر ترۆمبێلێکی بۆمبڕێژکراو لە پێش هوتێلێك لە شاری ڕەققە تەقێنرایەوە، موسڵمانان لەو شوێنە نیشتەجێ بوون، سێ بۆ چوار ژن و منداڵ بە سەختی برینداربوون و چوار بۆ پێنج کەسیش گیانیان سپارد، ئێمە پاش ئەوە پێنج تاوانبارمان دەستگیرکرد، بۆ ئەوەی ببێتە وانەیەك بۆ ئەوانی دیکە، ئەم چەند کەسەمان سەربڕی و لەناومان بردن.

o جارێکیتر دەپرسمەوە: ئایا لەبەر کافربوون کەس دەکوژرێت؟ ئایا منداڵان و مێردمنداڵانیش بەهۆی کافربوونەوە دەکوژرێن؟

• ئەگەر تەمەنیان پێگەشتبێت و ئەقڵیان لە جێگای خۆی بێت و کردەوەیەکی کفریان کردبێت، بەڵێ بێگومان دەکوژرێن. هەربۆیە هیچ کامیان لەبەر ئەوەی ١٦،١٧ یا

تەنانەت ١٥ ساڵانن لە مردن ڕزگاریان نابێت، بەڵام من بۆ خۆم هیچ نمونەیەکی لەم شێوەیەم نەدیتوە، کە کەسێکی مێردمنداڵ بەهۆی کافربوونەوە کوژرابێت.

o ئێستا من دیسان بۆ سێیەمین جار قورئان دەخوێنمەوە، پێشتریش گوتبووم کە قورئان زۆر لە ئێوە میهرەبانتر و بەخشندەترە. ١١٣ سوورەت لە ١١٤ سوورەتەکەی قورئان بە چەند چەمکێك دەست پێ دەکەن کە ئێوەش دەیزانن: (بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان!) ڕۆحی قورئان بە گشتی زۆر لە ئێوە جیاوازتر و میهرەبانتر و لێبوردەترە. هەر بۆیە دید و تێڕوانینی خەڵك بۆ داعش تا دێت ڕەشبینتر و خراپتر دەبێت. تەنانەت خراپتر لەو تێڕوانینانەی کە پێشتر بۆ قاعیدەیان هەبوو .

• دید و هەڵوێستی ڕۆژئاواییەکان بۆ ئیسلام هەمیشە خراپ بووە، چونکە هەڵوێستی ئەوانمان بۆ مەسەلەکانی بۆسنە و ئێراق و چیچان و ئەفغانستان تاقی کردەوە، هەڵوێستەکانیان ئەو ڕاستییە پشتڕاست دەکەنەوە، بێگومان ئێستاش هەر بەو شێوەیە دەبێت و بەردەوامیش دەبێت.

o لەم نێوەندەدا ڕۆژئاواییەکان بەراورد بە داعش، بەرەی نوسرە بە گروپێکی میانڕەوتر لەقەڵەم دەدەن؟

• (پێ دەکەنێت.) نامەوێت لەم بارەیەوە هیچ بڵێم، بۆ ئەوەی گفتۆگۆکە زیاتر سیاسیی نەبێت. بەڵام ئەگەر سەیری سیاسەتی بەرەی نوسرە و گرووپەکانی هاوشێوەی لە سووریا بکەیت، هەر زوو پەی بەوە دەبەیت ئەو گرووپانە بە هیچ جۆرێك ئیسلامیی نین. ئەم مەسەلەیە بەرەی نوسرەش دەگرێتەوە، تەنانەت ئەگەریش خۆیان بدەنە پاڵ ڕێکخراوی قاعیدەش، هەروەها زۆریش لە دیموکراتخواز و سیکۆلاریستەکانەوە دوورنین.

o داعش و ڕێکخراوی قاعیدە چی جیاوازییەکیان هەیە؟

• داعش بەرەی نوسرەی ڕەوانەی سووریا کرد، بۆ ئەوەی لە جەنگی دژ بە ئەسەد پشتیوان و هاوکاریی موسڵمانان بێت، بەڵام ئەوان هەر زوو ئاڕاستەی ئیشوکاری خۆیان

گوڕی و ڕووی ڕاستەقینەی خۆیان دەرخست و خیانەتیان لە داعش کرد و بێ پرسی ئێمە و دوور لە چاوی ئێمە لەگەڵ ڕێکخراوی قاعیدەی ئەفغانستان پەیمانیان بەست، تەنانەت چەند هاوپەیمانێتییەکی سەیروسەمەرەی تریان لەگەڵ گروپەکانی تر مۆرکرد، بۆ نموونە هاوپەیمانی لەگەڵ سوپای ئازاد و هەندێك لە گروپەکانی دێرزوردا مۆرکرد، کە ئەندامی ئەنجومەنی نیشتیمانیی سووریا بوون.

o به بۆچوونی تۆ ئوسامه بن لادن و ئەبوبەکر بەغدادی خەلیفەی ئێوەن، لە ڕووی ئایدیۆلۆژیاوه چی جیاوازییەکی سەرەکییان لەگەڵ یەکتردا هەیە؟

• ڕێکخراوی قاعیدەی سەردەمی ئوسامه بن لادن زۆر لە ئێمەوە نزیکتر بوو بەراورد بە قاعیدەی ئێستا، بەڵام نابێت ئەوەش لەیاد بکەین، کە بن لادن هیچ کاتێك دەسەڵاتێکی سیاسی و سەربازیی هاوشێوەی دەسەڵاتەکانی ئەمڕۆی بەغدادی نەبووە، هەر بۆیە جیاوازییکردن لە نێوان ئەم دوو کەسایەتییەدا کارێکی سەخت و دژوارە.

o بەڵام ئایا ئایدیۆلۆژیاکانیان لەیەك دەچن.

• ئایدیۆلۆژیاکان هاوشێوەن. لێرەدا دەبێت ئەوەش بگوترێ، کە وەکوو چۆن لەو سەردەمە و لەدەیەی هەشتا و نەوەدەکان ئەمە شتێکی باو بووە، ئوسامه بن لادنیش بەهەمان شێوە بە سەختی لەژێر کاریگەریی بیروبۆچوونی ئیخوان موسلمیندا بووە.

o ئەگەر بتەوێ ئیسلامەکەی خۆتان لە دوو دێڕدا وەسف بکەیت چی دەڵێی؟

• ئیسلامی ئێمە ئیسلامی ڕاستەقینەیە، پوخت و پاڵفتەیە لە هەر ئایدیۆلۆژیایەکیتر، چی دیموکراسیی یا سیکۆلاریزم یا بوودایزم یاخود مەسیحییەت بێت.

o کەواتە لەگەڵ بیروبۆچوونی وەهابیدا قابیلی بەراوردکردنە؟

• نابێت ناوی لێ بنێین وەهابییەت، چونکە ئەم جۆرە باوەڕانە لە پێش محەمەد کوڕی عەبدولوەهابیشەوە هەر هەبوونە، ئەو لە سەدەی ١٧ یان باشتر بڵێم لە سەدەی

١٨ ژیـاوه. لـه هـەموو سـەردەمێکدا کەسـانێك هـەر هـەبوون پـەیڕەویان لـە ئیسـلامی ڕاستەقینە کردبێت، بەڵام ڕێژەی ئەو جۆرە کەسانە زۆر کەم و دیاریکراو بووە.

o بەگوێرەی بیروڕای داعش، دەبێت چەمکە قورئانییـەکان دەقـاودەق وەربگیرێـن یان بنەما فیکرییەکانی قورئان لە پێوەندییە مێژووییەکان جیا بکەینەوە؟

• کۆمەڵە چەمکێك لە قورئاندا هەن تەنها لە ڕوانگەی مێژووییـەوە دەتـوانین لێیـان تێبگەین، بەڵام وەڵامەکانی قورئان دەبێت بەبێ هیچ ڕاڤەیەك دەقاودەق وەربگیرێن، ئەم شێوازە تێگەشتنە بۆ قورئان، بەشێکی گرنگە لە ئیسلام. ئەو خەڵکەی ئەمڕۆ گومڕابـوون و لەنێو ئایـدیۆلۆژیا جۆراوجۆرەکانـدا خۆیـان ونکـردووە، بـە زۆریـی ئـەو کەسـانەن، کـە قورئان وەکوو خۆی بە شێوەی دەقاودەق تەفسیر ناکـەن، بـەڵکوو هاوشـێوەی یۆنانییـە کۆنەکان خەریکن فەلسەفەی لێ دەردێنن.

o ئێستا لە ڕووی سوپا و سەربازییەوە چ وڵاتێك بەهێزترین دوژمنی ئێوەیە؟

• ئەو وڵاتانەی کە هێزی ئاسمانیان هەیە، چی ئەسەد بـێ یـاخود ئەمریکاییـەکان. بەڵام لەڕووی هێزی زەمینییەوە ئەم مەسەلەیە جیاوازە. ئەمریکییەکان و فەڕەنسییەکان و ئەڵمانییەکان و ئوسترالییەکان و وڵاتـەکانیتر، هێـزی زەمینیـی ڕەوانـەی ئـەم ناوچـەیە ناکەن، بۆچی؟ چونکە باش دەزانن کـە هـیچ شانسـێکیان بـۆ سـەرکەوتن نابێـت و بـەبێ هێزی زەمینیش سەرکەوتن لە هیچ جێگایەکدا ئیمکانی نابێت.

**دوو ڕۆژ پاش ئەوە ٢٠١٤/٩/٢٣ گفتوگۆکەمان دیسانەوە دەستی پێ کرد.**

• سڵاو، گوێت لە دەنگی منە؟

o گوێم لە دەنگتە، بەڵام وێنەکەتان نابینم.

• ئێمە لێرە کەموکوڕی کارەبامان هەیە.

o پێش کەمێك ئیمەیلێکیان بۆ ناردم دەربارەی ئەوەی کە ڕۆژنامەنووسێك بەناوی ئالفرد هاکنزبەرگر چەند جارێك لەگەڵ داعش گفتوگۆی کردووە، تۆ ئاگاداری ئەو مەسەلەیەی؟

• بەڵێ، ئاگادارم. بەداخەوە ئەو کەسانەی کە لەگەڵ ئەو گفتوگۆیان کردبوو، سزا دەدرێن.(پێی دەکەنێت)، چونکە بێ مۆڵەتوەرگرتن لەگەڵ میدیا ڕۆژئاواییەکان پەیوەندییان دروستکردوە و بەداخەوە هەندێك شتی بێمانا و پڕوپووچیشیان باس کردووە.

o بەڵام هیوادارم سزای سەخت بۆ ئەو کەسانە دەرنەکەن!

• نەخێر، زۆر سەخت نییە، ڕەنگە دوو مانگ زیندانی بکرێن یاخود شتێکی لەو جۆرە.

o دەمویست گفتوگۆ لەسەر چۆنێتیی و ڕێکخستنی سەفەرەکەمان بکەم بۆ شاری ڕەققە، بەڵام پێش ئەوە دوو پرسیاری گرنگم هەیە کە لەسەر ئەم پرسیارانە لەگەڵ هاوڕێکانم زۆر جار تووشی شەڕەقسە دەبم. ئێوە بەڵگەی سەرەکیتان بۆ شەڕکردن چییە؟ ئایا ئەو هێرشەی کە ئەمریکییەکان کردیانە سەر ئەفغانستان هیچ کاریگەرییەکی لەسەر ئەم مەسەلەیە هەبووە؟ یان هێرشی ئەمریکییەکان بۆ سەر ئێراق ڕۆڵی تێدا بینیوە؟ یاخود مەسەلەی فەلەستین و سیاسەتی شەڕخوازانەی ئەم چەند ساڵەی دوایی ڕۆژئاواییەکان بەرانبەر ڕۆژهەڵات هیچ کاریگەریی لەسەر ئەم مەسەلەیە هەبووە؟

• بێگومان ئەو شتانەی باست کرد بەشێکن لە پاڵنەرەکانی ئێمە و دەزگای جوڵێنەری سەربازەکانی ئێمە بوون و وای کردووە ئەمڕۆ ئەوان لێرە شەڕ بکەن، چونکە هەموو دنیا بینەری هەڵوێستی شەڕەنگێزیی ڕۆژئاواییەکان بوون دژی موسڵمانان، بەداخەوە موسڵمانان لەگەڵ ئەم کێشانەدا گەورەبوون و کەمتازۆر ئەنجامەکەشی ئەمەیە کە دەیبینیت. بێگومان ئەو شتانەی باستکرد کاریگەرییان هەبووە، بەڵام ئەمە تاکە پاڵنەر نەبووە بۆ ئەم مەسەلەیە.

o باشه ئەگەر وا دابنێین کە ئەمریکییەکان هێرشیان نەکردایەتە سەر ئێراق و ئەفغانستان، بەریتانیا و فەڕەنساش ئەو مێژووەی کە هەیانە بەو شێوەیە نەبووایە، دیسانەوە ئێوە هەمان هەڵوێستتان دەبوو؟

• لەو کاتەوەی موسڵمانەکان ئەندەلوسیان چۆڵکردووە، دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامی لەسەر هەمووان پێویست بووە. لەو کاتەوەی ئیسپانیا لە ئەندەلوس دژی موسڵمانان بەشەڕ هات و دەستی بە داگیرکردنی خاکی موسڵمانان کرد، ئەرکی ئێمە گرتنەوە یان پارێزگاریکردن لە وڵاتانی ئیسلامییە، ڕەنگە ئەم کارەش بە شێوازی جۆراوجۆر ڕووبدات. ئەگەر لە ئەفغانستان ڕێك نەکەوێت ڕەنگە لە هەندێك وڵاتیتردا کاروچالاکی ئەنجام بدەین. هێشتاکە چیچان و سۆماڵ و چەند وڵاتێکی تر هەن، کە بە شێوەیەکی چالاك بەرهەڵستی ڕۆژئاواییەکان دەکەن.

o لە کۆتاییدا، واتا هەردوو مەسەلەکە پێوەندییان هەیە؟ مەبەستتان شەڕە دژی سیاسەتی شەڕخوازانەی ئەمریکا و دژی سیاسەتی ڕووسیا لە بەرانبەر چیچان و خەونی دەوڵەتێکی ئیسلامی؟

• بەڵێ، هەڵبەتە پێوەندییان هەیە. دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئیسلامی لە یەکەمین و گرنگترین ئامانجەکانی ئێمەیە. بێگومان هێرشی زلهێزە ڕۆژئاواییەکان یاخود هێرشی ڕووسیا بۆ سەر موسڵمانان، ئاگرەکە خۆشتر دەکات و کێشەکە ئاڵۆزتر دەکات.

o لە درێژەی یەکێك لە گفتۆگۆکاندا، سەبارەت بە پێوەندیی داعش لەگەڵ شیعەکان وتووێژمان کرد. ئەگەر باش بێتەوە یادم، تۆ گوتت: "شیعەکان موسڵمانی ڕاستەقینە نین، ئێمە داوایان لێ دەکەین بگەڕێنەوە سەر ئیسلامی ڕاستەقینە، ئەگەریش بەم داوایە ڕازیی نەبن، هەموویان دەکوژرێن." بە گوێرەی لێکۆڵینەوەکانم نزیکەی ٢٠٠ ملیۆن شیعە لە هەموو جیهاندا هەن، حەتمەن بە گاڵتە وتتان ئەگەر پاشگەز نەبنەوە و ڕوو لە سوننەبوون یان ئیسلامەکەی ئێوە نەکەن، ئەوە هەموویان دەکوژن؟

• دەبێت چی بڵێم، لە ئەنجامدا ئەمە تەنها ژمارەیەکە بۆ هەر یەکێك لە ئێمە جێگای گومان و باوەڕنەکردنە. بەڵام تۆ دەزانیت کە کوشتنی ٦ ملیۆن یان ئێکس ملیۆن کەس لە ڕووی ئەنجامدانەوە کارێکی سادە و ئاسانە.

تۆ هەمیشە ئەوە دەپرسیت: بۆچی ئێوە بێبەزەییانە خەڵك دەکوژن؟ ڕاستییەکەی ئەوەیە هێرشە ئاسمانییەکانی ئەمریکا پێش ئەوەی ئێمەش یەکەم کەسی ئەمریکی بکوژین، هەر دەستی پێ کردبوو. بەهەرحاڵ دەسپێشخەریی هێرشەکان، ئەم سنووربەزێنانە بوون، ئێوە بۆ خۆتان دەزانن کە مەبەستم هێرشەکانی ئەمڕۆی سەر ئێراق نییە، بەڵکوو ئەوان سەدان ساڵ پێش ئێستا ئەم هێرش و پەلاماردانانەیان دەست پێکردووە، دەتوانین لە ئەندەلوسەوە دەست پێ بکەین، پاشان داگیرکردنی مەراکش و جەزائیر لەلایەن فەڕەنسییەکانەوە و دواتر هاتنی فەڕەنسا و بەریتانیا بۆ میسر، ئیتاڵیاش لە لیبیا و هەندێ جار لە تونس... هتد، کاتێك کەسێك بە درێژایی تەمەنی لەژێر فشاردا بووبێت و سەرزەنشت کرابێ، ڕۆژگارێك دێ کە بڵێت:"چیتر گاڵتەجاڕیی بەسە."

o دووبارە دەگەڕێمەوە سەر باسوخواسی ٢٠٠ ملیۆن شیعەکە، ئەگەر ئەوان بڵێن:"نەخێر، ئێمە مەزهەبی خۆمان ناگۆڕین، دەمانەوێت لەسەر مەزهەبی شیعەی خۆمان بمێنینەوە." ئەوکات چی ڕوو دەدات؟

• پێم وایە تۆ قسەکانی دوێنێی عەدنانی، وتەبێژی داعشت نەخوێندوەتەوە. ئەم قسانە وەرگێڕدرانە سەر زمانی ئینگلیزیش، عەدنانی ڕاستەوخۆ قسە لەگەڵ ئۆباما و زلهێزەکانی ئەوروپا دەکات. ئەو گوتویەتی:"هەمووتان دەتوانن بێن، ئێمە خۆمانتان بۆ ئامادە دەکەین. مەرگی ئێمە شەهیدبوونە و مەرگی ئێوەش بۆ دۆزەخە." دەزانم ئێمە براوە دەبین، ئەگەریش براوە نەبووین ئەوە نەوەکانمان براوە دەبن. قسەکانی پێرێمان سەبارەت بەم مەسەلانە بوون. ئەمریکییەکان لە ئێراق و ئەفغانستان شکستیان هێناوە، ئێمە تەواوی ئەو چەك و تەقەمەنییانەی کە ئەمریکییەکان لە ئێراق پێشکەشی

شیعەکانیان کرد، بە غەنیمەت لە جەنگەکاندا دەستمان کەوتن، بۆ ئەوەی ئەمڕۆکە لە بەرانبەر پاشماوەکانی ئەوان شەڕیان پێ بکەین .

- o چارەنووسی شیعەکان چی دەبێت؟

- • ئایا ئەو گرتەڤیدیۆییەت بینیوە کە کۆتاجار بڵاومان کردوەتەوە، یاخود نا؟ بە کەمتر لە ١٠٠ سەرباز هێرشمان بۆ سەر هێزە چەکدارەکانی سوپای ١٧ـی ڕەقفە برد، کە ئەوان ژمارەیان ٨٠٠ کەس بوو، لە کۆتاییدا هەر هەموویان هەڵاتن، یان ئەوەی خۆیان بەدەستەوە دا. ئەم ڕووداوە لە فرۆکەخانەی تابکاش دیسانەوە دووبارە بوویەوە، نازانم هەواڵەکەتان بیستووە یان نا؟

- o بەڵێ، تەماشام کردووە!

- • ئێمە نزیکەی ١٠٠ کەس دەبووین، کەچی ئەوان نزیکەی هەزار کەس دەبوون. سەرەڕای ئەوە ئەوان فرۆکە و تانك و تۆپخانەی قورس و هەموو شتێکیان لە بەردەستدا بوو. بەڵام دواجار وەکوو مریشکی ترساو هەڵاتن، لە ئاییندەدا ئەم بارودۆخە بەسەر ئێرانییەکانیشدا دێنین .

- o ئەی لەگەڵ شیعەکانی ئێراق و ئێران، ئەوانەی دەیانەوێت لەسەر مەزهەبی خۆیان بمێننەوە چی دەکەن؟

- • باشە، هەر هەموویان دەکوژین.!

- o ئاگات لێیە چی دەڵێی؟ سەبارەت بەم بابەتە پێویست ناکات ناڕازیبوونی خۆم دەرببڕم.

- • دوور نییە ئەو کارە بکەین.(پێ دەکەنێت.) شیعەکانیش بەم کارە ڕازیی نین.

- o هەروەکو پێشتر گوتم، حەز دەکەم لەگەڵ دایك و باوکت چاوپێکەوتن بکەم. نەوەك بۆ لێپرسینەوە، بەڵکوو تەنها لەبەر ئەوەی حەز دەکەم لەگەڵیان ئاشنا بم.

- • من پێشتر پێشبینیی ئەوەم کردبوو دوای گفتوگۆکەمان پێشنیاری ئەوە دەکەیت گفتوگۆ لەگەڵ دایك و باوکم یاخود تەنها دایکم بکەیت. بێگومان دەزانیت لەسەر

ئەم بنەمایە من لەگەڵ تۆ بە تەلەفۆن قسە دەکەم و تۆش دەتەوێت پەیوەندیی بە دایکمەوە بکەیت، دەزگای پاراستنی دەستووری ئەڵمانیا دیسانەوە دەچنە سۆراغی دایکم و بێزاری دەکەن، ڕوونتر بیڵێم، مێشکی دایکم تێك دەدەن.

o نازانم ئایا دەزگای پاراستنی دەستووری ئەڵمانیا گفتوگۆکانی ئێمە کۆنترۆڵ دەکات یاخود نا. بەڵام بەو شێوەی نابینم لەبەر قسەکردن لەگەڵ تۆ کێشە بۆ دایك و باوکت دروست ببێت، ئەگەر قسەکردنی من وەکوو ڕۆژنامەنووسێك لەگەڵ هاووڵاتییەکی ئەڵمانیدا کێشە دروست بکات، ئەوکات دەزگای پاراستنی دەستووریش تووشی کێشە و سەرێشەی زیاتر دەبێت.

• ئەگەر بەهەر جۆرێك بووە و حەز دەکەیت چاوت بە دایك و باوکم بکەوێت، من لارییم نییە، دەتوانی لەگەڵ دایك و باوکم و دۆستەکانم و لەگەڵ خزمەکانم پێوەندیی دروست بکەیت، ئەوکات با بزانین ئەنجامەکەی چ دەبێت.

o ئەگەر بە ئەرك نییە ژمارە تەلەفون و ناونیشانەکەی دایکتم پێ دەدەیت؟

• تەنها دەتوانم ناونیشانی ئیمێڵەکەیتان پێ بدەم.

o لە نێوان هاوڕێکانتدا کەسێکیتر هەیە بتوانم قسەی لەگەڵ بکەم؟ دەمەوێت قسەی لەگەڵ بکەم.

• من هاوڕێم زۆر نەبوو، زۆرینەیان لەگەڵ من هاتن بۆ ئێرە، یاخود تا ئەو جێگەی ئاگاداریم پاش خۆم کەسێکی وەها شك نابەم گفتوگۆ لەگەڵ تۆ بکات. بەڵام هەر ئێستا ناونیشانی ئیمێڵی دایك و باوکم بۆتان نارد.

o پێشتر گوتت بەشێویەکی خراپ لەگەڵ موسڵمانانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و وڵاتە عەرەبییەکاندا هەڵسوکەوت کراوە، بەڵام خۆ تۆ هاووڵاتییەکی ئەڵمانیت، ئایا تۆ لە ئەڵمانیا ڕووبەڕووی مامەڵەی خراپ نەبوویتەتەوە؟

- له ئەڵمانیا؟
  - بەڵێ.
- خەونت بینیوە! تۆ هەرگیز نازانیت کە چەندە شتێکی ناشیرینە کاتێک کاتژمێر پێنجی بەیانی یەکێك لە ئەفسەرەکانی دەزگای پاراستنی دەستوور بەسەر ماڵتاند دەدات و لەپڕ نیوەی دارونەدارت لەگەڵ خۆی دەبات، وەکوو کۆمپیوتەر، مۆبایل، پارە و هەر شتێکیتر کە هەتبێت. بۆ نموونە یارمەتییە داراییەکانیان ڕاگرتبوو و ئەم پارانە تا ئێستا لای پۆلیسە. دەی ئێستا من لە تۆ دەپرسم: مەبەستتان لە ڕەفتاری ناشیرین و نایاسایی چییە؟ ها؟

  - خەڵکی وڵاتە عەرەبییەکان ڕووبەڕووی کوشتن بوونەتەوە، دەستدرێژیی کراوەتە سەریان، کراونەتە ئامانجی بۆردومانەکان، لەبەر ئەمە خەمی ڕاچڵەکینی خەوی کاتژمێر پێنجی بەیانی بەراورد بەم شتانە شتێکی زۆر سەخت نییە و مرۆڤ دەتوانێت لەسەر ئاکامەکانی دان بەخۆیدا بگرێت. واتە دوو مەسەلەی زۆر جیاوازن.
- شەڕ لە ئێراق و ئەفغانستان بۆ ئەمریکییەکان بە ملیاران دۆلار تێچوونی هەبووە، هەر ئەمەش یەکێکە لە سەرچاوە سەرەکییەکانی قەیرانە داراییەکانی ئەم دواییانەی ئەمریکا. چەند شارێکی وەك دیترۆیت یان تەواوی ئەو ویلایەتانەی کە تووشی ئیفلاس بوون بێنە پێش چاوی خۆت، ئەو جێگایانەی کە تێیدا خەڵك لەگەڵ دەوڵەت و شارەوانییەکان لە مشتومڕدان لەسەر ئەوەی ئایا دابینکردنی ئاوی خواردنەوە بۆ خەڵك دەکرێت بە جۆرێك لە دارایی هەژمار بکرێت و ئایا لەو پێناوەدا ڕەوایە پارەوپول بە دەوڵەت بدەن یان نا، ئەو جێگایانەی خێزانەکان ڕاپۆرت دەربارەی بارمتەگرتنی ماڵەکانیان و دواجار لەبەر بەسەربردنی ژیان لە نێو چادر و خێمەکاندا دەنووسن. تەواوی ئەم کێشانە دەرئەنجامی تێچوونی داراییەکی زۆرە لەو جەنگانەدا کە دەوڵەت ئەنجامی داوە و خەرجییەکی زۆری تێدا بەهەدەر داوە. لەو کاتەوەی ئەڵمانیا بەشداریی لە شەڕەکانی ئەفغانستان کردووە و هەروەها لەو کاتەوەی چەك بۆ کوردەکان دەنێرێت و

هەندێك چالاكیی سەربازییتر ئەنجام دەدات، تا دێت جیاوازیی نێوان چینە كۆمەڵاتییەكان بە تایبەت لەنێوان دەوڵەمەند و هەژارەكان گەورەتر دەبێت. ڕۆژێك دێت كە خەڵكی ئەڵمانیا و وڵاتانیتریش بێنە سەر شەقام و بەرهەڵستیی ئەو كەسانە بكەن كە خۆیان دەكەنە قۆچی قوربانیی. پێشتر هیتلەر ئەم كارەی بەرانبەر جوولەكەكان ئەنجامدابوو، بەڵام ئەم جارەیان نۆرەی موسڵمانان دێت. یەكێك لە نموونەی ئەم جۆرە كارانە، كوشتنی ژنە موسڵمانێك بوو بە چەقۆ لە نێو دادگادا، نازانم ئەوەت بینیوە یان نا.[28] تادێت و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هێرشكردنە سەر موسڵمانان ڕوو لە زیادبوون دەكات، هەروەك دەیبینین دەرئەنجامەكانی بە چەقۆكوشتن و كاری لەو جۆرە كۆتایی پێ دێت. تۆ لە بەلژیكا و ئەمریكا بینەری هێرشی جۆراوجۆر بوویت بۆ سەر موسڵمانەكان، چ جای ئەوەی بگات بە وڵاتێكی وەكوو بەریتانیا. ئەم ڕووداوانە بارودۆخەكە خراپتر دەكەن، ئەگەر ژیانی خەڵك بەهۆی ئەم شەڕەوە خراپ ببێ، ئەوكات هێرش بۆ سەر موسڵمانەكانی ڕۆژئاواش زیاتر دەبێ و هەموو سنوورەكان دەبەزێنێت.

- بابەتی گفتوگۆكەمان دەگۆڕین، ڕۆڵی كوردەكان لەم شەڕەدا چییە؟

- دەتوانرێ بگوترێ كوردەكان هێرشی زەمینی ڕۆژئاواییەكانن، هەرچەندە ڕۆژئاواییەكان دە ساڵ پێش (یەپەگە)یان لە لیستی گرووپە تیرۆریستییەكاندا هەژمار كردبوو، بەڵام لە ئێستادا وەكوو هێزێكی زەمینی پێویستیان بە تواناكانی یەپەگە هەیە. بە ڕاڤە جوانەكەی ئۆباما، سوپای ئازادی سووریا بریتییە لە تێكەڵەیەك، ئەو تێكەڵەش پێكهاتووە لە قەساب و نانەوا و جووتیار، كە شتێك لە جەنگ حاڵی نەبوون و نازانن. ئەگەر باشترین چەك بخەیتە بەر دەستیان نازانن چۆن سوودی لێ ببینن، زۆرێكیان هیچ شتێك لە شەڕكردن نازانن. لەبەرانبەردا تا دڵت حەز بكا گەندەڵن، ئێمە تەواوی پێداویستییەكانمان لە سوپای ئازاد دەكڕین. بێگومان ئێستا لە خۆت دەپرسی، مەگەر

---

28- Marwa AL- sherbini،2009.(مەروە شیربینی، دادگای درسدن)

کـاری وا دەبـێ؟ ئـەم پێداویسـتی و تەقەمەنییانـە کـە لەلایـەن ئـەمریکا و زلهێـزە ئەوروپییەکانـەوە دابـین دەکـرێن، دەی باشـە بابەتەکـە بـەم شـێوەیەیە ئـیتر، ئـەوانیش دەبێت لە خەمی باخەڵی خۆیاندا بـن، ئـەوان سیاسـەتمەداری وڵاتـە ڕۆژئاواییـەکانیان بـە چاکی فریو داوە.

○ یانی ئێوە چەکە قورسەکان و تەقەمەنییەکانتان لە سوپای ئازاد دەکڕن؟

• دەی ئێمە دەیکڕین، چەك ناکڕین، بەڵام پێویستییەکانمان دەکڕین، چەکەکان لە ڕێگای غەنیمەتی جەنگەکانەوە دەستیان بەسەردا دەگرین. بەو جۆرە. بەمزووانـە ئەگـەر سەردانی ئێرە بکەیت نـوێترین چـەکەکانی ژ٣٦ و ژ٣ بـە دەسـتی چـەکدارەکانی ئێمـەوە دەبینیـت کـە لەشـانیان کـردووە و پێـی دەسـووڕێنەوە، ئەوسـا قسـەکانم پشتڕاسـت دەکەیتەوە. کوردەکانیش هاوشێوەی سوپای ئازاد مامەڵە دەکەن.

○ واتە کوردەکانیش دیسان چەکەکانیان دەفرۆشنەوە؟

• بەڵێ، بێگومان.

○ پێم وابوو کوردەکان و سوپای ئازاد بەو چەکانەی کە لە ڕۆژئـاوا وەریـانگرتووە، دژی داعش شەڕ دەکەن، باوەڕم نەدەکرد بەوەی کە چەك و پێداویستییەکانیان بە ئێـوە بفرۆشن.

• بەڵێ، بێگومـان هەنـدێکیان ئـەم کـارە دەکـەن. عەرەبسـتانی سـعودی و قەتـەر بەرەی بەناو ئیسلامییان تا مانگی جانیوەری بۆ شەڕکردن دژ بە داعش، پڕچەك دەکـرد. ئێمە شەڕمان لە مانگی جانیوەرییەوە دەست پێ کرد. ئەگـەر تەماشـای ناوچـەکانی ژێـر دەسەڵاتی ئەوان و چاوێکیش لە ناوچەکانی ژێر کـۆنترۆڵی ئێمـە بکـەیت لـەو کاتـەوە کـە کەوتۆتـە ژێـر دەسـەڵاتمانەوە، ئـەوکات خێـرا لـەوە تێدەگـەیت، کـە ئـەو گرووپانـە لـە شەڕەکانیشیدا زۆر سەرکەوتوو نەبوون، ئەوان زۆرێك لە ناوچەکانیان لەدەست دەرچـووە

و چـیتر چـەند گونـدێکیان لـەژێر کـۆنترۆڵ دایـە. هـەروەها لـە ناوەنـدی شـارەکان پاشەکشـێیان کـردووە و ناوەنـدی شـاری (حمص)ـیان بـە تـەواویی بـەجێ هێشـتووە و ئەمڕۆکە تەنها چەند ناوچەیەکی شاری (ئیدلیب) و (لازقیە)ـیان بە دەستەوەیە .

- o کەواتە سوپای ئازاد، لـەڕووی هێـزی زەمینییـەوە وەکـوو مەترسـییەك بـۆ سـەر ئێوە هەژمار ناکرێت؟

- • ئێمـە کۆچـەریین، لـە وڵاتـانی دیکـەوە کۆچـمان کـردووە و بـۆ ئێـرە هـاتووین. هاتووین تا دەوڵەتێکی ئیسلامی دروست بکەین، هاتووین بۆ ئەوەی پلەی شەهیدبوون بە نسیب خۆمان بکەین، بەڵام سووریەکانی نێو سوپای ئازاد شەڕ لەو پێناوەدا دەکەن کـە ژیانێکی جوانتر و خۆشـتریان هـەبێت. ئـەوان خـەون و پاڵنـەری جودایـان هەیـە. ئـەوان ژیانیان بە بەرەکەتی پارەکانی ئەمریکا و ڕۆژئـاوا خۆشـتر و خۆشـگوزەرانتر بـووە. دەی وەختێـك ئـەوان ئامـادەن گەنـدەڵی بکـەن و لـە پێنـاوی پـارەی زۆرتـردا چـەك و تەقەمەنییەکانیان بفرۆشن، بێگومان ژیانیان لەمە خۆشتریش دەبێت. ئیتر بۆچی دەبێـت شـەڕ لەگـەڵ خـەڵکانێك بکـەن کـە لـە مـردن بێبـاکن و بـەو جـۆرە ژیـانی خۆیـان بخەنـە مەترسییەوە ؟

- o کۆتاجار کە شەڕت کردووە کەی بوو؟

- • ماوەیەك زۆر لەمەوپێش بوو.

- o باشە بۆ بینینی تۆ چۆن بە سنوورەکەدا تێپەڕم؟ ئایا لەسەر سنوور ڕێگـام پـێ ناگرن؟

- • مەبەستت لە تورکەکانە ؟

- o نازانم، ڕەنگە مەبەسەتم ئەو کەسانە بێت کە گوێ لە گفتوگۆکەی ئێمە دەگرن.

• (پێ دەکەنێت.) هەرچی پەیوەندیی بە بەرپرسەکانی ئەڵمانیاوە هەیە دەبێت بۆ خۆتان ئەو کێشانە چارەسەر بکەن، بەداخەوە لەم ڕووەوە ناتوانین هیچ هاوکارییەکت بکەین، بەڵام هەر شتێك پەیوەندیی بە سنووری سووریاوە هەبێت، بێگومان ئێمە لەو جێگایانە خەڵکمان هەیە کە بەرپرسی ئەم کارانەن.

o چی گەرەنتی و دڵنیاییەك هەیە؟ دەکرێت لە نامەکەدا سوێند بە الله بخۆن کە ئێمە بە سەلامەتی دەگەڕێینەوە و ڕووبەڕووی هیچ ڕووداوێکی ناخۆش نابینەوە؟

• پێم وایە دەتوانم ئەمە بنووسم، بەڵام ئێمە لە ئێستادا لە شەڕداین، ئەگەر سبەی هاتی بۆ ئێرە و پاشان تۆپێك دای بەسەر خانووەکەتدا، ئەوکات تۆ دەمریت، ئێمەش هەمووماں دەمرین، دواتر ئێمە هیچ دەسەڵاتێکمان نییە.

o نامەکەم بۆ بنێرە، هەر لەگەڵ ئەوەی بانگهێشتنامەکە و ئەو گەرەنتینامەیەی کە قسەمان لەسەر کرد بگاتە دەستم، بۆ خۆم هاوکارێك دەدۆزمەوە توانای وێنەگرتن و کامێراوانی هەبێت. هیوادارم کەسێك بدۆزمەوە ڕازیی بێت بەم کارە و لەگەڵمان بێت. چونکە ڕۆژنامەنووسەکانیش دەترسن و ژیانیان زۆر خۆش دەوێت، هەروەها منیش بەو جۆرەم.

• بێگومان ئێمە وەك چۆن پارێزگاریی لە خۆتان دەکەین پارێزگاریی هاوکارەکانیشتان دەکەین، بێگومان لە مەبەستم تێ گەیشتوویت، بەڵام سەرەتا دەبێت ژمارەتان بزانین.

**• لە کۆتاییدا تەنها یەك پرسیارم لەسەر ستراتیژی داعش هەیە، چۆن دەتوانرێ باوەڕ بەمە بکرێت؟ ئێوەیەك کە پێشتر بە شێوەی گەریلایی شەڕتان کردووە و لە ئێستادا تانکی مۆدێرن و چەکی پێشکەوتووت لەبەردەستدا بێت. ئەمڕۆ ئێوە هاوشێوەی سوپا مۆدێرنەکانی جیهان هێرش دەبەن یاخود تا ئێستاش هەر بەو شارەزایی و ئەزموونە چریکیەی خۆتانەوە شەڕ دەکەن؟**

- ئەگەر کەسێك کەرەستەیەکی لە بەردەستدا بێ، بێگومـان سـوودی لـێ دەبـینێ، ئێمە نەك تەنها خۆمان بـە دەوڵـەت دەزانـین، بـەڵکوو هاوشـێوەی دەوڵـەتێکیش ڕەفتـار دەکەین، بێگومان سـوپایەکی ڕێکوپێکیش دەچێتە ئـەو چوارچێوەیەوە. هـەر کەسێك دێتـە نێـو ڕیزەکانمـان لـە هەمانکاتـدا بـە سـەربازێکیش هـەژمار دەکرێــت، نـەوەکوو سوپاکانی ڕۆژئاوا کە تەنها چەند کەسێکی هەڵبژێراو دەتـوانن بـبن بـە ئەنـدام تێیـدا، لـە مـاوەی ئـەم شـەڕانەدا لـە سـووریا و ئێـراق نزیکـەی ٢٠٠ تانکمـان بـە غەنیمـەت دەسـت کەوتووە، بێگومان ئێمەش سوودمان لێ بینیوە و لەشەڕەکاندا بەکارمان هێناون.

بەداخەوە ئەمە کێشەیەکی ترە، ژمارەی تانکەکان زیاترە لـە ژمـارەی ئـەو کەسـانەی کـە توانـای لێخـوڕینی تانکیـان هەیـە، هـەروەها ژمـارەی فڕۆکـەکان زیـاترە لـە ژمـارەی فڕۆکەوانەکانمان.

- ژمارەی فڕۆکەکانتان چەندن؟

- لـە ڕێگـەی غەنیمەتـەوە دەسـتمان بەسـەر نزیکـەی ١٠ بـۆ ١٥ فڕۆکـەی جـۆری (جیت)دا گرتووە، ئێمە توانیومانە باشتر لە سوپای ئێراق سوود لەو فڕۆکانـە وەربگـرین بۆ هێرشە ئاسمانییەکان، بەڵام بەداخەوە کێشەی کەمیی فڕۆکەوانمان هەیە، چونکە لێرە بە ئاسانی فڕۆکەوان پەیدا نابێ و دەست ناکەوێت.

- لەم نێوەندەدا پاش ناردنی چـەك بـۆ کوردەکـان لەلایـەن ئـەڵمانیاوە، ئایـا هـیچ گۆڕانکارییـەکت لــە سیاســەتی داعشــدا بەرانبــەر دەوڵــەتی فیــدراڵیی ئــەڵمانیا بــەدی نەکردووە؟

- بەڵێ! عەدنانی، وتەبێژی داعش، دوێـنی گوتـارێکی نـوێی بڵاوکردوەتـەوە، لـەم وتــارەدا دەوڵــەتی ئیســلامی داوا لــە موســڵمانەکانی وڵاتــە ڕۆژئاواییــەکان دەکــات بــۆ هێرشکردنە سەر خەڵکی ئەو وڵاتانە.

o واتا دەتانەوێ هێرش بکەنە سەر ئەڵمانیاش؟

• ئەم کارە دەرئەنجامی دەستێوەردانی زۆرێك لە وڵاتان و دەوڵەتی ئەڵمانیایە. چونکە ئەوانیش بەشێکن لەم هاوپەیمانێتییەی دژ بە داعش.

o دەرئەنجام ئەمە دەبێتە مایەی ئەوەی کە سەلەفییەکانی ئەڵمانیا لەلایەن خەڵکی ئەڵمانیاوە بە توندیی مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، چونکە خەڵك وادەزانن دۆستەکانی ئێوە لەنێو ئەو گروپانەدان، هەرچەندە ئەم سەلەفییانەش بە ڕاستیی دژی توندڕەویی بن.

• ئەمە هەر ئەو بابەتەیە کە من قسەم لە بارەیەوە دەکرد، درەنگ بێ یا زوو ڕەفتاری دەوڵەت توندتر دەبێ و پەرچەکرداری موسڵمانانی بەدوادا دێت و فەزاکە بۆ کاری لەو شێوەیە زۆر لەبار و هاندەر دەبێت. با چاوەڕوان بین ببینین چی ڕوودەدات، ئێمە ماوەیەکی زۆرە چاوەڕوانی مامەڵەی توندترین دەرحەق بە موسڵمانەکانی ئەوروپا، سەرئەنجام هەمووان دەبێ هەڵبژێرن. بە تەعبیرە جوانەکەی بۆش، خەڵك یا دەبێت لەگەڵ ئەمریکا بێت یاخود لەگەڵ تیرۆریستان. خەلیفەی ئێمە ئەم گوتەیەی پەسەندکردووە. ڕۆژێك دێت ئاستی میانڕەویی نامێنیت. دواتر کاتێك موسڵمانە بەناو میانڕەوەکانی ئەڵمانیا دژی دەوڵەتی ئیسلامی ماندەگرن، دەبێ چی بگوترێ؟ تۆ دژی دەوڵەتێکی کە بەگوێرەی قورئان و سوننەت، یانی بە پێی دابونەریتی ئێمە کاردەکات؟ ئەمە هەڵگەڕانەوەیە لە ئایین! تەواوی ئەو بەناو موسڵمانانەی کە لەم مانگرتنەدا بەشدارییان کرد، پشتیان لە ئیسلام کردووە .

o ئەم قسانە ئەوە دەگەیەنێت کە پیاوەکانی ئێوە لە ئەڵمانیا کاروچالاکی تێکدەرانە ئەنجام دەدەن؟

• باوەڕناکەم کەسێك بگەڕێتەوە ئەڵمانیا و دەست بۆ کاری لەو شێوەیە ببات. بەڵکوو بەگومانم لەوەی ئەو کەسانەی کە هێشتاکە لەوێن کاروچالاکییان دەبێ. زۆریش

دڵنیا نیم کە جۆری هێرشەکان لە شێوەی تەقینەوە دەبن یاخود شێوازی تر، پێدەچێت هێرشەکان لەلایەن تاکەکەسەوە ئەنجام بدرێت، واتە(ئینفرادی) بن .

o کەواتە لەمەولا هەڕەشە لە گیانی ئەو مرۆڤانە دەکەن کە ڕێز لە ئیسلام دەگرن و ئیسلام بە ئایینێکی گەورە و بەڕێز وێنا دەکەن، بەڵام ئەوان باوەڕ بەم شتە ناکەن. بۆ نموونە چەندین ساڵە وەك ئەوەی من بزانم هیچ تاکێکی ئەڵمانی بە دەستی گروپە تیرۆریستەکان نەکوژراوە، ئەم بانگەوازەی ئێوە دەبێتە مایەی ئەوەی کە گومانی خراپ بە موسڵمانانی ئەڵمانیا ببرێت. ئەمڕۆکە بەرانبەر هەر خوێندکار و خەیارفرۆشێکی تورك هەڵوێست و بڕیارێکی توندتریان وەك لەوەوپێش دەبێ، ئێوە کێشە و سەرێشە بۆ خەڵکێکی زۆر دروست دەکەن. بە ڕاستیی کارێکی خراپ دەکەن.

• ڕۆژێك کە کاتی هەڵبژاردنەکان دێتە پێشەوە هەموو شتێك ئاشکرا دەبێت، دڵنیام خەیارفرۆش و موسڵمانە بەناو میانڕەوەکان دەمێکە بڕیاری خۆیان داوە، ئەوان بە ئاسانی دەتوانن بڵێن، ئێمە هیچ کارێکمان بەسەر ئیسلامەوە نییە، تەواوی ئەم ڕۆژگارەش تەنها وامان پیشان داوە کە موسڵمانین. ئەوەندە و بەس.

o زۆربەی ئەو موسڵمانانەی ئەڵمانیا کە من لەگەڵیان ئاشنایەتیم هەبووە، کەسانێکی زۆر پێبەند بوون.

• پێبەندی چی؟

o ڕەنگە پابەندی ئیسلامەکەی ئێوە نەبن، بەڵام پابەندن بە یەکتاپەرستیی و فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپەکردن، بەوەی کە مرۆڤی موسڵمان بۆ خۆی کۆمەڵێك ئەرکی دیاریکراوی هەیە. خەڵکانێکی زۆر هەن کە من ئیمانە پتەوەکەیان بە باش وێنا دەکەم .

• ئەگەر هەوڵدانی کەسێك لەو پێناوەدا بێ، کە کردەوەی باش بکات و تووشی خراپەکاریی نەبێت و هەروەها بانگەواز بۆ ئەوە بکات کە تەنها کار بۆ خوای بێهاوتا دەکات، بەڵام دواجار دەنگ بدات و بانگەشە بۆ هەڵبژاردنەکان بکات و لە هەڵبژاردنی دیموکراتەکاندا بەشداریی بکات یاخود شوێنی دیموکراسی بکەوێت، بە گومڕا و هەڵگەڕاوە لەقەڵەم دەدرێت. ئەو کەسە خیانەتی لە ئیسلام کردووە و چیتر ئەو کەسە لەگەڵ باوەڕبوون بە خوای بێهاوتادا نازێت، بەڵکوو مافی یاسادانان بە هەندێك کەس دەدات، بەڵام تەنها خوا مافی یاسادانانی هەیە، هەر بۆیە ئەو کەسە بە هەڵگەڕاوە لە ئاییینی ئیسلام لەقەڵەم دەدرێت، کەواتە چیتر ئەو کەسە بە موسڵمان دانانرێت. هەروەکوو پێشتر ئاماژەمان پێ کرد زۆربەی خەڵك دەمێکە ڕێگا و ڕێبازی خۆیان هەڵبژاردووە.



# بەشی شەشەم

## دایکی ئەبوقەتادەی جیهادی

دەمەوعەسرانێکی هەورایی مانگی ئۆکتۆبەرە، لە کەناری رووباری راین لە نوسلدورفین. ئۆتۆمبیلێکی بچووک بە هێواشی دێتە پارکینگەکەی تەنیشتمانەوە. چەند چرکەیەکم دەوێت بۆ ئەوەی بزانم شۆفێری ئۆتۆمبیلەکە خانمی (ئی)[29] دایکی کریستینە. چاوە غەمگینەکانی دەربڕی هەموو شتێکە. ئەویش خێرا من دەناسێتەوە. دەست بۆ من رادەوەشێنێت و منیش بەرەو پێشوازی دەڕۆم.

ئەو خانمێکە لە تەمەندا پێی ناوەتە نێو شەست سالییەوە و قژە لولەکەی، کالی مەیلەوخۆڵەمێشییە. ماندوو دێتە پێش چاو، چما لەم سالانەی دوایی سەختی زۆری چێشتووە. بڕیار دەدەین پێکڕا لە کەنارەکانی راین پیاسە بکەین. پاش دوو سەد مەتر لە پیاسەکردن لەسەر تەختێك لەنێو پارکێك دادەنیشین. ماندوێتیی خانمی (ئی) تەنها لە دەموچاویدا نییە، بەلکوو واقیعییەتی هەیە. بە رۆح و بە جەستەش ماندووە. بە نائومێدییەکەوە بە من دەڵێ، ئەگەر باری دەروونیم باشتر بووایە، زۆر دەمێك بوو بۆ دیداری کوڕەکەم رۆیشتبووم. لەوانەشە ماوەیەك لای کوڕەکەی بمابایەتەوە، چونکە هاوشێوەی هەموو دایکێکیتر نیگەرانی منداڵەکەیەتی و دەیەوێت بزانێت حاڵی کوڕەکەی چۆنە. ئەم مەسەلەیەی لە رێگەی ئیمەیڵەوە لەگەڵ ئەو باس کردبوو، بەڵام کریستین دەڵێت سەفەرەکە زۆر ترسناکە، خانمی (ئی) دەڵێت لە رووی باری دەروونییەوە، تەندروستی بەو شێوەیە نییە، بتوانێت بەبێ هاوکاریی کەسانێکیتر سەفەر بکات.

بەسەرهاتی ئەو لەم دیدارەدا بەم شێوەیە بوو. من قسەکانی ئەو وەکوو خۆی دەگێڕمەوە بۆتان، ئەو بە دەستەواژەکانی خۆی دەڵێت:

---

٢٩- E (ناوێکی خوازراوە)

لە ساڵان و مانگەکانی ئەم دواییانەدا، پاش ئەوەی دەزانن، کە کوڕەکەی لە سووریایە و بۆ داعش دەجەنگێت، ڕۆژنامەنووسەکان هەمیشە زەنگیان بۆ لێ داوە، بەڵام ئەو وەڵامی هیچ یەکێك لەوانی نەداوەتەوە. دەیەوێت پارێزگاریی لە کوڕەکەی بکات و نایەوێت خیانەتی لێ بکات. جگە لەمە خانەوادەکەی (ئی) ڕۆژگارێکی سەختیان بەڕێ کردووە. پاش ئەوەی ئاشکرابوو، کە کریستین لە سووریا بۆ داعش دەجەنگێت. بەردەوام نامەی هەڕەشەوگوڕەشە و پڕ لە ڕق و کینەیان بۆ خانەوادەکەی کریستین ناردووە و ئۆتۆمبیلەکەشیان زەرەر و زیانی پێ گەیاندراوە. ئەو ڕۆژانەی کە دەچوون بۆ کڕینی پێداویستییەکانیان بە ڕۆژی ڕووناك نەفرەتیان لێ دەکردن. خانمی (ئی) کوڕەکەی بە کریستین بانگ دەکات و حەز ناکات بە هیچ ناوێکیتر ناوی بهێنێت. کوڕەکەی، کە لە ئێستادا یەکێکە لە جیهادییەکانی سووریا و ناوی ئەبوقەتادەی لە خۆی ناوە، بە بۆچوونی ئەو ناوێکی لەم جۆرەی نییە، ئەو بۆ هەمیشە بە کریستینەکەی دایکی دەناسرێت و دەمێنێتەوە.

هەرچەندە خانمی (ئی) پێشتر داواکاریی چاوپێکەوتنی لەگەڵ هەموو کەسانیتردا ڕەتکردۆتەوە، بەڵام شتێك پاڵنەری بووە بۆ ئەوەی بە دیدارەکەی ئێمە ڕازیی بێت. شتێك لە ناخەوە پێی گوتووە: (باشە، بچۆ بۆ ئەوێ.) بێگومان پرسی بە کوڕەکەشی کردووە. کوڕەکەشی لە ڕێگەی ئیمەیڵەوە دایکی ئاگادار کردوەتەوە، کە تاڕادەیەك دەتوانێت متمانە بە من و فریدریك بکات و هەر لەبەر ئەمەشە کە ناونیشانی ئیمەیڵەکەی ئەوی بە ئێمە داوە. چوار کاتژمێر لە کەناری ڕاین دادەنیشین و دەربارەی کریستین گفتوگۆ دەکەین. خانمی (ئی) چەندین جار لە ماوەی گفتوگۆکەماندا دەست بە گریان دەکات. وەك دایکێك ئەزموونێکی لەم شێوە زۆر بۆی سەخت بووە، بەڵام ئەو بێ جیاوازیی سەبارەت بەوەی کە ڕوودەدات، بۆ هەمیشە کوڕەکەی خۆش دەوێت .

کریستین، لە سەرەتای منداڵیدا زۆر زیتەڵە بوو. بۆ نموونە پرسیاری لە من دەکرد: (دایکە مردن چییە؟) کۆمەڵە پرسیارێکی دەکرد، دەبووایە ماوەیەك دایکی بیربکاتەوە بۆ ئەوەی وەڵامی بداتەوە. کریستین لە سەردەمی منداڵییدا لەگەڵ دایکی کاتێکی زۆریان بە

خوێندنەوەوە بەسەر بردووە. کریستین زۆر حەزی لە کتێبی (چی چییە؟) بووە. هەر شتێکمان نەزانیبا دەبووایە لە کتێبدا وەڵامەکەیان دۆزیبایەتەوە. مامۆستاکان و قەشەکانی پرۆتستانتیش دەیانزانی کە کریستین لەڕادەبەدەر پرسیار دەکات، بەڵام کریستین وەڵامی پرسیارەکانی لە کڵێسا وەرنەگرت. ئەم بابەتە ئەوی زۆر لە کارەکەی سارد کردەوە، بەشێوەیەك پێش مەراسیمی قبوڵکردنی، بڕیاری دا بەشداریی مەراسیمەکە نەکات و دیارییەکانی مەڕاسیمەکەی ڕەتبکاتەوە. بەردەوام وای بە باش دەزانی بە دوی وەڵامی پرسیارەکانیدا بگەڕێت.

خانمی (ئـی) هەمیشە هانی کوڕەکەی داوە پەرە بە ئاسۆی فکری خۆی بدات. کریستین کوڕێکی خاوەن بەهرە بووە، بەشێوەیەك کە ئەویان لە خوێندنگای نموونەیی ناوەتەبەر خوێندن. ئەو خوێندگایەی پارێزگارییان لەو منداڵانە دەکرد کە خاوەنی توانا و بەهرە بوون. ڕۆژێك کریستین دەبینێت خوێندکارێك لەلایەن خوێندکارێکی گەورەترەوە، کە چەند پۆل لە پێش ئەوانەوەیە، لێدانێکی باش دەخوات. کریستین خۆی تێکەڵ دەکات و خوێندکارە گەورەکە دەداتە بەر کوتەك و لێدان. بەڵام کریستین پاش ئەوەی لێدانێکی باش دەخوات دواتر لە خوێندنگاکەشی دەردەکرێت. دواتر ناچار دەبێت بۆ خوێندن بچێتە خوێندنگایەکی ئاسایی.

دایکی کریستین دەڵێت، ئەو لە هەموو شوێنێك سەرۆکی گرووپ، قسەخۆش و کەسێکی زۆر کۆمەڵایەتی بوو، بەڵام تایبەتمەندییەکی دیاری ئەوە بوو، کە هەمیشە پشتگیریی لە هاوڕێکانی دەکرد، ئەم کارەشی کێشە و دەردەسەریی زۆری بۆ دروست دەکرد. ڕۆژێك بەڕێوەبەری خوێندنگاکە وەکوو تەمێکردن مۆبایلی یەکێك لە خوێندکارە موسڵمانەکان لە پەنجەرەکەوە فڕێ دەداتە دەرەوە، ئەو ڕۆژە کریستین زۆر تووڕە دەبێت. لە خۆی دەپرسێت بۆچی تەمبێکردنی ئەم خوێندکارە لە تەمبێکردنی هاوپۆلییەکانی تر توندتر و سەختگیرانەتر بوو. دوای ئەو ڕووداوە کریستین بە مامۆستاکەی دەڵێت: "ئەسڵەن خوێندکارەکانی تریش دەبێت هەموویان مۆبایلەکانیان لە پەنجەرەکەوە فڕێ بدەن"، بەهەرحاڵ ئەو منداڵە موسڵمانە تاکە خوێندکار نەبوو، کە لە

وانەکاندا مۆبایلی بەکار هێنابوو. وەختێك هاوپۆلییەکەی کریستین بەهۆی دەمەقاڵەوە لە خوێندنگا دەردەکەن، کریستینیش داوای کرد کە دەبێت ئەویش وەکوو هاورێکەی لە خوێندنگا دەربکرێت[30]. هەر چێك بێت مامۆستاکەی زۆر لە دەستی نارەحەت دەبێت. سەرئەنجام ئەویش لە خوێندنگاکە دەردەکەن.

(دایکی بەردەوام دەبێ لەسەر وتەکانی.) پشتیوانییکردنی لە ئەوانیتر بووە هۆی ئەوەی هاورێیەکی زۆری لە دەور خڕببێتەوە. کریستین زۆر حەزی بە ئاهەنگگێران بوو. زۆر حەزی دەکرد کەباب دروست بکات و بیخوات، زۆرجاریش هاورێکانی لەگەڵ خۆی دەهێنایەوە بۆ ماڵەوە، دواتر چەند کاتژمێر لەگەڵ مندا دەربارەی خوا و دنیا گفتوگۆیان دەکرد.

سەرەرای ئەمە کریستین دڵتەنگ بوو، چەند ساڵ لەمەوبەر شەوێکیان هات بۆ لای من بە دڵتەنگییەوە تەماشایەکی منی کرد و گوتی: "دایکە زۆرم خۆش دەوێی، بەڵام هەندێك جار بێئەندازە هەست بە تەنهایی دەکەم." بە درێژایی ئەم هەموو ساڵە ئەو لە رۆڵی ئەرێنی باوکی بێبەش بوو. بێبەشبوو لە رۆڵی کەسێك کە بیتوانیایە کێشەکانی لەگەڵدا تاوتوێ بکات. کەسێك پاڵنەری بێت بۆ هەوڵدان و ببێتە سەرمەشق بۆی، کریستین لەمانە بێبەش بوو. هەرچەندە باوکی لە نزیکی بوو، بەڵام لە ناخەوە کریستینی تەنها بە جێهێشتبوو. هەرچەندە ئەو زۆرجار دیاریی پێ دەبەخشی، بەڵام راستییەکەی هیچ گرنگییەکی بە کریستین نەدەدا.

کریستین، لە تەمەنی مێرمنداڵیدا زۆر حەز بۆ وەرزش بوو. چەندین ساڵ وەرزشکارێکی شارەزا بوو و لە تیپی هۆکی شاری نویس یاریی دەکرد. زۆریش بەرزەفڕ بوو. حەزی دەکرد ببێتە کەسێکی بەناوبانگ و لێهاتوو، هەروەها ئەو توانایەشی هەبوو. بەرادەیەك کە جارێکیان لە تەمەنی ١٧ ساڵیدا لە یارییەکی هۆکیدا (Hockey) خەریك بوو یەکێك لە پەنجەکانی بقرتێت. وردەدەماری ماسولکەی پشتەوە و بەستەرەکانی پچڕان.

---

٣٠- فەسل

جیتر پێشکەوتنی کریستین لەو بوارەدا کۆتـایی پێهات، کریستین کەوتە نێو چاڵێکی قوڵەوە و بەتەواویی دەستی لە وەرزشکردن هەڵگرت و بەتەواوی بێپاڵنەر بوو.

ڕۆژێکیان ویستیان مالکی باشترین هاوڕێی کریستین، بۆ وەڵاتەکەی دیپۆرت بکەنەوە. پێش ئەوەی بەرپرسەکان و پۆلیسەکان بەدوای مالکدا دەگەڕان کریستین لە دوایین چرکەساتەکاندا خۆی گەیاندبووە لای و ئەوی لەگەڵ خۆی هێنابووەوە بۆ ماڵەوە بۆ لای من. "دایکە، دەبێت یارمەتیی بدەین!" پلانی ئەوەی دانابوو کە مالك بە قاچاغ بۆ سیسیل) بنێرێت. دەبوو سەرەتا مالك لەوێ دوو ساڵ چاوەڕێ بووایە، بەڵام پێش ئەوەی بەرێ بکەون، پۆلیس لەبەردەم دەرگاکە ئامادە بوو. پاشان مالکیان لەگەڵ خۆیان برد و دیپۆرتیان کردەوە.

لە دوای چەند ساڵ، پەیوەندیی کریستین لەگەڵ یەکەمین خۆشەویستیدا تێك چوو. ئەوو زابینە[٣١] چەند ساڵ لەگەڵ یەك بوون. لەدوای تێکچوونی پەیوەندییان بۆ ماوەی دوو شەو و ڕۆژ کریستین لەلای دایکی دەگریا، زۆر بێهیوا بوو. دایکی دەڵێت ئەم ڕووداوە هەموو شتێکی گۆڕی. بە بۆچوونی ئەو، دنیا بچووکەکەی بە تەواویی ڕووخا بوو. دایکی هەرگیز بەم ڕادەیە بە غەمگینیی نەیبینی بوو. "ئەگەر ئێستاش لەگەڵ زابینە بووایە، هیچ یەك لەم ڕووداوانە ڕووی نەدەدا"

دوای کۆتاییهاتنی پێشکەوتنەکانی لە وەرزش و دوای پچڕانی پەیوەندیی لەگەڵ زابینە، کریستین بە تەواویی گۆڕا. داوای لە دایکی کرد کە داوای چەند نوسخەیەکی قورئان بکات. هەروەها قورئانەکەش بە زمانی عەرەبی بێت. دایکی پێشتر لەگەڵ دۆستێکی موسڵمانیدا قسەی کردبوو و بە کوڕەکەی گوتبوو: "ئەگەر دەتەوێت قورئان بخوێنیتەوە و بە باشی لێی تێبگەیت، دەبێ بە زمانی عەرەبی بیخوێنیتەوە."

کریستین خێرا دەستی کردبووە فێربوونی زمانی عەرەبی. لەم بوارەشیدا زۆر سەرکەوتوو بووە. وەك بڵێی زمانێکی نوێی قوت دابێت. هەر زۆر خێرا توانیبوو قورئان بە زمانی سەرەکی بخوێنێت. لێرە بە دوا حەزی کریستین بۆ ئیسلام ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر

---

٣١- ناوی خوازراوە.

دەبێت، بە زۆرییش هاتووچۆی مزگەوت دەکات. ڕۆژێك بڕیار دەدات بچێتە شاری ئەسکەندەرییەی میسر، بۆ ئەوەی لە یەکێك لە زانکۆکانی تایبەت بە کەسانی بیانی درێژە بە خوێندنی ئیسلامی بدات، بەڵام دوای ساڵ و نیوێك دەگەڕێتەوە بۆ ئەڵمانیا و داواکاریی کۆمپانیایەکی بیمە بە مووچەیەکی زۆر ڕەت دەکاتەوە. پێی باشە کاری ئازاد بکات و دەست بە کڕین و فرۆشتنی هاردوێر و سۆفتوێر[32] دەکات. بۆ ماوەیەك بە سەرپێچیی دارایی تاوانبار دەکرێ، بەڵام دواتر بە بێتاوان دەناسرێت و لەو کێشە ڕزگاری دەبێت.

خانمی (ئی) زۆر نیگەرانی کوڕەکەی بوو. کوڕەکەی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر نوقمی ئایینە نوێیەکەی دەبوو. ڕیشی درێژ کردبوو، تا دەهات کەم کەم جلوبەرگەکانیشی دەگۆڕا. تەنها جلی ڕەش یاخود جامانەی نەریتی موسڵمانەکانی لەبەر دەکرد. خۆشەویستە نوێکەی لەگەڵ ئەم بارودۆخە هەڵناکات، دەرئەنجام وەختێك بواری ئەوە دێتە پێشەوە، کە دەبێ لە نێوانی خۆشەویستەکەی و ئیسلام یەکێکیان هەڵبژێرێت. کریستین دووەمیان هەڵدەبژێرێت و دەست لە خۆشەویستیی دووەمیشی هەڵدەگرێت.

ساڵی ٢٠١١، کریستین بۆ بەشدارییکردن لە کۆبوونەوەکانی ئیخوان موسلمیندا، دەیەوێت هاوڕێ لەگەڵ ڕابرت بی هاوکاری بۆ بەریتانیا بڕوات. چونکە بڕیار وایە هەموو ساڵێك لەوێ ئەو کۆبوونەوانە ئەنجام بدرێت. هەردووکیان لە کاتی چوونە نێو (دوور)ەوە دەستگیر دەکرێن. گوایە نەخشەی ئەنجامدانی کاری تیرۆریستییان کێشاوە. بابەتەکانی نێو لاپتۆپەکەی کریتسین، کە بڕێك بابەتی جیهادی و چۆنێتیی دروستکردنی تەقینەوە بوون، وەك بەڵگە لە دادگا دەخرێنەبەرباس، بەڵام کریستین ئەوان دڵنیا دەکاتەوە لەوەی کە ئەم بابەتانەی بە هۆی زیتەڵەیی خۆی خوێندۆتەوە. گوتبووی من تیرۆریست نیم. هەردووکیان بە بۆنەی بوونی نووسراوی جیهادی و بابەتەکانی چۆنێتیی دروستکردنی تەقینەوە لە لاپتۆپەکەیاندا، حوکم دەدرێن. کریستین بڕیاری ١٦ مانگ زیندانی بۆ دەردەچێت

---

32- Hardware and Software

ئەم ڕووداوە دەستپێکی قۆناغێکی سەخت و دژوارە بۆ خانەوادەکەی (ئی)، بە تایبەت پشکنینەکانی درەنگانی شەوی بوو. مۆبایلەکان، لاپتۆپەکان، یو، ئێس، بییەکانیان لەگەڵ خۆیان دەبرد. لە هەموو سووچێکەوە دوژمنایەتی دەبارێ. ئەگەر خانمی (ئی) ناچار بکرایە بەوەی کە شوێنی نیشتەجێ بگۆڕێت، ئەوکات ڕەوشەکە زۆر خراپتر دەبوو.

کەمێك دوای ئەوە کریستین لە بەریتانیا دەردەکرێت و باقی زیندانییەکەی لە ئەڵمانیا بە کەفالەت ئازاد دەکرێت، بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر گۆشەگیر دەبێت و لە خۆیدا ڕۆ دەچێ. جگە لە خەوتنی زۆر و کۆبوونەوەی شەوانەی هیچ چالاکییەکیتری نابێت. کریستین دەست لە کارەکەی هەڵدەگرێت. دەیەوێت بۆ ماوەیەك لە جێگایەکیتر کارێکی جیاوازتر ببینێتەوە. چ کارێك، خۆشی نازانێت. بیروهۆشی تەنها دەبێتە ئیسلام. لەو کاتەدا جەنگ لە سووریا دەست پێدەکردووە و گرتەڤیدیۆییە ترسناکەکان لە هەموو کەناڵە تەلەفزیۆنییەکانەوە پەخش دەکرێن. لەبەرئەوەی کریستینی گۆشەگیریش جگە لە گەڕان بۆ دۆزینەوەی کارێك هیچ ئامانجێکی تری نابێت، کاتێکی زۆری بەدەستەوەیە بۆ تەماشاکردنی ئەم فیلم و هەواڵانە .

ڕۆژێك بێ ئەوەی قسەیەك بکات لە ئەڵمانیا سەرنوقم دەبێت. بەبێ خواحافیزیی، بەبێ هیچ شتێك. دوای چەند مانگ لە دیارنەبوونی دەنگۆی ئەوە بڵاودەبێتەوە لە سووریایە. دوای چەند هەفتە هاوڕێیەکی ئەم هەواڵە پشتڕاست دەکاتەوە، کە بەڵێ بە ڕاستی کریستین لە سووریایە.

دوای یەك ساڵ چی تر خانمی (ئی) تاقەتی نامێنێت، بۆ دۆزینەوەی کوڕەکەی لە فەیسبووك دەست بە گەڕان دەکات. بەڵام نازانێت کوڕەکەی چی ناوێکی خوازراوی بۆ خۆی داناوە. دایکی ناوی تەواوی ئەو هاوڕێ موسڵمانانەی کریستین تاقی دەکاتەوە، کە لە ئەڵمانیا دەرکرابوون. وابزانم کەسێك بە ناوی عەبدولمالیك لە فەیسبووك دەبینێتەوە، کە پێ دەچێت لە سووریا بێت. چەند ڕۆژێك چاودێریی فەیسبووکی ئەم کابرایە دەکات،

دواتر پڕ بە دڵ و بە بوێریی خۆی دەنووسێت: "ئەوە تۆی کریستین؟!" ڕۆژێك دوای ئەوە وەڵام دەداتەوە و دەڵێت: "بەڵێ، منم دایکە!"

دایکی باس لەوە دەکات لەم ماوەیەدا چەندین جار نامەیان بۆ یەکتر نووسیوە. شتێلێکی لەم شێوە: "کریستین بگەڕێوە بۆماڵەوە! بگەڕێوە ئیتر!" ئەمە گەورەترین ئارەزووی خانمی (ئی) دایکی کریستینە، دەیەوێت کوڕەکەی بگەڕێتەوە، لەو کاتەوەی کە ڕۆشتووە دەموچاوی نەبینیوە. دایکی دەڵێت: "خۆزگە جارێکیتر دەمتوانی لە باوەشی بگرم، خۆزگە دەمتوانی بە تەواویی ماڵئاوایی و خواحافیزی لێ بکەم."

دایکی دڵتەنگ و غەمگین کاتێك تا نزیکی ئۆتۆمبیلەکەی ڕەوانەم کرد، تەنها دەگریا و فرمێسکی دەڕشت.

# بەشی حەوتەم

## ڕێککەوتن و بەدیهاتنی سەفەرەکە

چەند ڕۆژ پاش ئەوە، واتە لە ٢٠١٤/١٠/٢٣ دووبارە لە ڕێگەی سکایپەوە پەیوەندیم لەگەڵ ئەبوقەتادە گرتەوە. دەربارەی بینینی دایکی کەمێك قسەمان کرد. لەبەر ئەوەی نیگەرانی چاودێری و کۆنترۆڵکردنی هەموو قسەکان بووم، نەمدەویست کێشەی بۆ دروست بکەم. بە کورتی و پوختی گفتوگۆی دواجاری من لەگەڵ ئەبوقەتادەدا پێش ئەوەی سەفەر بکەم بۆ قەڵەمڕەوی داعش، بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

- o یورگن تودنهوفەر: مەخابن، لەم ڕۆژانەدا کەمتر دەبینم لە سەر خەت بیت، بەم شێوەیە کارەکانمان ناچێتە پێشەوە و دوا دەکەوێت .
- • ئەبوقەتادە: بەڵێ، هەموو شتەکان زیاد لەوەی کە بەرنامەت بۆ داناوە درێژە دەکێشێت.

- o بەم نزیکانە کەشوهەوای سووریا ساردتر دەبێت.
- • بەڵێ ڕاستە. بەڵام هێشتا بە ڕۆژان کەشوهەوا دڵگیرە، پلەی گەرمی نزیکی ٢٥ پلەی سەدیی دەبێت. نووسینەکەت پێگەیشت[٣٣]؟
- o نامەکە لە لای فریدریکی کوڕمە. ویستم جارێکیتر دووپاتی بکەمەوە، کە زۆر حەزدەکەم سەردانی دەوڵەتی ئیسلامیی بکەم. تامەزرۆم بۆ ئەوەی بزانم ئایا ئێوە گروپێکی تیرۆریستیی پارتیزانن یاخود بە ڕاستی وەکوو سەرکەوتوویەك دەتانەوێت دەوڵەتێك دابمەزرێنن. ئەم جۆرە بابەتانە لە زۆرێك لە کۆمەڵگاکاندا قسەی لەسەر ناکرێت، بەڵام من پێویستم بە گەرەنتیی باوەڕپێکراو هەیە. تاکە بواریش بۆ ئەم کارە

---

٣٣- مەبەستی لە بەڵێننامەکەی داعشە کە لەلایەن خەلیفەوە نووسراوە. وەرگێڕانی نامەکە لە کۆتایی کتێبەکەدا هاتووە.

بریتییە لە بڵاوکردنەوەی بانگهێشتنامە و بەڵێننامەکە لەلایەن ڕاگەیاندنەکانی داعشەوە. بە شێوەیەك کە سەرانسەری جیهان لە مەسەلەکە ئاگاداربن و ئێوەش بەشێوەیەکی ئاشکرا پەیمان بە من بدەن. من گومانی خراپ بە تۆ نابەم. ئەوە بۆ نزیکەی هەشت کاتژمێرێك دەبێت لەگەڵ یەکتر قسە دەکەین، هەروەها ئێستا دایکیشتان دەناسم. فریدریکی کوڕیشم لەگەڵ دایکت ئاشنا بووە. سەرەڕای ئەم هەمووەش من بە گوێرەی پێویست هەست بەبونی ئاسایش ناکەم. بەم پێیەش بێت ناتوانم ڕۆژنامەنووسێکی لێهاتوش پەیدا بکەم بۆ ئەوەی بەڵێننامەکەی ئێوەی بۆ بڵاوکردنەوە پێ بدەم. کەواتە دەبێت چی بکەین؟

- کێشەکە لەوەدایە کە چی تر ئێمە میدیا و کەناڵی فەرمییمان نییە. تویتەر هەموو لاپەڕە و ئەکاونتەکانمانی بلۆك کردووە، دیسانەوە هەوڵماندا لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانیتر لاپەڕە و ئەکاونت دروست بکەین، بەڵام دیسانەوە لەوێش بلۆك کراین. پەیج و ئەکاونتەکانمان ڕۆژ و کاتژمێرێك نابات هەموویان دادەخرێن. هەربۆیە حاڵی حازر هیچ میدیا و کەناڵێکی فەرمییمان بە دەستەوە نییە تا لە ڕێگەیەوە بانگهێشتنامەکەی تۆ و هاتنی تۆ بۆ دەوڵەتی ئیسلامی بە هەموو جیهان ڕابگەیەنین.

  - دەکرێت بانگهێشتنامە و بەڵێننامەکە بە کەسایەتییەکی ناوداری موسڵمانی باوەڕپێکراو بدەن؟ گرنگ نییە ئەو کەسایەتییە کێ بێت، لە ڕووی بیروباوەڕەوە هاوڕاتان بێت یان نا.

- وەکوو کێ؟ گریمان.

  - مەبەستم لە کەسێکە کە داعش بناسێت، کەسێك کە ئەگەر نامەی بۆ بنێرن، بتوانێت لە بارودۆخێکی قەیراناوییدا بڵاوی بکاتەوە.

- ئێمە سەبارەت بەم بابەتە و بۆ دڵنیابوونی تۆ لە ڕێگەی باڵاترین سەرچاوە، کە دەفتەری ڕەسمی خەلیفەیە، نامەکەمان ئامادە کردووە. خەلیفە بۆ خۆی ڕەزامەندیی لەسەر سەفەرەکەتان دەربڕیوە. ئێمە کار بەم ڕەزامەندییینامەیە دەکەین. تەنانەت

ئەگەریش بۆمبێك بكەوێت بەسەر سەریشماندا، پێم وابێت خانەوادە و دۆستەكانتان ئەوە دەزانن كە ئێوە دەتانوانی هەموو ئەم بابەتانە لە زیانی ئێمە لە میدیا جیهانییەكان بڵاوبكەنەوە.

o لێرەدا بابەتێكی گرنگتر ماوە بۆ ئەوەی قسەی لەسەر بكەین، ئەوەش ئەوەیە كە هیچ كەسێك ناتوانێت ڕاستی و دروستی ئەم بانگهێشتنامەیە بسەلمێنێت. ڕەنگە هەموو نامەكان ساختەبن. سەبارەت بەم مەسەلە دەبێت وەڵامێكم پێ بدەن كە من چیتر دڵنیا ببمەوە. چونكە هەر هیچ نەبێت ڕۆحی چەند مرۆڤێك لە مەترسیدایە.

هەروەها دوو پرسیاری كورتی بابەتی دیكەم هەیە. یەكەمیان: ئەو دەمەی هێرشتان كردە سەر موسڵ و دەستتان بەسەردا گرت ژمارەی سەربازەكانتان چەند بوون؟ من گومانم بۆ ئەوە چوو كە نزیكی دوو هەزار كەس بووبێتن. بەڵام بە گوتنی ئەم ژمارە كەمە ڕووبەڕووی ڕەخنەی زۆر بوومەتەوە .

• دوو هەزار كەس؟ هەرگیز! لە دەستبەسەرداگرتنی موسڵدا تەنها ١٨٣ كەس بەشدارییان كرد. زۆرێك لە خەڵكی ناتوانن باوەڕ بەم بابەتە بكەن. ئێمە پێویستمان بە سوپایەكی گەورە نییە، بەڵكو پێویستمان بە ئیمان بە شتێكی دیكە هەیە. ئیمانێك بە الله. تۆ بە ئاسانی لەم بابەتە تێناگەی. تۆ لەسەر شتە دنیاییەكان گفتوگۆ دەكەیت، بەڵام ئێمە باس لە ڕاستییە دەروونی و ڕۆحییەكان دەكەین. لەم بارەیەوە دەمەوێت بەسەرهاتێكت بۆ بگێڕمەوە كە ڕەنگە باوەڕ نەكەیت، لەكاتی چوونە ژوورەوەی ئێمە بۆ ناو پارێزگای ئەنبار، سوپای ئێراق هەوڵی وەستاندنی هێرشەكانی ئێمەیان دابوو. بە تۆپ و هاوەنی قورس براكانمانیان تۆپباران كردبوو. شەڕكەرەكانی ئێمە بەدوای پەنایەكدا گەڕابوون بۆ خۆحەشاردان و پەناگرتن، تەنها جێگەیەكیش كە دیار بوو، چەند خانوویەكی چۆڵ بوو. دواتر شەڕكەرەكان بۆ ئەوەی پەنا بگرن، بە ئاراستەی خانووەكان ڕایان كردبوو، بەڵام ئێراقییەكان؟ ئێراقییەكان چیان كرد؟ وا تێگەیشتبوون كە سەربازەكانی ئێمە بە ئاراستەی ئەوان هێرش دەبەن، هەموویان لە ترسانا هەڵاتبوون. ئێمە هەمیشە(الله)ـمان لەگەڵ بووە.

o پرسیاری دووەمم دەربارەی قسەکانی دواجارمانە. ئەو دەم تۆ گوتت شیعەکان بواری ئەوەیان هەیە کە تۆبە بکەن و مەزهەبی خۆیان بگۆڕن و ببن بە سوننە، ئەگەر بەم پێشنیارە ڕازیی نەبن دەکوژرێن؟ باشە ئەگەر مەسیحییەکان ئامادە نەبن پارەی باج (جزیە) بدەن، ئەوکات هەڵوێستی ئێوە بەرانبەریان چۆن دەبێت؟

• هەمان چارەنووسیان دەبێت.

o واتە ئەوانیش دەکوژن؟

• بەڵێ.

o ئایا ئەو موسڵمانانەی کە باوەڕیان بە ڕاڤە و بیروبۆچوونی سوونی ئێوە نییە. هەمان چارەنووسیان دەبێ؟

• یاسا ئیسلامییەکان لەم بارەدا جیاوازن. شیعەکان بە مورتەد و هەڵگەڕاوە لەقەڵەم دەدرێن. بەهۆی کوفر، پەرەستنی گۆڕ و هەموو تایبەتمەندییە گاڵتەجارییەکانی دیکەیان کە هەیانە. ئەوان بواری باجبەخشین نایانگرێتەوە. شیعەکان بەپێچەوانەی مەسیحیی و جوولەکان، دوو پێشنیاریان لە پێشە، یا ئەوەی بە ڕاستیی پەشیمان دەبنەوە و ئیسلام قبوڵ دەکەن، یاخود دەکوژرێن .

o چارەنووسی موسڵمانەکانی ئەڵمانیا چیی؟ تۆ ڕەخنەت لەوە گرت کە موسڵمانەکانی ئەڵمانیا دینەکەی خۆیان کە ئیسلامە، تێکەڵ بە دیموکراسیی و سیکۆلاریزم کردووە. لەگەڵ ئەمەشدا خۆیان بە موسڵمانی ڕاستەقینە دادەنێن. باشە ئەگەر ئەوان بە داعش بڵێن بیروبۆچوونێکی زۆر توند و چەقبەستووتان هەیە، ئایا ئەوانیش بە دەردی کوشتن دەبەن؟

• بەڵێ، بە دەردی کوشتنیان دەبەین. بابەتەکە زۆر سادە و ئاسانە. ئەگەر ئێستا کەسێك بانگەشەی ئەوە بکات، کە موسڵمانە و بەڵام دیموکراتخوازە، ئەوە موسڵمان نییە. موسڵمانبوون واتە تەسلیم بوون، تەسلیم بوون بە الله. یەکێك لە ٩٩ ناوەکەی

خوداش بریتییە لە (الحكم). بەو مانایەی کە تەنها خوا مافی یاسادانانی هەیە و هەر ئەو زاتەش مافی ئەوەی هەیە بیگۆڕێت. هیچ مرۆڤێك مافی ئەوەی نییە ئەو سیفەتەی کە خوا هەیەتی بە هی خۆی بزانێت و بیداتە پاڵ خۆی. ئەگەریش کەسێك ئەو کارە بکات، ئەوە سیفەتێکی خوای داوەتە پاڵ خۆی و ئەمە بە مانای گومڕابوونییەتی لە ئایین! ئەو کەسەی سیفەتێکی خوایی وەکوو بواری یاسادان بە مافی خۆی دەزانێت، چیتر چۆن دەتوانێت بانگەشەی موسڵمانبوون بکات؟ ئەو بەم کارە گومڕا بووە و لە دین دەرچووە. ئەمە ڕاستییەکی زۆر سادە و ئاشکرایە و خاڵییە لە هەر دید و تێگەشتنێکی زیادەی فەلسەفی.

o ئایا لە ئێستادا لە دەوڵەتە ئیسلامییەکەی ئێوە بواری قسەکردن دەربارەی ئەم بابەتە لەگەڵ بەرپرسەکان هەیە؟

• هەگیز! زۆر باش بوو کە ئێستا ئەم باسەت ورووژاند. باشترین شت کە تۆ دەبێت بیکەیت ئەوەیە کە ئەو کاروچالاکییانەی کە تۆ خوازیاری لێرە ئەنجامیان بدەیت، لەگەڵ ئەو کەسانەی کە دەتەوێت چاوپێکەوتنیان لەگەڵ بکەیت، یاخود ئەو دامودەزگایانەی کە دەتەوێت سەردانیان بکەیت و هتد... لە دەستنووسێکدا تۆماریان بکەیت. پاشان من پێش هاتنی ئێوە ئەو دەستنووسە لە پێش لایەنە بەرپرسەکاندا دادەنێم، بۆ ئەوەی بزانم چیمان لەدەست دێت بۆ ئێوەی بکەین.

o بەڕێوەبەری بەشی میدیای داعش خەڵکی کام وڵاتە؟

• ناتوانم بیدرکێنم. (پێ دەکەنێت.) بەهەرحاڵ بەڕێوەبەری میدیای داعش بەو شێوەیەی کە لە ویکیپیدیا نووسراوە، گوایە ئەبو تەڵحەی ئەڵمانییە، ڕاست نییە. لەوە زیاتر ناتوانم زانیاریی بدەم.

o ئایا لەنێو دەوڵەتی ئیسلامی بە تەنهایی دەتوانم بسوڕێمەوە؟

• پێم وابێت چەند کەسێك بۆ پاراستنی ئێوە تەرخان دەکەین. ڕازیی نابین بەوەی کەسێك ئێوە بناسێت و ئاگاداری ئەوەبێت تۆ هاتووی بۆ ئێرە و شتێکی خراپ و

گەوجانە بێت بە سەریدا و هەموو ئەو بەڵێنانەی کە بە ئێوەمان داوە تێکوپێک بدات. هەربۆیە دوو کەسیان بەردەوام لەگەڵتان دەبن، ئەوان وەکوو سێبەریش بەسەر سەرتانەوە نابن، بەڵام پێم وایە لە کاتی چوونەدەرەوەتان هاورێتیتان دەکەن و لەگەڵتان دەبن .

o بەڕاست، واتە دەتوانم بێ ئەوەی پیاوەکانی ئێوە لە تەنیشتمەوە بووەستن و لولەی تفەنگەکەیان ڕوو بکەنە خەڵك، لەگەڵ ئەو خەڵکە چاوپێکەوتن بکەم؟

• بەڵێ بێگومان دەتوانیت. هەروەك چۆن بینیتان وایس نیوز لە ناو مزگەوتدا لەگەڵ خەڵك قسەی دەکرد. تۆش دەتوانیت لەگەڵ خەڵك چاوپێکەوتن بکەیت.

**• ئێوە جارێك بە پێچەوانەی خواستی خۆت، لەگەڵ خۆرئاواییەکان گفتوگۆت کردووە. تەنانەت چاوپێکەوتنیکیشت ئەنجام داوە**

**• بەڵێ، بەڵام فەرمیی نەبوو. کەسێکی تر لە ڕێگەی سکایپەوە لەگەڵ بی، بی، سی، قسەی کردبوو. نازانم تۆ چاوپێکەوتنەکەت دیوە یان نا، بەڵام بەداخەوە دەستتێوەردانی هەندێك کەس لە هەندێك کاروباردا، کە پەیوەندیی بە ئەوانەوە نییە، بۆ خۆی بووەتە کێشەیەکی گەورە لێرە. بەڵام ئەو کەسانە هەموویان سزا دەدرێن .**

o ئایا بە شەوان دەتوانم لە ئوتێل بمێنمەوە؟ بۆ ئەوەی هێندەش یەکتر ماندوو نەکەین؟

• کێشەکە ئەوەیە کە ئێمە چی تر هوتێلمان نییە. چەند هوتێلێکمان هەبوو، بەڵام ئێستا بۆ شتی تر سوودیان لێ دەبینرێت، ئێستا هوتێلەکان بوونەتە شوێنی ئیداری و شوقە .

o بە چی شێوازێك خۆمان بگەینین بە دەروازەی سەرەکی سەر سنوور؟

• دەبێت سەرەتا خۆتان بگەیەن بە شاری غازی عەنتاب لە تورکیا. بە تەکسی بێت یاخود پاس. ئەو باقی سەفەرەکەتان لە ئەستۆی ئێمە دەبێت، بۆ خۆمان دێین بە شوێنتاندا.

o خراپ نییە لێرەدا دیسانەوە باسی کۆبانێ بێنمە پێشەوە. ڕووداوەکانی شاری کۆبانێ خەریکە بە توندی میدیاکانی ئێمە دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە. ئەوان باس لەوە دەکەن کە لە ئێستادا ئێوە ٣٠٪ شاری کۆبانێتان بەدەستەوەیە.

• پشت بە خوا تا چەند ڕۆژێکی تر ئەو کاتەی کە هەموو شاری کۆبانێ دەخەینە ژێر دەسەڵاتمانەوە، هەموو میدیاکان تووشی شۆك دەکەین. مەگەر ئەوەی کە ئەمریکا هەموو جێگاکان بۆردومان بکات.

o بەڵام بۆچی هێندە سوورن لەسەر گرتنی ئەم شارە، هەموو هەوڵەکانیشتان لەو پێناوەدا خستووەتە گەڕ؟ ئێوە لە کۆبانێ شەڕکەرانێکی زۆرتان بە کوشت داوە.

• لەبەر ئەوەی پێشمەرگە کوردەکانی ئێراق لە زەمانی سەدام حوسێندا، هاوپەیمانی ئەمریکا بوون. هەروەها لە ڕووی جوگرافیاوە کۆبانێ دەکەوێتە نێو چەقی ناوچەکانی ئێمەوە، واتە پێگەیەکی جوگرافی گرنگی بۆ ئێمە هەیە. یەکینەکانی پاراستنی گەل شەڕڤانێلێکی سەرسەختیان هەیە. ئێمە ئەو دەمە بە خۆمان گوت: زۆر چاکە، ئەوە هەموو نووسەیرییەکانمان[٣٤] لە ناوچەکانی خۆمان دەرکرد، ئەم کارە بەسەر یەپەگە و گروپەکانی تریشدا دەهێنین.

o لە ڕووی ستراتیژییەوە سەر لە بڕیارەکانی ئێوە دەرناکەم. پارتیزانەکان ژمارەیەکی زۆری شەڕکەریان لە شوێنێکدا کۆکردووەتەوە، کە ڕەنگە ببنە نێچیری بۆردومانی فڕۆکەکان، بە ڕاستیی سەیرن.

---

34 - Nusairier

- لێرەدا جارێکی تر ڕووی ڕاستەقینە و خۆفرۆشانەی ڕۆژئاواییەکان دەردەکەوێت. یەکینەکانی پاراستنی گەل و باڵی سووریای Mg36 ئێستا بوونە بە هاوپەیمانی ڕۆژئاواییەکان. سەرەڕای ئەوەی لە هەموو جیهاندا ئەم دوو گروپە بە تیرۆریست لەقەڵەم دراون، بە تایبەت لە ئەڵمانیا و ئەمریکا. بەڵام سەرباری ئەمە لە پەسا چەك و تەقەمەنی و پێداویستییان بۆ ڕەوانە دەکەن.

هەروەها ئێمە چی تر لە ڕێگەی دەسکەوتەکانی جەنگەوە باشترین نارنجۆك و باشترین (ئێم، جی ٣٦)ـەکانمان دەست کەوتووە. هەروەها چەند چەکێکی (میلانۆ)ـمان دەست کەوتووە، کە مووشەکی دژەتانك دەهاوێژێت. ئەو چەکانەی ئێوەی ڕۆژئاوایی ڕەوانەی ناوچەکەی دەکەن، لە ئەنجامدا لە بەرژوەندیی ئێمە دەشکێتەوە. بۆیە بە خەیاڵی ڕاحەت چەك ڕەوانە بکەن. ئێمەش ئەوان لەشەڕدا بە دەستکەوت دەگرین.

- o زۆر چاکە، بۆ ئەمڕۆ هێندە بەسە. گرنگترین بابەتەکانمان تاوتوێ کرد. بۆ کاری سەفەرەکەم کارێك بکەن کە بەڵێننامەکەتان باوەڕپێکراو بێت . زەنگتان بۆ لێ دەدەمەوە. دەبینیت کە ڕیشیشم داناوە!

چەند ڕۆژێك پاش ئەوە لە ٢٠١٤/١١/٢ دووبارە پێکەوە قسەمان کرد.

- o لە کوێیت؟
- لە شاری (ڕەققە)ـم.
- o بەڵام کۆمپیوتەرەکەی من وا نیشان دەدات کە لە تورکیای.
- ڕەنگە واش بێ.

- o بەڵام خۆ ئێوە لە ئێستادا بە نیازی فەتحی تورکیا نین؟
- ئاهـ. نۆرەی ئەویش دێت.

- o بەڵام دەڵێن تورکیا هاوپەیمانی شاراوەی ئێوەیە.

• چۆن دەتوانێت هاوپەیمانی ئێمە بێت لەکاتێکدا پەیوەندی پتەوی لەگەڵ ئەمریکا هەیە؟

o تورکەکان ئەم کارە بە خواستی خۆیان ناکەن، بەڵکوو ئەوان ناچارن. لە ڕاستیدا ئەوان ڕازیی نەدەبوون بەوەی یەك پێشمەرگەش بەنێو خاکیاندا تێپەڕێت.

• ئەوان لە ئێستادا سەرقاڵی پەڕاندنەوەی چەکدارانی یەکینەکانی پاراستنی گەلن.

o بەڵێ، چونکە فشارەکان لەسەر تورکیا زۆرە. فشاری ئەمریکا. دەزانیت کە تورکیاش ئەندامی ناتۆیە.

دوای پێشنیارەکەتان لەبارەی چۆنیەتی پشت ڕاستکردنەوەی بایەخداربوونی بانگهێشتنامەم بۆتان ناردووە. ئێستا دەمەوێت بزانم وەڵامی ئێوە چی دەبێت.

• لەو بارەیەوە لەگەڵ سەرەوەی خۆم قسەم کرد، بەهەرحاڵ ئەو کەناڵانەی لە ئێمەیلەکەدا ناوت هێناون، وەك جەزیرە و عەرەبییە، بۆ ئەوەی نامەکەی تێدا بڵاوبکرێتەوە بە هیچ جۆرێك پێی ڕازیی نەبوون. پێشنیاری من ئەوەیە کە ئەم نامەیە لە ڕێگەی لاپەرەکانی تویتەرەوە بڵاو بکەیتەوە، ئەو لاپەڕانەی کە نزیکن لە ئێمەوە .

o بەڵام لاپەڕە و ئەکاونتەکانی ئێوە لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەردەوام لە گۆڕاندایە، ئەوکات دەتوانی بانگەشەی ئەوە بکەی کە ئەمە کەسێکیتر لە تویتەر نووسییەتی و بە ناوی ئێمەوە بڵاوی کردۆتەوە. ئەی ئەگەر من نامەکە بە کەناڵی جەزیرە بدەم و ئەوان بڵاوی بکەنەوە، چی؟

• بۆچی تەنها دەبێ جەزیرە یاخود عەرەبییە بێت؟ کێشەی ئێمە لەگەڵ ئەوانەدا ئەوەیە کە ئێمە حەزناکەین ئەوان ببن بە سەرچاوەی یەکەم. ئێمە لەگەڵ ئەوان کار ناکەین، چونکە درۆزنێکی گەورەن و کاریگەرییەکی زۆریشیان لەسەر هەندێك لە عەرەبەکان هەیە. سەبارەت بە تۆڕەکانی دیکەی هەواڵ یاخود بەرنامە و تەلەفزیۆنەکان هیچ لارییەکمان نییە، دەتوانی لەو سەرچاوانە بڵاوی بکەیتەوە. یاخود دەتوانی لەسەر پەیجی فەیسبووکەکەتان بڵاوی بکەیتەوە.

o جگە لە تۆ ئایا دەتوانم لەگەڵ کەسانی بەرپرس و باڵادەستی نێو داعش گفتوگۆ بکەم؟ من حەز دەکەم لەگەڵ بەرپرسە باڵاکانی نێو ڕێکخراوەکەتان قسە بکەم، چونکە دەمەوێت هەقیقەت بۆ هەموو جیهان ڕوون بکەمەوە، لەناو داعشدا کەسێك هەیە لەم بوارەدا زانیاریی هەبێت؟

• تاو ئەو جێگەی تایبەتە بە هەندێك بواری دیاریکراوەوە، دەتوانیت لەگەڵ چەند کەسێکی باش و شارەزادا چاوپێکەوتن ئەنجام بدەیت، بەڵام سەبارەت بە ئەبوبەکر بەغدادی و عەدنانی، باوەڕناکەم ڕێگات پێ بدەن.

o بۆچی ناکرێت؟

• بە بۆچوونی ئێمە ئەم جۆرە چاوپێکەوتن، یاخود گفتوگۆیانە هیچ سوود و خزمەتێك بە داعش ناگەیەنێت. ئەوەی کە ئێمە دەمانەوێت و ئەنجامی دەدەین، ڕوون و ئاشکرایە کە چییە. دەی چیتر پێویست بەوە ناکات بۆ بابەتیکردنی مەسەلەکە بە هەر شێوەیەك بووە گفتگۆیەك لەگەڵ خەلیفەدا بکرێت.

o من دڵنیام زۆرێك لە سیاسەتمەداران لە کاتی گفتوگۆکردندا هەندێك بابەت دەوروژێنن کە زانیاریی تازە و نوێن بۆ هەموو جیهان، ئەمەش گۆڕانکاریی و ڕووداوی زیاتر بەدوای خۆیدا دەهێنێت. بواری ئەوە هەیە کە سەردانی ئۆپەراسیۆنە جەنگییەکان بکەم و لە نزیکەوە تەماشایان بکەم؟

• ئەگەر حەز بکەیت بەڵێ. دەتوانیت بچیتە کۆبانێ و لە نزیکەوە بارودۆخەکە ببینی، ئەگەر شتێکیشتان بۆ ڕوون نییە و لاتان شاراوەیە، دەتوانن خۆتان سەردانی کۆبانێ بکەن و لە نزیکەوە بە وردیی تەماشای بارودۆخەکە بکەن.

o ئایا ڕۆشتن بۆ کۆبانێ کارێکی ئاسانە و سەخت نییە؟

• بەڵێ، بێگومان. ئەو ناوچەی کە لەژێر کۆنترۆڵی ئێمەدایە هەموو شتێك تێیدا ئازاد و ڕێگەپێدراوە. ئەگەر پێتان خۆشبێ دەتوانن تاکوو سەنگەرەکانی پێشەوەش بچن.

o لە ڕەققەوە بۆ کۆبانێ چەندە ڕێگا دەبێت؟

• زۆر دڵنیا نیم، بەڵام پێم وایە نزیکەی ٢٠٠ کیلۆمەترێك دەبێت. ئەگەر بە ئۆتۆمبیل بچیت پێویستە دوو کاتژمێر و نیو تەرخان بکەیت.

o تا ئەم چرکەساتە تەنها چەند کەسێکی دیاریکراو ئاگاداری ئەوەن کە من بۆ ناوچەکانی داعش سەفەر دەکەم و ئەم کەسانەش بەردەوام دوو شت بە من دەڵێن. یەکەم: تۆ هەرگیز ناتوانیت بە ئازادیی قسە بکەیت و هەرگیز وەڵامی ڕاست و دروست بەدەست ناهێنیت. دووەمیش ئەوەیە: ئەوان چییان لە تۆ دەوێت؟ سەرئەنجام شتێکیان لە تۆ دەوێت، گەر نا چۆن ڕێگەت پێ دەدەن بچی بۆ ئەوێ؟

• بێگومان بێ ئەوەی کەسێك لە تەنیشتتەوە ڕاوەستێت، بێ ئەوەی کەسێك فشار لەسەر ئەو خەڵکە دروست بکات کە بە نیازی گفتوگۆیان لەگەڵ بکەیت، دەتوانی بە ئازادیی لەگەڵ ئەو خەڵکە قسە بکەیت. ئەگەر سەردانی ئێرە بکەی هەر زوو تێبینیی ئەوە دەکەیت کە ژمارەیەکی زۆری شەڕکەری بیانی لە نێو شارەکاندان، تەنانەت ئەگەر ئەوکات بتەوێ بە تەنها بمێنیتەوە، هەمیشە یەکێك لە پیاوەکانی ئێمە لەنزیکت دەمێننەوە.

o جگە لەمە سەبارەت بە شوێنی مانەوەش پرسیارم کردبوو.

• ئێمە خانۆچکەیەکمان بۆتان ئامادە کردووە کە هەموو پێداویستییەکانی تێدایە. هەروەکوو پێشتر گوتم بەداخەوە لێرە هوتێل نەماوە، چونکە هەموو هوتێلەکان بۆ کار و مەبەستیتر سوودیان لێ وەردەگیرێت. بواری تیرۆریستی، ئاخ، بواری گەشتیاری مردووە.

o ئەوە چیت گوت، بواری تیرۆریستیی مردووە؟

• نەخێر،بواری تیرۆریستیی تازە لە پەرەسەندن و گەشەکردندایە .

o کەواتە لە ئێستادا گەڕیدەیەکی زۆرتان نییە؟

• نەخێر، زۆر نین.

o دەتوانم تارادەیەك لەم قسەیەت تێبگەم. ڕاستی، كاتێك من بێمە ئەوێ، دەتوانم لەگەڵ دەرەوە پەیوەندییم هەبێت؟

• باوەڕناكەم ڕێگرییەك هەبێت. لێرە ژمارەیەكی زۆری قاوەخانە (كافی نێت[٣٥]) هەیە.

o ئێستا ژمارەی سەربازەكانتان لە دەوروبەری چەند سەرباز دەبن؟ لەم بارەیەوە چەند ئامارێكی جیاجیا بڵاوكراوەتەوە، ئەو ئامارەی كە دەڵێت نزیكەی ٣٥٠٠٠ سەربازتان هەیە، ئایا ڕاستە؟

• ڕاستییەكەی من ناتوانم ئامارێكی ڕێك و وردت پێ بدەم. ئێمە خۆمان دووپاتی دەكەینەوە كە چاودێرانی ڕێكخراوی مافی مرۆڤ لە ماوەی شەڕ و دەرگیرییەكانی سووریادا، ئامارێكی وردیان لایە. نازانم ئەم زانیاریی و ژمارانەیان لە چ سەرچاوەیەكەوە وەرگرتووە، بەڵام ئامارەكانیان لەسەر كوژراو و بریندارەكان هەمیشە ڕاست دەردەچێ. بەڵام ئاگام لێ نییە دەربارەی ئەوەی، كە ئایا ئاماریان لەسەر ژمارەی سەربازەكانمان بڵاوكردۆتەوە یاخود نا.

o بڕیار بوو ئەمڕۆ سەبارەت بە ڕۆژی سەفەرەكەم زیاتر قسە بكەین. لە ئیمەیڵێكدا نووسیوتە چەند ڕۆژ پێش شاری ڕەققە بە چڕی بۆردومان كراوە. ئایا ئەم بارودۆخ و پێشهاتانە نابێتە هۆی دواخستنی سەفەرەكەم؟

• نەخێر، بەو جۆرەش نییە. لەبەر ئەوەی فڕۆكەكان دوو باڵەخانەی نزیكی جێگەكەی منیان بۆردومان كرد، هەر بۆیە كاتێكی زۆرمان بەهۆی مەسەلەی ئەمن و ئاسایشەوە بە فیڕۆ چوو. بارودۆخ لە ئێستادا وەكوو پێشترە، ئەسەد بۆردومانمان دەكات. لە ئێستادا كەمێك پاشەكشێی كردووە بۆ ناوەندی شاری حەلەب و لەوێ جێگیر

---

٣٥- Coffe Shop ئەو شوێنەی كە خزمەتگوزاریی ئینتەرنێتی تێدایە و هەندێك جار خواردن و خواردنەوەشی تێدایە و خەڵك بۆ بەسەربردنی كاتەكانیان ڕوو لەو جێگایە دەكەن.

ـوە. لە ئێستادا ئەمریکا لە پێناوی ئەسەد بۆردومانی ئێمە دەکات. دەتوانم بڵێم ـرودۆخەکە وەکوو ڕابردوو وایە.

- ئایا شتێك هەیە من ڕەچاوی بکەم، بۆ ئەوەی شوێنەکەم ئاشکرا نەبێت؟
• مەبەستتان لە ئەمریکییەکانە.
- بەڵێ، پێم خۆش نییە ئەوان هەنگاوبەهەنگاو بە شوێنمانەوە بن. ئەوکات ـسایشی ئێوەش دەکەوێتە مەترسییەوە.
• نا پێویست ناکات نیگەرانی هیچ شتێك بیت، ئێمە مۆبایل و شەبەکەی مۆبایلمان ـییە.

- دەی کەواتە دەبێت بچینە قاوەخانە؟
• بەڵێ، چونکە پێ ناچێت ئەمریکییەکان بە ئەنقەست قاوەخانەکان بۆردومان بکەن.

- بەهەرحاڵ، ڕۆژانە تا دێت ڕەخنە لە دژی داعش توندتر دەبێتەوە. سیاسەتمەداران و میدیاکان بە دیمەنی سەربڕینەکان زۆر قەڵس بوون، ئەوان جگە لەمە باسی هاوسەرگیریی بەزۆر و دەستدرێژییکردنە سەر ئافرەتان دەکەن. ئایا ئەم بابەتانە وەکوو هاوسەرگیریی بەزۆر، لە دەوڵەتی ئیسلامییدا هەیە؟ پەرچەکرداری ڕابەری داعش بە چ شێوازێکە؟
• هەمیشە مەسەلەکە بەو جۆرەیە کە مەبەست لەم کارانە چییە. لە ئێستادا سیاسەتمەداران و میدیاکان قسە لەسەر کەنیزەك و بابەتی سەربڕین و ئەم جۆرە مەسەلانە دەکەن. بێگومان سەربڕین هەیە. ئەوەش پەیوەندی بەو تاوانەوە هەیە کە یارۆ تووشی دەبێت، ئەوکات بە ئەندازەی تاوانەکەی سەر یان دەستی دەبڕدرێت. ئەم جۆرە مەسەلانە بە ڕای من دەبێت لە شوێنێکی تر، هەندێك جار لە ڕێگەی وڵاتە

هاوپەیمانەکانەوە یاخود لە ڕێگەی کتێبە مێژووییەکانەوە یان سەرچاوەیەکی ترەوە. لێیان تێبگەیت و پێیان ئاشنا بیت و دیسان بابەتی کۆیلەداری لە ئیسلام ببینیت.

- لای ئێوەش کەنیزەک هەیە؟
- بەڵێ، بێگومان هەیە. ئێمە خۆمان بە دەوڵەتێکی ئیسلامیی دادەنێین دەسەڵاتی ئەوەشمان هەیە کە ئەم جۆرە یاسایانە لە ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵماند جێبەجێ بکەین. تەواوی یاساکانی ئیسلام لە دەوڵەتی ئیسلامی پەیڕەو دەکرێن. ئیسلام لە هەندێك بارودۆخی تایبەتدا بواری داوە سوود لە لایەنە ناموسڵمانەکان وەربگریت. بۆ نموونە ئەم یاسایە لەبارەی ئێزدییەکانەوە بەکار دەهێنرێت.

- ئەو ئافرەتانە بە کەنیزەك هەژمار دەکرێن؟
- بەڵێ.

- هەروەها مەسیحییەکانیش؟
- مەسیحییەکان دوو چارەنووسیان لە پێشە، یا ئەوەی باجوخەراج دەدەن و ئیسلام قبوڵ دەکەن، یاخود دەکوژرێن.

- ئێوە بەمە دەڵێن کەنیزەك یا هاوسەرگیریی بەزۆر ؟
- هاوسەرگیریی بەزۆر نییە، شتی لەم جۆرە نییە. بەس لە ئێستادا دەنگۆی ئەوە بڵاوە کە زۆرینەی مەسیحییەکانی شاری ڕەققە باجوخەراج دەدەن.

- بە وردی چەمکی کۆیلە لای ئێوە بە چ مانایەك دێت؟ ئایا ئەوان ماف و کرێیەکی کەمیان پێ دەدرێت؟
- هەر ئەو مافەیان پێ دەدرێت کە لە ڕابردوودا ئیسلام پێی دابوون. یاسای تایبەتیی خۆی هەیە و کۆیلەش بۆ خۆی چەند ئەرکێکی لەسەرە کە دەبێت ئەنجامیان

بدات. بێگومان لەبەرانبەردا کرێیەکیش وەردەگرێت، تەنها یەك کەس خاوەنی ئەو کەسەیە، خاوەنەکەی دەبێت پێداویستیی ژیان، جێگای نووستن، خواردن و پۆشاك و هتد دابین بکات. تەنانەت خاوەنەکەی دەتوانێت کۆیلەکەی ئازاد بکات. ئەگەر هاتوو خاوەنەکەی تووشی هەڵەیەك بێت بەرانبەری، ئەوکات دادوەر دەتوانێت وەکوو سزایەك بۆ خاوەنەکەی، بڕیاری ئازادکردنی کۆیلە و کەنیزەکەکانی بدات. وەکوو ئەوەی زانیاریم هەیە ژمارەیەکی زۆری کۆیلەکان لەئێراف ڕوویان لە ئیسلامبوون کردووە. لەبەر ئەوەی خاوەنەکانیان دەرگیری شەڕ و کێشمەکێشی سەختی ڕۆژانەن و کاتی ئەوەیان نییە مافی کەنیزەکەکانیان بدەن، هەربۆیە زۆربەیانیان ئازادکردووە.

- ئەگەر لە جێگایەك دەستدرێژیی بکرێتە سەر ئافرەتێك، چی ڕوو دەدات؟ ئەو کەسەی ئەو کارە دەکات ڕووبەڕووی سزادان دەبێتەوە؟
- مەبەستت لە دەستدرێژیکردن چییە؟
- ناچارکردنی ئافرەتێك بە سەرجێیکردن.
- ئەم بابەتە ڕێژەییە. ناچارکردن چ مانایەك دەدات؟ کاتێك کەسێك هی کەسێکی تر بێت، ناچارکردن چ مانایەکی هەیە؟

- دەی کەوایە بە ڕای تۆ دەستدرێژیکردنە سەر کۆیلەیەك بە دەستدرێژیکردن لەقەڵەم نادرێت. باشە کاتێك گوندێك داگیر دەکەن و یەکێك لەسەربازەکانتان دەستدرێژیی دەکاتە سەر ئافرەتێك لەو گوندەدا، ئەوکات چی دەکەن؟ بەداخەوە زۆرجار ئەم شتانە لە کاتی جەنگ و شەڕوشۆڕدا ڕوو دەدەن.
- ئەگەر تاوانبار لە کاتی ئەنجامدانی تاوانەکە دەستگیر بکرێت، ئەو کاتە دوو ڕێگای هەیە، ئەگەر خێزاندار بێت بەردباران دەکرێت و ئەگەریش گەنج بێت و خێزاندار نەبێت ئەوە ١٠٠ شەلاقی لێ دەدرێت. بەڵام ئەگەر بەرانبەر کۆیلەی بێت ئەوە مەسەلەکە جیاوازە.

o ئێستا سیاسەتتان بەرانبەر وڵاتی ئەڵمانیا چۆنە؟ هەندێك لە رێکخراوەکانی وەکووBNO ، BKAو دەزگای چاودێریکردنی دەستوور، باس لە ئاژاوەگێری و کاری تیرۆریستی لە ئەڵمانیا دەکەن .

• ئێوە وتارەکەی (عەدنانی)ـیتان دەربارەی ئەم بابەتە بیستووە و ڕەنگە بەدواداچوونت بۆ ڕووداو و پێشهاتەکانی وڵاتی کەنەدا، فیلیپین و هەروەها جەزائیر، کە فەڕەنسییەکانیان لەوێ کوشت، کردبێت. هەموو ئەمانە وەڵامی بانگەشەکەی عەدنانی لەلایەن خەڵکەوە بوو بۆ دەست بەکاربوون.

o کەواتە تۆش ئەگەری ڕوودانی کاری تیرۆریستی و چالاکی لە ئەڵمانیا پێشبینی دەکەیت؟

• ئێمە لە شەڕداین و ئەگەری ئەوەش هەیە هەموو ڕۆژێك شتەکان بگۆڕێن. سەرەتا گومانم هەبوو لەوەی کە بە هیچ جۆرێك هیچ ڕووداوێك لە ئەڵمانیا ڕوونادات. بەڵام دوای ئەوەی گوێبیستی وتارەکەی عەدنانی بووم، کە بانگەوازی پەرچەکرداری دژ بە تەواوی ئەو کەسانە کرد کە بەشداریی هاوپەیمانێتییەکانی دژی داعشیان کردوە. بۆچوونەکانم بە تەواویی گۆڕا. لە ئێستادا هیوادارم شتێکی گەورە ڕووبدات، ئەگەر بۆردومان یاخود هەر کردەیەکی تر بێت.

وەختێك لە سووچێکی ئەم جیهانەدا شەڕ بەرپا دەبێت، ڕۆژێك دێت کە پریشکەکانی بەر شوێنەکانیتریش بکەوێت.

o ئایا لە ئەڵمانیا چ کەسانێك دەتوانن چالاکی بکەن؟ لە ئەڵمانیا سەلەفییەکی زۆر دەژین، کە لەگەڵ کاری توندڕەویدا نین. هەر بۆیە ئەوان بە هیچ جۆرێك ئەم کارە ناکەن.

لێرەدا دیسان پەیوەندییەکانمان پچڕا. دواتر لە پاش ئاڵوگۆڕکردنی چەند ئیمەیلێکی توند و ناخۆش دەربارەی بارودۆخ و وردەکارییەکانی سەفەرەکە، جارێکی تر لە ڕۆژی پێنجشەممە ٢٠١٤/١١/١٣ دیسان لە ڕێگەی سکایپەوە گفتوگۆمان دەست پێ کردەوە:

o ئەلو؟ ئەبوقەتادە؟ بەڵێ ئێستا گوێم لە دەنگتە. تۆ ئیمەیڵی زۆر ناخۆش و توند دەنووسیت! من خۆشم لەم ئاوازی قسەکردنەت نایەت. بۆ سەختی و ناسۆرییەکانی سەفەرکردنم بۆ وڵاتەکان من هیچم لە دەست نایەت. هەرچییەك بێت ئێمە دەربارەی سەفەرێکی گرنگ قسە دەکەین، نەوەك گەشتێك بۆ ڕابواردن. جگە لەمە من بۆ خۆم بە تەنها نیم، هەندێك لە ڕۆژنامەنووسەکانی هاوڕێم داواکاریی و مەرجیان هەیە، کە من خەریکم لەسەر ئەو مەرجانە لەگەڵ تۆ قسە دەکەم. جارێ شوێنی تایبەتی خۆمت بۆ دەنووسم، دڵم پێم دەڵێت باوەڕت پێ بکەم. دواتر ئەو تەنها زەمانەتنامەیەش کە بۆت ناردووم زۆر بایەخی نییە، بەڵکوو شتێکە لە بنەڕەتدا خۆمان دەست نیشانمان کردووە.

• بەڵێ، ڕاستە.

o ڕەنگە ماوەی هەفتە و نیوێك یاخود دوو هەفتەی تر بەڕێ بکەوم. خۆ دەبینیت من متمانەم پێتە .

(قەتادە پێ دەکەنێت.)

o لەڕاستیدا لێرەدا نابێ پێبکەنیت، ڕەنگە بەهۆی ئەوەی متمانەم پێت کرد دڵت خۆش بێت. دواتر لە من دەپرسن: بۆچی ڕۆشتووی بۆ نێو دەوڵەتی ئیسلامی؟ سەفەرێك کەوا مەترسیی مەرگی تێدا بوو؟ ئەوکات دەبێت بتوانم وەڵامی خانەوادە و دۆستەکانم بدەمەوە و بۆیان ڕوون بکەمەوە. هەروەها پێشتر ئێمە دەربارەی بارودۆخەکە بە تێروتەسەلی گفتوگۆمان کردووە، کەواتە باشتر وایە چیتر بەم ئاوازە ناخۆشە ئیمەیڵم بۆ نەنووسیت، جارێکیتر وەك ئەوەی ئەمڕۆ و پێشتر کردت بەدڕەفتار نەبیت. هیچ بەهانەیەکیشت بۆ بەدڕەفتاریکردن پێ نییە، هەروەها مافی ئەو کارەشت نییە.

• زۆر چاکە، من تەنها بۆ خۆم بڕیاردەر نیم. منیش ڕەخنەم لێ دەگیرێت و دەستوورەکانی سەرەوەی خۆم جێبەجێ دەکەم. وەکوو خۆم خۆشحاڵم سەردانی ئێرە بکەیت و ڕاپۆرتێکی دادپەروەرانە ئامادە بکەیت، ئەوکات ئێمەش لەم ڕێگەیەوە دەتوانین ڕووی ڕاستەقینەی خۆمان بە هەموو جیهان پیشان بدەین. ڕەنگە تۆ لای موسڵمانە

ئەڵمانییەکان و لای موسڵمانی هەندێك لە وڵاتەکانی تریش خۆشەویست بێت. باشە منیش کاتێك کە بڕیار دەدەم، بە تەنها نیم، بەڵکوو منیش بەرپرسێکم هەیە کە ئەو پێم ڕادەگەیەنێت چی بکەم و چی نەکەم

o جارێکیتر ئەوە دووپات دەکەمەوە و دەڵێم، ڕەفتاری من لەگەڵ تۆ هەمیشە بە شێوەیەکی دۆستانە بووە، تۆش دەبێت هەر بەو شێوازە ڕەفتارم لەگەڵ بکەیت.

• باشە، لێرە بەدوا هەوڵ دەدەم.

o زۆر باش دەبوو ئەگەر ڕۆژی یەکشەممە لەسەر وردەکارییەکانی سەفەرەکە ڕێك بکەوتینایە. کات و چۆنێتی هاتنەژوورەوەم بۆ دەوڵەتی ئیسلامی بە وردیی بۆ ڕوونکردیتایەتەوە. هەروەها ئەوەش کە لە تویتەر بە نیازن کەی و چی بڵاو دەکەنەوە؟ دەبێت منیش ئاگاداری ئەو بابەتە بم.

• من ئەو نامەیە بڵاو دەکەمەوە کە بۆتم هەنارد، تەنها یەك – دوو دێڕێکی بۆ زیاد دەکەم.

o ئەگەر دەوڵەتی ئیسلامیی حاشا لەم بانگهێشتنامەیە نەکات، من وای دەبینم کە ئەم نامەیە ڕاست و باوەڕپێکراوە.

• زۆر چاکە!

o تۆ گرووپی سوفان دەناسیت؟

• نەخێر، نەمبیستووە.

o ژوورێکی توێژینەوەی ئەمریکییەکانە، ئەم گرووپە ڕاپۆرتێکی ۳۲ پەڕەییان لەسەر داعش بڵاوکردۆتەوە، کە من ئەو ڕاپۆرتەم خوێندۆتەوە. زۆر سەرنجڕاکێشە. پێ دەچێت ئەوانە زانیاریی زۆر وردیان لە لابێت. زۆرێك لەو شتانەی کە لە ڕاپۆرتەکەدا

نووسیویانە، لەگەڵ ئەو شتانەی کە تۆ گوتت، زۆر نزیکن لە یەکترەوە و تا ڕادەیەك هاوشێوەی یەکیش بوون. لە بەشی کۆتایی ڕاپۆرتەکەدا هاتووە کە لەسەردەمی نوێدا، نیاردەیەکی هاوشێوەی داعش بوونی نەبووە. ئەم ڕێکخراوە نووسیویەتی کە ڕاستەوخۆ ڕاپۆرت بۆ دەوڵەتی ئەمریکا دەنووسێت. ئەو ڕێکخراوە زۆرینەی راسپاردە و کارەکانیان لە ئەمریکاوە وەردەگرن، بە ڕای من شتێکی زۆر سەیرە!

بەڵام پرسیارێکی جودا: ئایا خەلیفە لە ئێستادا زیندووە؟ دەنگۆیەك هەبوو کە لە ئێراق هێرش بۆ سەر کاروانەکەی کراوە. پێ دەچێت بە سەختی بریندار کرابێت.

- هێشتاکە زیندووە و لە ژیاندایە.

  - بە برینداریی؟

- نەخێر، برینداریش نەبووە. ئەگەر گوێ لە هەواڵەکانی ئێراق ڕادەگری، ئەوە دەبوو هەر زوو ئەوەت زانیبا کە شتی درۆ و پڕوپووچ زۆر بڵاودەکەنەوە. ئەمەش هەواڵێکی دەبەنگانەیە. ئاخر کام یەك لە ڕابەرانی داعش بە خاڵی پشکنینی دەوڵەتی ئێراقدا هاتووچۆ دەکات، تا هێرش بکرێتە سەر کاروانەکەی؟ زۆر سەیرە دەوڵەتی ئەمریکا یاخود میدیاکان، شوێنی ئەم هەواڵانە دەکەون. ئەوان زۆرجار خۆیان دەرگیری ئەم جۆرە بابەتانە ناکەن.

  - ئەی کۆبانێ؟ کوردەکان دەڵێن لە قۆناغی پێشڕەویدان.

- نازانم مەبەستیان لە پێشڕەویکردن چییە، بەڵام دواهەواڵ کە بیستم باسی پێشڕەویی ئەوان بوو، بەس دیسانەوە پاشەکشێیان پێ کرا، هەروەها لە ئێستادا دەنگۆی دەرگیریی و ململانێ هەیە. بە ڕاستی من تێناگەم ئامانجی کوردەکان چییە، بە گومانم لەوەی کە ئەمریکییەکان ئەو کارەیان کردووە و ناوچەیەکی مێژوویی شارەکەیان تەخت و وێران کردووە. تەنانەت ئەگەریش ئێمە لەم شەڕەدا شکست بخۆین، ئەوە شتێکی وا لەم شارە بۆ کوردەکان بەجێ نامێنێت کە دڵی پێ خۆش بکەن. سەرەڕای ئەمە بەرگریکردنی ئێمە لەم شارە زیادی کردووە، وەکوو ئەو سەردەمەی کە ناچاربووین

چەندین ساڵ لە ئێراق بکشێینەوە، تەنانەت ئەو کاتەی ناچار بووین بۆ ماوەی دوو بۆ سێ ساڵ چاوەڕوان بین. بە بۆچوونی ئێمە کۆبانێ گرنگییەکی وای نییە، چیتر گەڕانەوەیەك لە ئارادا نییە.

o پێشتر گوتت چاوەڕوانی ئەوە لە من دەکەیت کە ڕاپۆرتێکی دادپەروەرانە ئامادە بکەم، بەڵام من ناتوانم بەڵێنی ئەوە بدەم کە ڕاپۆرتەکەم بە دڵی ئێوە دەبێت.

• ئەمە بابەتێکی ترە، تا ئەو جێگایەی درۆی تێدا نەبێت کێشەیەك نییە. تۆ بە چاوی خۆت لێرە ڕاستییەکان دەبینیت. بۆ نموونە ئەگەر کەسێك بنووسێ دەوڵەتی ئیسلامی لە شاری ڕەققە بەهۆی کاری داوێنپیسییەوە پێنج کەسی کوشتووە، ئەوە کێشە نییە و بە لای ئێمەوە گرنگ نییە، تەنانەت ئەگەر ئەم گوتە لە ڕۆژئاوا وێنەیەکی ناشرین لە ئێمە دروست بکات، بەڵام ئەگەر بابەتێك لە خۆتەوە دەربێنیت و بینووسیت یاخود درۆیەك لەسەر ئێمە بڵاوبکەیتەوە، ئەوکات مەسەلەکە جیاوازە .

• **دەربارەی ئەمە چەند جاریتریش قسەمان کرد، کە دیدی من دەربارەی داعش دیدێکی ڕەخنەگرانەیە. بەهەرحاڵ دەتوانم بەڵێنی ئەوە بدەم کە هیچ کات حەزم بە بڵاوکردنەوەی چیرۆك لە سەر داعش نییە. من هەرگیز پێشتریش کاری لەم جۆرەم نەکردووە. ڕەنگە خۆتان بزانن من پێشتر لای تالیبان بوومە و زانیاریتان لەسەر ئەوەش هەیە کە بە درێژایی جەنگی ئێراق لە نزیکی هێزە بەرگریکارە ئێراقییەکان بووم. ئەو کات لەگەڵ بەرپرسی باڵای ئێوە چاوپێکەوتنم کردووە. ئەو کاتە ناویی گرووپی ئێوە دەوڵەتی ئیسلامی ئێراق بوو.**

• **ئەوکات کێ بانگهێشتنامەی بۆ دەرکردن؟**

o هیچکەس، ئەو ڕۆژانە گەورەترین کێشەم ئەوە بوو نەمدەتوانی بە لای هێزە ئەمریکییەکاندا تێپەڕم. لە ڕوومادی لە لای شەڕکەرێکی بەرگریکاری ئێراقی بووم. لەسەر ئەو گەنجە کتێبێکم نووسیووە بە ناونیشانی ( زەید، بۆچی دەکوژی؟) زەید هەرگیز خۆشحاڵ نەبوو بەوەی کە شەڕکەرێکی بەرگریکار بێت لە ئێراقدا، بەڵام یەکێك لە براکانی

بە بەرچاوییەوە بە دەستی ئەمریکییەکان کوژرابوو، پاش ئەوە برایەکی دیکەشی. ناچار هەموو شەوێك لە کەناری پەنجەرەی چێشتخانەکەیان بیر لە چۆنێتیی کوشتن و خوێنڕشتنی براکەی لە لایەن ئەمریکییەکانەوە بکاتەوە. هەر بۆیەش ڕێگای بەرگریکاریی دژی ئەمریکییەکان هەڵبژاردبوو. ئەو زرییۆشێکیشی تەقاندبوویەوە، من بۆ ماوەی هەفتەیەك لای پیاوێکی لەم جۆرە بووم.

پێ دەچێت کوڕەکەشم لەگەڵما بێت بۆ دەوڵەتی ئیسلامی. ئەو کاری تۆمارکردنی ڤیدیۆکان لە ئەستۆ دەگرێت. لە هەوڵی ئەوەداین کە کەسی سێیەمیش پەیدا بکەین، بەڵام ئەمە کارێکی ئاسان نییە. کەس متمانە و باوەڕی بەوە نییە بە زیندوویی بگەڕێینەوە.

یەکشەممەی دوای ئەوە، ڕۆژی ٢٠١٤/١١/١٦ دیسان پێکەوە قسەمان کرد:

- سڵاو، گوێت لێمە؟
- o گوێم لێیە، فریدریکیش لێرەیە.
- من دەبینیت؟
- o بەڵێ، کەشوهەوا چۆنە؟
- ئەمڕۆ کەمێك سارد بوو.

- o ئەو فرۆکەخانەیەی کە قەرارە لێی بنیشینەوە، غازی عەنتابە؟
- بەڵێ، پێ دەچێت ئەو دەروازەیە هەڵبژێرین و لەو دەروازەیەوە ئێوە بێنینە نێو دەوڵەتی ئیسلامییەوە.

- o تا فرۆکەخانە چەندە ڕێگا دەبێت؟
- نازانم، لەنێوان غازی عەنتاب و سنووردا شارێکی بچووکی دیکەش هەیە، بە ناوی کیلس. پێم وایە بە ترۆمبێل تاکوو سنوور یەك کاتژمێر ڕێگا دەبێت .
- o دەتوانیت بۆ ئەم دیوی سنوورەکە بێیت؟ لە لای تورکیاوە دەڵێم.

- بۆ خۆم ناتوانم، بەڵام پیاوەکانمان دێن.

o خۆت نایەیت؟

- زۆر مەترسیدارە، بەڵام لەمدیوی سنوور دێمە پێشوازیتان.

o دەتوانم بچمە موسڵ؟

- لە ڕووی تیۆرییەوە بەڵێ. نازانم تۆ دەتەوێت بۆ چەنێك بمێنیتەوە.

o موسڵم خۆش دەوێت، حەز دەکەم بیبینم. چونکە من ئەم شارە دەناسم. ئەگەر بکرێت سەردانی بکەم، ئەوکات دەتوانم بارودۆخی ئێستا و ئەوسای شارەکە بە باشی بەراورد بکەم.

- ئەمە کارێکی ئەستەم نییە، ڕێگای موسڵ هەمیشە کراوەیە. لێرەوە تا موسڵ بە ئۆتۆمبیل نزیکەی ٥ کاتژمێر ڕێگا دەبێت، ئەگەر کێشەیەك دروست نەبێت.

o دەزانیت کە ئێمە سەبارەت بە زۆرێك لە بابەتەکان بیروبۆچوونی جیاوازمان هەیە و هاوڕا نین. من مەسیحییم و تۆش موسڵمانیت. چاوەڕێ بووم بەرانبەر بەو کەسەی کە ئایینەکەی خۆی گۆڕی بوو، کە ئەمڕۆ لەلایەن داعشەوە کوژرا، کەمێك بەخشندەیی بنوێنن. بە هەرحاڵ ئەمە دینەکەی بۆ ئیسلام گۆڕیبوو و بۆ پەرەسەندن و تەشەنەکردنی ئایینی ئیسلام کاریگەر دەبوو. ئەم جۆرە کوشتنانە هیچ دەرئەنجامێکی باشی نابێت.

- ناوی چی بوو؟ پێم وایە (پیتەر) دەڵێی. ناوەکەیم لە بیر چووەتەوە. دەلیلی کوشتنەکەی زۆر ئاشکرایە. موسڵمانی ڕاستەقینە دەبێت هەڵگری کۆمەڵێك تایبەتمەندیی بێت. بۆ نموونە دەبێت مەزهەبەکەی خۆمان بە باشی بناسین و هیچ زاتێك جگە لە الله شایەنی پەرستن نییە و محەمەدیش (درودی خوای لەسەر بێت.) پێغەمبەری خوایە. موسڵمان دەبێت هەڵگری ئەم دروشمە بێت. لە ڕاستیدا پیتەر موسڵمانی ڕاستەقینە نەبوو، ئێمە هەر لە سەرەتاوە پیتەرمان بە موسڵمان نەدەزانی. دەنگۆی موسڵمانبوونی ئەو لە دوای بەشداریکردنی لە جەنگی ئێراق، تەنها پروپاگەندەی میدیا ڕۆژئاواییەکان

بوو. ئەو دەبووایە دەستی لە دەستێوەردانی کاروباری ئێراق هەڵبگرتایە، تاوەکوو بانگەشەی ئیسلامبوونەکەشی پەسەند بکرێت، بەڵام پیتەر ئەم کارەی نەکرد، سا ئەمە بووە مایەی بە کافرزانینی لەلایەن ئێمەوە .

وڵاتی فەڕەنسا لە بەرانبەر بارمتەکانی پارەی داوە. دواتر بارمتەکان لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە دەرکەوتن و لاف ئەوەیان لێ دەدا دەیانگوت:"لە کاتی دەستگیرکردنماندا وامان پیشان داوە کە موسڵمان بووینە، ویستمان کڵاو لەسەر داعش بنێین." فەڕەنسییەکان نەیاندەزانی کە ئەم مەسەلەیە بۆ ئێمە ئاشکرا بووە. زیندانییەکان لە حەمامەکاندا پەیامیان بۆ یەکتر دەنارد. کۆنترۆڵکردن و چاودێریکردنی حەمامەکان بووە مایەی ئاشکرابوونی ئەم پەیامانە. ئەوان بۆ یەکتریان دەنووسی: "ئیسلام قبوڵ دەکەین و دەبین بە ئیسلام، بۆ ئەوەی لێمان بگەڕێن و کاریان بەسەر کارمانەوە نەبێت." بە سادەیی بیڵێم ویستیان فێڵمان لێ بکەن. فەڕەنسییەکان بەختیان هەبووە لەوەی کە وڵاتەکەیان پارەیەکی زۆری لە پێناویاندا داوە، بەڵام وڵاتەکانی دیکە هاوڵاتییەکانی خۆیانیان پشتگوێ خست. دەی لە ئاکامدا هاوڵاتییەکانیان کوژران.

o هاوکارییان بۆ تەشەنەکردن و فراوانبوونی ئایینی ئیسلام خراپی چی بوو؟

• مەسەلەکە بۆ خۆی کێشەی نەبوو، بەڵام لە ئیسلامدا هاتووە جگە لە چەند حاڵەتێکی کەم و شاز، خوێنی کەسانی بێدین پارێزراو نییە. حاڵەتی یەکەم: ئەگەر ئەو لە وڵاتێکی موسڵماندا بژێت و هەموو ساڵێك چەند سەد دۆلارێکی ئەمریکی وەك جەزیە بدات. حاڵەتی دووەم: دەبێت ئەو کەسە لەژێر کەفالەتی کەسێکی موسڵماندا بێت. یاخود حاڵەتی سێیەم، وەختێك ئەو کەسە ئیسلام قبوڵ بکات و موسڵمان بێت، تا لەم ڕێگەیەوە گیان و ماڵی پارێزراو بێت. بەڵام ئەوان ئەم مەرجانەیان تێدا نەبوو. هیچ یەکێکیان خاوەنی ئەمانەتنامەیەکی باوەڕپێکراو نەبوون. ئەگەرچی لە ڕێگەی سەرۆکی یەکەمی NGO-mann پیتەر کاسیگیان هاندا بۆ ئەوەی ئەم ڕۆڵە ببینێت و بانگەشەی ئەوە بکات لەلایەن سەرۆکی یەکەمی ڕێکخراوێکی ئیسلامی و هاریکاریی مرۆڤدۆستانەوە

پشتگیریی لێ دەکرێت. کێشەکە ئەوە بوو، ئەو دەمە دەوڵەتی ئیسلامی نەبوو، هەروەها لە ناوچەی جەنگیشدا بواری پاراستنی هیچ کەسێك نییە. تەواوی ئەمانەتنامەکان، تەنانەت ئەگەر تایبەتیش بن بە کەسێکی موسڵمانەوە، لە ساتەوەختی شەڕکردندا هەڵدەوەشێنەوە. چونکە لە کاتی شەڕوشۆڕدا بواری پاراستنی هیچ کەسێك نییە.

o لۆژیکێکی زۆر سەیرە. تۆ دەڵێی هەر لەگەڵ ئەوەدا کە توانای ئەوەتان نەما پارێزگاریی لە کەسێك بکەن، زەمانەتنامەکەش هەڵدەوەشێتەوە، بەڵام ئێوە پاش دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی توانای ئەوەتان هەبوو پارێزگاریی لە کاسیك بکەن. بەم پێیە بێت ئیتر زەمانەتنامەکەی تۆ بۆ من و فریدریکی کورم چ بەهایەکی هەیە؟

• من گوتم، چۆنێتیی پاراستنی ئەو کەسانە بەم جۆرەیە: ا) وەختێك لە وڵاتێکی ئیسلامیدا ئەو کەسە جەزیە بدات لە پێناوی پاراستنیدا. ب) یاخود موسڵمانێك ببێت بە پارێزەری و لەم بارودۆخەدا پارێزگاریی لێ بکات. ئێوە لەلایەن دەوڵەتی ئیسلامییەوە پارێزگاریتان لێ دەکرێت، هەروەها لە لایەن نووسینگەی خەلیفەوە نامەی پاێزگاریکردنتان دەردەچێت و ئێمە خۆمان هەموو شتەکان ڕێك دەخەین.

o بەڵام خۆ ئێوە ئێستا لە شەڕدان، ئایا ڕەزامەندینامەکەی ئێوە لە شەڕدا ئیعتیباری هەیە؟

• بێگومان. بە بۆچوونی ئێمە ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵمان بە قەڵەمڕەویی دەوڵەتی ئیسلامی لەقەڵەم دەدرێن. مەبەستم لەوەیە کە لێرە هیچ شەڕێك لە ئارادا نییە. تەنها شەڕێك کە لە ناوچەکەیە بریتییە لە بۆردۆمانی فڕۆکەکانی ئەسەد و ئەمریکا. ئێمە پێشتر بەڵێنماندا کە لەلایەن ئێمەوە سەدا سەد دڵنیا بن کە ڕووبەڕووی هیچ ڕووداوێکی ناخۆش نابنەوە. بەڵام ئەگەر بۆمبێك لە ئاسمان بەربێتەوە، ئەوکات ئێمە هیچ شتێکمان لەدەست نایەت. بێگومان ئامانجی ئەوان لەو بۆردومانە ئێمەین، بەڵام لەم کەینوبەینەدا ڕەنگە بەر ئێوەش بکەوێت. نیگەران مەبە، بێگومان ئێمە تۆ لە پێگەیەکی سەربازیی دیاریکراوی وەهادا دانانێین کە بۆ بۆردومانی ئەمریکاییەکان گرنگ بێت .

o باشــە هەرچــەندە شــەڕ بــەردەوامی هەیــە و لەگــەڵ ئەوەشــدا بۆردومــانی فرۆکەکانیش بەرفراوانە، ئایا ئەمریکییەکان ناتوانن شوێنی ئێمە بدۆزنەوە؟

• تا ئەو کاتەی دەزگای (جی، پی، ئێس)ـتان پێ نەبێت، پێم وانییـە جێگەکـەتان بدۆزنەوە. دڵنیابن لەوەی کە دەتوانن تەواوی کەرەستە هونەریی و ئامێرە پێوەستەکانی سەفەرەکەتان لەگەڵ خۆتان بێنن. ڕەنگە ئێوە باشتر ئاگاداری ئەوەبن کە ئەمریکییەکان توانای ئەنجامـدان و ئەنجامنـەدانی چ کارێکیـان هەیـە. ئێمـە ئـەم مەسـەلەیە لـە ڕێگـەی هێرشــە ئاسمانییەکانــەوە دەبیــنین و تێبینیــی دەکــەین. لــە ڕاســتیدا ئەمریکییــەکان لێهـاتوویی و لیاقــەتیان نییــە. زۆرینــەی ئــەو باڵەخانانــەی کــە بۆردۆمانیــان کــردووە و سووتاون، خاڵی بوونە و ئێمە چەند مانگێك دەبێ کە چیتر بەکاریان ناهێنین و سـوودیان لێ وەرناگرین. زۆرێکی تـر لـەو جێگایانـە وەك ئـەوەی ئەمریکییـەکان حـەزیان لـێ بـوو، وێران نەبوونە .

فریدریك دەیپرسی، منیش پرسیارێکم هەیە: جان کانتلی، زیندانییە بەریتانییەکە، کـە هەموو هەفتەیەك یەکجار ئەم بەرنامە تەلەفزیۆنییەتان بۆ دەسازێنێت، لەسـەر کارەکـەی بەردەوام دەبێت؟ یان ڕۆژێك دێت ئازاد دەکرێت؟ یاخود لە دوایین بەرنامەیدا دەیکوژن؟

• (پێ دەکەنێت.) ناتوانم وەڵامی ئـەم پرسـیارە بدەمـەوە. نـازانم دەیانـەوێ چـی بەسەر بێنن. باوەڕیش ناکەم لە ملی بدەن. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەویش لـە یەکـەمین زنجیرەدا دووپاتی کردەوە کە دەسـتگیرکراوە و مەحکومـە بـە کوشـتن. لـە ڕێگـەی ئـەم زنجیرە تەلەفزیۆنییەوە دەتوانێت پەردە لەسـەر ئـەو شـتانەی، کـە ئێمـە بـۆی پێشـنیار دەکەین، هەڵماڵێت. هـەر بۆیـە دەتـوانێ ماوەیـەکی زیـاتر زینـدوو بمێنێ، بـەڵام نـاتوانم وەڵامی ئەوە بدەمەوە کە ئایا دواجار دەکوژرێت یاخود نا .

o بە کوشتنی کانتلی هەموو ئـەو شـتانەش پووچـەڵ دەبێتـەوە کـە لـە گەمەکـەی ئەودا مەبەستتان بووە.

پرسیارێکی هونەریی دیکە: تۆ دەڵێی ئێمە لە نووسینگەی خەلیفەوە بانگهێشت کراوین. ئایا کەسێکی دیاریکراو بانگهێشتی ئێمەی کردووە؟ بۆ نموونە تۆ بەو کارە هەستاوی؟ یان ئەو کەسەی کە بانگهێشتنامەکەی ئیمزا کردووە؟ چونکە دواتر کەسێکی دیکە دێت و باس لەوە دەکات کە ئەو کەسەی بەم کارە هەستاوە، هەرگیز مافی ئەوەی نەبووە کە ئیمزا لەسەر شتێکی وەها بکات.

• لێرەدا زۆر کەس بەشدارییان کردووە. دەربارەی ئەم مەسەلەیە لە ئاییني ئیسلامدا دیدگایەکی گرنگ هەیە، ئێمە هەوڵ دەدەین فێڵ لە مرۆڤەکان نەکەین. لە یاساکانی خوای گەورەدا هاتووە کە ئێمە وەختێك بەڵێن بە کەسێك دەدەین، هەموو کارێك دەکەین بۆ ئەوەی بەڵێنەکەمان بەجێ بێنین و نەیشکێنین. تۆ یەکەمین کەسیت کە لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی خەلیفەی نوێ یان ڕاستتر بڵێم دەوڵەتی ئیسلامیی نوێدا بانگهێشتنامەی لەم جۆرەت پێ دەدرێت و بێگومان بۆ ئێمەش زۆر گرنگە کە ئەم کارە سەربگرێت و هیچ کێشەیەك لەم نێوانەدا دروست نەبێت، هەروەها بۆ ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان میدیاکان نەڵێن: تەماشاکەن، ئەوانە بەناوی خەلیفە و بەناوی الله وە لەسەر بابەتێك ڕەزامەندی دەردەبڕن و بە نووسینیش بەڵێن دەدەن، بەڵام دواتر لەژێر پێی دەنێن.

o ئایا دەتوانم وێنەی ئەسڵیی بانگهێشتنامەکە وەرگرم؟

• زۆر سەختە و بە تایبەتیش زۆر چاوەڕواننەکراوە. بەداخەوە ئێمە پۆستەوگەیاندنمان نییە کە شتەکان بۆ ئەودیوی سنوور بگوێزێتەوە. هەرکاتێك گەشتیتە ئێرە، وێنەی ئەسڵیی نامەکەتان پێ دەدەم، هیچ کێشەیەك نابێت.

o لە کۆتاییدا دەمەوێت ئەوە بڵێم لەو کتێبەی کە من دەمەوێت بینووسم، تۆ ڕۆڵێکی زۆری تێدا دەبینیت، ئێمە پێکەوە گفتوگۆمان زۆر کردوە.

• (پێ دەکەنێت.) کە هاتیت بۆ ئێرە ئەمجارە بە چاوپێکەوتنی ڕاستەوخۆ لەسەر تەواوی ئەو شتانەی کە دەتەوێت بینووسیتەوە، گفتوگۆ دەکەین.

سەرلەبەیانی ٢٠١٤/١١/٢٧ تەلەفۆنەکانمان هێندە گەرم بوون، وەختە بسووتێن. بی، بی، سی/ سی، ئێن، ئێن/ فەڕەنسا٢ و باقی ڕاگەیاندنە دەرەکییەکان تەلەفۆنم بۆ دەکەن. وادیارە داعش لە تویتەر ئەو هەواڵەی بڵاوکردوەتەوە کە گوایە من لەنێو دەوڵەتی ئیسلامیدام، یاخود لەوێ بوومە. ئێمە دەربارەی بەرواری بڵاوکردنەوەی هەواڵەکە هیچ قەول و قەرارێکمان نەبوو. سەیرە، دەستپێکردن و سەرەتایەکی باشە!

فێردی تویتەر دەکاتەوە تا ببینێت چی باسە. لە ڕاستیدا تەنها توانی چەند نامەیەك بدۆزێتەوە. وادیارە یەکەمین پەیام لەلایەن ڕامی ئەیلوللا[٣٦] وەیە. پەیامێکی نهێنیی. وادەردەکەوێت ڕامی نەك هەر ئەوەی کە پەیوەندییەکی زۆر باشی لەگەڵ داعشدا هەیە، بەڵکوو بەردەوام زانیاریی شاراوە و نهێنیی دەزگای ئاسایش بڵاودەکاتەوە. ئەو بانگەشەی ئەوە دەکات کە زۆرێك لە هێرشە ئاسمانییەکان بەر ناوچەکانی دەرەوە کەوتوون. ئەو کەمێك پێش کاتژمێر ٨ـی بەیانی ئەم هەواڵەی لە تویتەر بڵاوکردووەتەوە:

( داعش ڕایگەیاندووە بەڵێنی پاراستن و مۆڵەتی بە یورگن تودنهوفەر، ڕۆژنامەنووسی ئەڵمانی و تیمەکەی داوە بۆ ئەوەی ڕاپۆرتێك لە ئێراق و سووریا ئامادە بکات.)

لە تویتێکی تردا دەنووسێت:

" سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانی داعش ئەم هەواڵەیان پشتڕاست کردۆتەوە. سەرەڕای ئەمەش، تا ئێستا بڵاوکراوەیەکی فەرمیی لەسەر ئەم بابەتە، نە لە لایەن تودنهوفەر و نە لە لەلایەن داعشەوە، لە بەردەستدا نییە."

کۆمێنتی نەیارەکان خێرا گەیشتن. زۆرێکیان ئارەزووی ئەوە دەخوازن کە بە زوویی تەماشای سەربڕینی ئێمە لە تازەترین گرتەی ڤیدیۆیی داعشدا بکەن. (ئومێدەوارم هەرگیز نەگەڕێتەوە.) کەسێکی دیکە دەپرسێت: "ئایا بە سەلامەتی دەیگەڕێننەوە."

---

36- Rami AlLolah

بێوێنە فریودراین، چ بیرۆکەیەکە، ئێمە بانگهێشت دەکەن و پەشیمان دەبنەوە و لە گەردنمان دەدەن.

نەیارەکانم بە ناردنی لێکۆڵینەوەکانم لەسەر مەسەلەی داعش، ڕامی اللە و ئەو کەسانەی کە هەواڵەکەیان لە تویتەر بڵاوکردبوویەوە، هەراسان کردبوو. "دەزانی تۆدنهۆفەر لە مانگی جانیوەری دەربارەی ئەسەد، داعش و نوسرە چی بابەتێکی نووسیوە؟" لینکێکی زۆری چاوپێکەوتنەکانم لەگەڵ ئەسەد دادەنێن. "بە ڕاستی دەزانن کێتان بانگهێشت کردووە؟ تودنهوفەر دژی تیرۆریستە و دۆستی بەشار ئەسەدە." وادیارە جارێك کەس لەنێو داعشدا گوێ بەم مشتومڕانەی تویتەر نادات، بەڵام ئەبوقەتادەش بەردەست نییە."

فریدریك تورە بوو. ئەو چەندین جار دەربارەی فێڵ و فریوەکانی داعش هۆشداریی بە من دابوو، هەر لە سەرەتاوە ئەم سەفەرەی بۆ قەڵەمڕەویی دەوڵەتی ئیسلامی بە شێتیی دادەنا. ئەو چرکەبەچرکە دیارترین بابەت و نووسینەکانی ئینتەرنێتم بۆ دەخوێنێتەوە. هاوکات لەنێوان چەند خولەکێکدا دەزگایەکی ڕاگەیاندن زەنگم بۆ لێ دەدات. کەمێك پێش ئەوەی بچینە نێو دەوڵەتی ئیسلامییەوە، فریدریك هەواڵێکی پەرێشانکەر و ناخۆشی لە تویتەر بۆ خوێندمەوە. ژنێك لە لایەنگرانی داعش لە سووریا بۆی نووسیبووین، هیوادارم ڕۆژێك کەسێکی ناوداری[37] ڕۆژئاواییم دەست بکەوێت، هەر بۆیە بە بیستنی ئەم هەواڵە چاوەڕوانی بەدیهاتنی هەرچی زووتری هیواکەیەتی.

بە تورەیی ئیمەیلێکم بۆ ئەبوقەتادە نووسی و دواجار لە ڕۆژی ٣٠/١١/ ٢٠١٤ جارێکی تر لە ڕێگای سکایپەوە دەستمان بە گفتوگۆ کردەوە:

- وام دەزانی مووشەکێکی ئەمریکایی یاخود سووریی داوێتی بە تەپڵی سەرتدا و لەناوی بردوویت.

- نا، سوپاس بۆ خوا، هێشتاکە.

---

37- 37 VIP

o ئێستا شاری ڕەقەە لەژێر بۆردومانی چڕوپڕدایە؟

• ڕۆژانە ئەسەد بە خەستی شاری ڕەقەە بۆردومان دەکات. هەموو ڕۆژێك. سێ ڕۆژ پێش ئێستا کەمێك بۆردومانەکان توندتر بوون، نزیکەی نۆ مووشەك لە هەر ڕۆژێکدا، بەڵام لە ڕۆژانی دواتر کەمێك ئارامتر بووەتەوە، پێشتر نزیکەی یەك – دوو مووشەکێك بوو، بەڵام لە ئێستادا بۆردومانەکان زۆر چڕوپڕە.

o بەداخەوە لێرەش بارودۆخەکە زۆر ئاڵۆزە. تۆ بەبێ مۆڵەتی من دەنگۆی سەفەرەکەی منت لە تویتەر بڵاوکردۆتەوە. هەڵەیەکی زۆر گەورە ڕوویداوە. هەربۆیە بەو ئاوازە توندە بۆتم نووسی. ئێستا میدیاکان ئاگاداری سەفەرەکەمن و چی تر هەرگیز ناتوانم بچمە دەرەوە، چۆن بتوانم دوور لە چاودێریی و سەرنجی دەوروبەر سەفەر بکەم؟ من نەك بە تەنها لەگەڵ میدیا ڕۆژئاواییەکان، بەڵکوو لەگەڵ تەواوی دامودەزگاکانی زانیاریی و ئاسایشی ڕۆژئاوادا لە پەیوەندییدام و لەژێر زوومی[٣٨] چاودێریی ئەواندام. هەواڵە فەرمییەکەتان لە تویتەر نادۆزمەوە.

• هەوڵم دەدا یەکەمین ئەو کەسانەی کە لەمبارەیەوە دەنووسن، پەیدا بکەم. پێشتریش بە خۆتم گوتبوو کە چی تر ئێمە لاپەڕەی فەرمیمان لە تویتەر نییە. بەڵکوو تەنها چەند کەسێکمان هەیە کە بابەتەکانمان لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بڵاودەکەنەوە. دەی ڕووداوی ناخوازراوی لەم جۆرە هەر ڕوو دەدات.

پەیوەندییەکەمان لێرەدا دەپچڕێت، بەڵام هەر ئەو ڕۆژە دیسانەوە دەست پێ دەکاتەوە.

o وادیارە بۆ میدیاکان شتێکی زۆر سەیرە. لە ئێستادا هیچ یەك لەو میدیایانە چیتر بە دەردی من ناخۆن و سوودیان بۆ من نییە. سی، ئێن، ئێن/ بی، بی، سی/ بیلد،

---

38- Zoom

ئشپیگڵ، هەموویان زەنگم بۆ لێ دەدەن. تەلەفزیۆنی فەڕەنسا شەو کاتژمێر سێ زەنگیان بۆ منداڵەکانم لێ داوە .

فردریک دەپرسێت: بەداخەوە باوکیشم چەند ناحەزێکی هەیە. وەختێک لە کێشمەکێشەکاندا لەگەڵ هەردوو لایەن سەبارەت بە هەر بابەتێك قسە دەکات، "تاڵیبان ئەفغانستان، سەرکۆماری سووریا و شۆڕشگێڕان" لایەنەکەی تر نارەحەت و دڵتەنگ دەبێت. ئێستا کەسانێك هەن کە دەڵێن: "چیی؟ تودنهوفەر؟ ئەم خوێڕییەتان بانگهێشت کردووە! ئەو پێشتر لای ئەسەد بوو، لەگەڵ ئەو گفتوگۆی کردبوو." دەی ناکرێت دواتر بڵاوتان کردبایەتەوە، ئاخر ئێمە ئاگادار نەبووین.

• ئەوە قسەی بێمانایە، ئێمە ئاگامان لە هەموو شتێکە. دڵنیابن من و ئەوانەی سەرەوەی منیش کارەکانی باوکتمان تاوتوێ کردووە. ئاشکرایە هەمیشە ئەو شتەی دەنووسرێت ڕەنگە بە کامی ئێمە نەبێت. ئێمە بە وردیی بەدواداچوونمان بۆ کارەکانی ئێوە کردووە. ئێمە تەنها خوازیاری ئەوەین ئێوە تەنها ڕاستییەکان پیشان بدەن و بەس.

o بەڵام شتێك ماوە بیڵێم، با ئیتر بە ڕاشکاویی قسە بکەین، ئەوەش بریتییە لەوەی من لە نووسینەکانمدا بە توندیی ڕەخنەم لە داعش گرتووە. ئەمە دەزانیت یان نا ئەمجارەیان بە ڕاشکاویی لێت دەپرسمەوە.

• بەڵێ بێگومان دەزانم. ئاشناییم لەگەڵ نووسین وچالاکییەکانتان هەیە. لەگەڵ ئەوەی کە نووسینەکان هەڵگری دیدێکی ڕەخنەگرانەن، بەڵام پێم وایە زۆرینەی موسڵمانان تۆ وەك ڕۆژنامەنووسێکی ڕاستگۆ دەناسن. ئەم تایبەتمەندییە بۆ خۆی بەهانەیەکی باش بوو بۆ ڕازیبوون لەسەر سەفەرەکەت بۆ ئێرە. تۆ دەتوانیت ئەو شتە کە لێرە دەیبینیت، بیکەیت بە ڕاپۆرت. هەر شتێك بێت. تۆ ئێستا باسی لاپەڕە تویتەرێکت بە ناوی "ڕەقفە رووبەرووی کوشتنوبڕی خامۆش بووەتەوە) کرد. لە لاپەڕەیەدا خەڵکانێکی تێدایە کە دانیشتووی شاری ڕەققەن، ئەوانە وێنە دەگرن و بابەت دەنووسن، ئەگەرچی لە شوێنی کارەساتەکان دەژین، بەڵام ئەوانە خەریکن

ـرۆهەڵبەستنن. باوەڕناکەم مەبەستی ئێوە لە هاتن بۆ ئێرە قسە و درۆهەڵبەستنە بێت. ئێمەش هەر ئەم داوایەمان لە تۆ هەیە ..

o دەمانتوانی هەر لە ئەڵمانیا قسەلۆکەکانمان دابڕێژین، ئەوکات پێویستیشی نەدەکرد بێین بۆ ئەویٚ.

• کێشەکە هەر ئەمەیە. ئێمە دەزانین تۆ ناتوانیت بە حەزی ئێمە ڕاپۆرتەکەت ئامادە بکەیت. ئەسڵەن هەندیٚ کێشە هەیە کە ناموسڵمانەکان ناتوانن درکی پیٚ بکەن. بۆچی کەسێك لە نێو ترۆمبێلێکدا دادەنیشێت و خۆی دەتەقێنێتەوە؟ کەسێکی ناموسڵمان هەرگیز لەم شتە تێناگات، هەر بۆیەش ناتوانن ئەم جۆرە نووسین و ڕاپۆتانە بەو شێوەیەی کە ئێمە دەمانەوێت، بڵاوبکەنەوە، بەڵکوو ئەم جارەیان تۆ بتوانیت گوزارشت لە ڕاستییەکان بکەیت.

o من هەمیشە لەم پێناوەدا هەوڵم داوە. کاتێك کە لای ڕابەری تاڵیبان بووم، دەربارەی هێرشە خۆکوژییەکان گفتوگۆمان کرد. پێم گوت ناتوانم لە بابەتێکی لەم شێوەیە تێبگەم و بۆچوونم بە تەواویی لەگەڵتان جیاوازە. ئەوان ئەمەیان پەسەند کرد و تاڕادەیەکیش ڕێزیان لە نووسین و بۆچوونەکانم گرت، دواتر سەرلەنویٚ منیان بانگهێشتکردەوە. منیش سەبارەت بەوان بە شێوەیەکی دادپەروانە بابەتەکانم نووسی، ئەوانیش ڕێزیان لەو بۆچوونەی من گرت، گوتم لەگەڵ هێرشە خۆکوژییەکان هاوڕانیم و هاوڕاش نابم.

لەکاتی گفتوگۆکەماندا دەنگی تەقینەوەی گەورە دەبیسترا و ئەبوقەتادەش تووڕە بوو.

• داوای لێبوورن دەکەم لێرەدا دەبێت بە خێرای کۆتایی بە گفتوکەمان بهێنم. دەتوانین بۆ کاتێکی تر، یاخود بۆ سبەی دیسانەوە گفتوگۆ بکەین؟ دیسانەوە میوانمان بۆ هاتووە. چەند فڕۆکەیەك لێرەن، ڕێك بەسەر سەرمانەوە هاتوچۆ دەکەن.

o زۆر چاکە! زۆر بە کورتی بیڵێم: بەرنامەکانتان چۆن داڕشتووە؟ کیٚ دەتوانێت بە دوامانداا بێت؟ چی کاتێك دەتوانین بە ڕیٚ بکەوین؟

• دەتوانن هەر لە ئێستاوە بە ڕێ بکەون. هەر ئەو ڕۆژەی کە گەشتنە تورکیـ ئێمە دەتوانین لە سەر سنوور بتانپەڕێنینەوە.

o لە سبەی بە دواوە دەتوانین بە ڕێ بکەوین؟

• بەڵێ. لەم بارەدا باشتر وایە بە تەلەفۆن یاخود لە ڕێگەی ئیمەیڵەوە ئاگادارە بکەنەوە کە گەیشتوون و ئامادەی پەڕینەوەن لە سنوور. ئەوکات ئێمەش بە دواتانـ دێین.

o کەواتە ئێستا ناکرێت زانیاریتان پێ بدەم کە گەشتەکەمان کەی دەست پێ دەکات؟ واتە دەبێت دوای گەیشتنم پەیوەندیتان پێوە بکەم؟ بە بۆچوونی ئێوە ئەم گەشتە پێویستی بە چەند ڕۆژ دەبێت؟

لە کاتی قسەکردنمان دەنگی تەقینەوەی گەورە دەهات.

o خۆتان بگەیەننە شوێنێکی پارێزراو.

• زۆر باشە دەتبینمەوە.

# بەشی هەشتەم

## سەفەر بۆ قەڵەمڕەوی "دەوڵەتی ئیسلامی"

**مێڵە گشتییەکانی مۆتەکەیەک....**

زارەکانم هەڵدابوو و بڕیاری خۆم دابوو. حەوت مانگی ڕەبەق ڕۆژ نەبوو لەگەڵ خۆمدا بۆڵەبۆڵ نەکەم لەسەر ئەوەی، کە ئایا بڕیاری چوونمان بۆ قەڵەمڕەوی دەوڵەتی ئیسلامی کارێکی ژیرانەیە؟ لەلایەکیشەوە ڕۆژ نەبوو شتێك سەبارەت بە دلڕەقی و بێبەزەییەتی کردەوەکانی داعش نەبینم و نەخوێنمەوە. زۆرجار لە کاتی نووستندا هەستم دەکرد کەسێك چەقۆیەکی کولی ناوەتە گەردنم و خەریکە سەرم دەبڕێت. پاشان ڕادەچڵەکام و بە پەرێشانی بەرەو لای پەنجەرەی نیشمەنەکە دەچووم و لە پەنجەرەکەوە تەماشای تاریکی شەوم دەکرد و لەو تاریکییە ڕادەمام. بیرم لەوە دەکردەوە ئایا لەم سەفەرەدا گەڕانەوەیەك هەیە؟ ئایا دەکرێ متمانە بە بەڵێنی ئەم تیرۆریستانە بکرێ؟ لەلایەکەوە لە ڕێگەی دۆستە ئێراقییەکانم لە ئەنبار ئاگاداری ئەوە بووم چەند کەسێکی تر پێش من گفتوگۆیان لەگەڵ داعشدا کردووە، هەربۆیە دڵنیام دەکەنەوە لەوەی کە پاسەوانی خۆبەخشم بۆ دابنێن، بەڵام تا ئێستا هەرکەسێك ڕووی لەو عەشیرەتە سوننانە کردبوو بە ساغیی نەگەڕابوویەوە.

لە سەرێکیشەوە زۆر تامەزرۆ و سەرکێش بووم بۆ ئەوەی ڕاستی و هەقیقەتەکان سەبارەت بە داعش بزانم. سەرکێشیی هەمیشە بزوێنەر و پاڵنەری من بووە بۆ دۆزینەوەی ڕاستییەکان. لە ڕێگەی گفتوگۆکانی سکایپ و نامەکەی خەلیفەشەوە بارودۆخێك فەراهەم ببوو کە دەستگیرکردن و کوشتنی ئێمە بە زیانی داعش تەواو دەبوو، چونکە ئامانجی ئەوان ئەوە بوو وەکوو دەوڵەتێك خۆیان بە ڕەسمی بناسێنن و دانیان پێدا بنرێت. لە سەرێکیشەوە سەیر بوو کە بە درێژایی ئەم ماوەیە و تا ئێستای کارەکە متمانەم بە ئەبوقەتادە کردووە. لە ڕاستیدا من متمانەم بە لایەنە باشەکانی کەسایەتیی

ئەو کردبوو، ئەو لایەنە باشانەی کە لە کەسایەتیی ئەبوقەتادەدا هەبوو، یان ماوەیەك پێشتر هەیبوو. بەڵێ، من باوەڕ و متمانەم بەو لایەنە باشانە کردبوو.

ئەو شتەی کە زۆر ئازاری دەدام ئەوە بوو کە دەبووایە فریدریکی کوڕم لەم سەفەرەدا هاوڕێیەتیم بکات. ئەم سەفەرەی جۆرێك لە شێتی و هاربوونی تێدایە. فریدریك تەمەنی ۳۱ ساڵە، تەواوی خێزانەکەم تکایان لە من دەکرد بۆ ئەوەی لەم سەفەرەدا فریدریك لەگەڵ خۆم نەبەم، چونکە ئەگەر بەڵایەك بەسەر مندا بهاتبایە ئەوا تەنها ئەو پیاوی ماڵەوە دەبوو. خێزانەکەم زۆر پێویستیان بە فریدریك بوو، بە تایبەت ناتالی خوشکە بچووکی. ئەو کچێکی زۆر جوانە، بەڵام بە دەست نەخۆشیی لاوازیی ئیم، ئێستەوە دەناڵێنێت و شمشێری نەخۆشی بە شێوەیەك بەسەر سەرییەوە هەڵواسراوە.

ڕۆژێك پێش ئەوەی سەفەر بکەین یەکجاریتر داوام لە فریدریك کرد لای خێزانەکەمان بمێنێتەوە، بەڵام ئەو بەم شێوەیە وەڵامی دامەوە: "تۆ خۆت باش دەزانی من بەم سەفەرە ڕازیی نیم. زۆریش دژ بەم کارەم و ناڕازییم. ئەگەر تۆ بکوژرێیت ئەوا تەواوی ئەو شتەی کە دەیان ساڵە لە پێناویدا دەجەنگی، واتە ڕێزگرتن لە دنیای موسڵمانان، بە فیڕۆ دەچێت، پاشان مەرگی تۆ ئەوە دەسەلمێنێت کە چەندە هەڵەبووی. ئەم سەفەرە جۆرێکە لە شێتیی."

منیش گوتم: "ڕەنگە منیش هەر لەبەر ئەمە بێت کە داوات لێ دەکەم لای خێزانەکەمان بمێنیتەوە."

فریدریك بە تووڕەییەکەوە سەیرێکی کردم و گوتی: "ناهێڵم بە تەنیا بڕۆیت، پێکڕا ئەم کارە ئەنجام دەدەین. ئەگەر بە نهێنیی و بێ ئاگاداریی من سەفەر بکەیت، ئەوکات تەواوی پەیوەندییە سکایپیی و ئینتەرنێتییەکانت لێ دەپچڕێنم. ئەوکات دەستت بە هیچ کەس و لایەنێك ناگات. تەواوی ئامراز و ڕێگاکانی پەیوەندیکردنت لێ دەبڕم."

هیچ چارەیەکم نەبوو. هەرچیم دەکرد بۆچوونی فریدریك هەر نەدەگۆڕا و نەدەگۆڕا.

هەڵبەتە بۆ بارودۆخ و ئەگەری شکاندنی بەڵێنەکە لەلایەن داعشەوە، بۆ خۆم هەندێ بەرنامەڕێژیم کردبوو. ژمارەیەك کەسایەتیی ڕۆشنبیر و سیاسیی ناوداری دنیای ئیسلام

دەناسی، ماوەیەك پێش ئەوەی سەفەر بکەم پەیوەندیم پێیانەوە کردبوو، لە سەفەرەکەم ئاگادارم کردبوونەوە. ئەوان بەڵێنیان بە من دابوو کە لە بارودۆخی نەخوازراودا پەیوەندیی بە دەوڵەتەکانیانەوە دەکەن، تا لە ڕێگەی ئەو پەیوەندییەی کە لەگەڵ داعش یاخود هۆز و عەشیرەتە سوننەکان هەیانە، پشتیوانی لە ئێمە بکەن. بەلای کەمەوە ئەم بوارەم لەبەر دەستدابوو. هەروەها قەرار بوو هەر لەگەڵ ئەوەی من بچمە ناو خاکی دەوڵەتی ئیسلامییەوە، بە نووسین نووسینگەی راوێژکاری باڵای ئەڵمانیا لە بەرلین ئاگادار بکرێنەوە و ئاگاداری چوونەکەی من بن

لە چەکدارە کەموێنەکانەوە بیستبووم، کە ئەوان لە کاتی ئەنجامدانی چالاکییە تایبەت و مەترسیدارەکاندا زۆرجار دەرمانێکی خۆکوژیی لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن، بۆ ئەو کاتەی کە ئەگەر دەستگیر بکرێن و ڕووبەڕووی هەڕەشە و شکەنجە و ئازار ببنەوە، یاخود بیانەوێت بە شێوەیەکی دڵتەزێن بیانکوژن، ئەوکات پێش ئەوە دەستبەکار دەبن و ئەو دەرمانە کوشندەیە دەخۆن، تا نەکەونە بەر گەمەی ئازار و شکەنجەدانی سادیستانەی بکوژانەوە. هاوین بوو لە ژووری پشتەوەی دەرمانخانەیەکی شاری هەولێر چوار دەستە دەرمانم دەستەبەرکرد، کە خواردنی زۆری دەبوویە مایەی مردن، واتە ئەو دەرمانانە کوشندە بوون. ئەو دەرمانانەم خستە نێو پاکەتی دەرمانەکانی دیکەی خۆمەوە. لە تەنیشت ماددەکانی ئاسپرین و ئیمۆدیۆمەوە دامنا، چونکە بەو جۆرە زۆر سەرنجڕاکێش نەبوو. من یەکێکم لەو کەسانەی کە دژی خۆکوشتنم، بەڵام لێرەدا مەسەلەکە خۆکوشتن نییە، بەڵکوو مەسەلەکە ئەمەیە لە کاتی پێشبینیکردنی مەرگی حەتمیی هەلێکم هەبێ بۆ ئەوەی بتوانم پێش بە ئازار و شکەنجە و کوشتنی زەلیلانەی خۆم بگرم. چونکە ئەگەر قەرارە بمرم، ئەوە نامەوێت داعش سیناریۆی مەرگی من بنووسێتەوە .

ڕۆژێك پێش ئەوەی بە ڕێ بکەوین باسی مەسەلەی دەرمانەکانم بۆ فریدریك کرد. ئەو بە سەرسامییەکەوە تەماشایەکی منی کرد و سەرێکی بۆم لەقاند، وەکوو نیشانەی

ڕازیبوون. وەك بڵێی دەروونی ئاسوودە بوو. ئەو چەکەی ئێمە لە بەرانبەر ئەوان هەمانبوو، بەداخەوە تەنها خۆکوژیی بوو.

دواتر بۆ ئەبوقەتادەمان نووسی کە ئێمە ڕۆژێکیتر دەکەوینە ڕێ و ئێستاکە و خەریکە کەلوپەلمان دەبەستین و خۆمان ئامادە دەکەین. بەم جۆرە چیتر ئێمە لە بەرانبەر نیازخراپی و لاساریی داعش داماو نەدەبووین. لە تەنیشت پاکەتی دەرمانەکانەوە گرنگترین شت کە حازرمان کردبوو بریتیبوو لە کیسەی خەوتن.

## تا نزیکی سنوور

**سێشەممە، ٢ـی دیسامبەری ٢٠١٤**

کاتژمێر حەوتی بەیانییە، کاتژمێرەکەم زەنگ لێ دەدات. ئەو شەوە بە باشی نەخەوتووم. دەبێ لە ئێستا بەدوا هەموو شتێك بەگوێرەی بەرنامە و پلان بەڕێوە بچێت. هەستان، ئامادەبوون، چێککردنی دووبارەی هەموو بەڵگەنامە و شتەکان و پاشان بەڕێکەوتن، بەڵام سەرەڕای ئەمە هەموو شتێك جیاوازە. وا هەست ناکەم بە نیازی سەفەرکردنم، بەڵکوو وا هەستەکەم خەریکم خۆم بۆ نەشتەرگەرییەکی قورس لە نەخۆشخانە ئامادە دەکەم. نەشتەرگەرییەك بە بێهۆشی تەواوەوە. بۆنی دیتۆل و ماددەی سڕکەر بە لوتما دێت. هەستێکی زۆر سەیرم دەربارەی ئەم سەفەرە دوورودرێژە هەیە.

کەمێکی ماوە بۆ کاتژمێر دە، فریدریك لەگەڵ مالکولم[٣٩] هاوەڵە کۆنەکەی خوێندنگای لە ئاپارتمانەکەی من دانیشتوون. فریدریك لەپڕ بڕیاری دا مالکولم لەگەڵ خۆیدا بێنێت. ئەو چەند هەفتەیەك پێش قسەی بۆ مالکولم کردبوو و فشار و کاریگەریی لەسەر دانابوو. ئەو باسی چۆنێتی سەفەرەکە دەکات و فریدریکیش فیلمی لێ دەگرێت، کچە گەورەکەشم (ڤالری) لەنێو ژوورەکەدایە. ئەو کۆپی زەمانەتنامەکەی خەلیفەی داعشی بۆمان هێناوە. هەر یەکێك لە ئێمە کۆپییەك لەو نامەیە هەڵدەگرین و لولی دەکەین و دەیخەینە نێو

---

٣٩- ناوێکی خوازراوە.

گیرفانی چاکەتەکانمانەوە. چونکە ئەم پارچەکاغەزە تەنها زەمانەتنامەی ئێمەیە بۆ ئەوەی بە زیندوویی لە دەوڵەتی ئیسلامیی بگەڕێینەوە! هەڵبەتە ئەگەر فێڵ و تەڵەکەبازییەك بۆ دەستگیرکردنمان لە ئارادا نەبێت .

تکا لە مالکولم دەکەم بچێت لە دووکانێکی بچووکی شیرینیی لە تەنیشتمانەوە کێکی زەنجەفیلی تازە بکڕێت، بۆ ئەوەی وەك دیارییەك لەگەل خۆمان ببەین. ڤالری کچم هەندێك جەلی[٤٠] و نوقڵ و شەکرۆکی قاوەیی و شکوڵاتی مەلیکاش دەخاتە نێو جانتاکانمانەوە. فردریك پاکەتی شیرینییەکە هەڵدەگرێ و دەپرسێت، ئایا دەکرێت دیاریی بە تیرۆریستان ببەخشرێت، یان ئەوەی کاری لەم جۆرە وەکوو پارێزگاریکردن لە کۆمەڵگەیەکی تیرۆریستیی هەژمار دەکرێ و سزای بەدواوەیە. من لە وەڵامی ئەودا دەڵێم ئەمە ڕیزگرتنە و لەبەر ڕەچاوکردنی ڕێزگرتنیش سزایەك نییە. تەنها جەلییەکان دادەنێین و لەگەڵ خۆمانی نابەین، چونکە لە ژیلاتین دروست دەکرێ، ئەویش لە لاشەی بەراز دروست دەکرێت. دواتر بۆ خواحافیزیکردن لە ناخی دڵەوە تاوێك یەکتر لە باوەش دەگرین، ڤالری کچێکی زۆر دلێرە .

لە ڕێگاماندا بەرەو فڕۆکەخانە کەسێك لە فەرمانگەی کاروباری تاوانەکان زەنگ بۆ تەلەفۆنەکەی من لێ دەدات، ئەوان ئاگاداربوونەتەوە لەوەی کە من بە نیازم سەردانی دەوڵەتی ئیسلامی بکەم. ئامۆژگاریم دەکات بێ چەندوچوون لەم کارە پاشگەز ببمەوە. هەرچییەك بێ وەزارەتی دەرەوەی وڵات لەبارەی سەفەرەکەمەوە هۆشداریی بە وان داوە. چەند فەرمانبەرێك دەیانویست چاویان بە من بکەوێ، بۆ ئەوەی چەند پرسیارێکم لەبارەی ئەم سەفەرەوە لێ بپرسن. من پێیان دەڵێم بمبوورن کاتم نییە. وێڕای سوپاس و دەستخۆشیی سەبارەت بە هۆشدارییەکەیان، زۆر بەڕێزەوە خواحافیزییان لێ دەکەم.

خۆشبەختانە هەموو شتێك لە فڕۆکەخانە بە باشیی دەڕواتە پێشێ، ئێمە بە نیازین بە هێڵی ئاسمانی تورکیش سەفەر بۆ ئەستەمبوڵ بکەین و پاش وچانێکی کورت لەوێوە دەمانەوێ بەرەو شاری غازی عەنتاب بە ڕێ بکەوین. لە فڕۆکەخانە نە کەسێك ڕێگریمان

---

٤٠- پاستیل جۆریکە لە شیرینیی ورد و جیر کە زۆرجار منداڵان دەیخۆن.

لێ دەکات، نە هیچ کەسێك لە پۆلیسی فڕۆکەخانە لێپێچینەوەمان لەگەڵ دەکات، بارودۆخەکە زۆر لە سەفەرێکی بازرگانی سادە[41] دەچێت. مالکولم و فریدریك لەسەر هەوڵی دەوڵەتی ئەڵمانیا بۆ ڕێگریکردن لەسەفەرەکەم بەرەو دەوڵەتی ئیسلامی، کەمێك گاڵتە و شۆخیی دەکەن. سەفەر و دەرچوون لە وڵات لەمە ئاسانتر و خۆشتر نەدەبوو. پێ ناچێت تورکەکانیش زۆر خۆشیان لە ئێمە بێت .

فڕۆکەکەی ئێمە بۆ کەوتنەڕێ بەرەو ئەستەمبوڵ کەمێك دوادەکەوێت. دەبێ لە بیری فڕینەکەی غازی عەنتابدا نەبین، چونکە فریای ناکەوین. سەرەڕای ئەمە کاتێك دەگەینە فڕۆکەخانەی ئەستەمبوڵ هەموومان خێرا خێرا بەرەو لای هۆدەی فڕینەکان دەڕۆین، بەڵام فڕین بەهۆی خراپی دۆخی کەشوهەواوە خۆبەخۆ هەڵوەشاوەتەوە، بەڵام بۆ نیوەشەو فڕینێکی دواخراو بەرەو شاری ئەدەنە هەیە، ئەو شارەش بە ئۆتۆمبێل دوو کاتژمێر لە غازی عەنتابەوە دوورە. واتە تازە دەتوانین کاتژمێر حەوتی بەیانی بگەینە جێگای نووستنەکەمان. بۆ من زۆر درەنگە، هەر بۆیە ئەو شەوە دەچینە هوتێلی فڕۆکەخانەکە و لەوێ دەمێنینەوە.

### چوارشەممە، ٣ی دیسامبەری ٢٠١٤

ڕۆژێك دواتر مالکولم لە کاتی نانی نیوەڕۆدا باسوخواسی داواکردنی پارە یان (سەربەها) بۆ ئازادکردنی بارمتەکانی لای داعش دێنێتە پێشەوە و دەپرسێت لە بارودۆخێکی لەم شێوەیەدا کێ ئامادەیە ئەو بڕە پارەیە بدات؟ خێزانەکەی توانای ئەوەیان نییە ئەو بڕە پارەیە بە داعش بدەن، دەرئەنجام کار بەوە دەگات کە من قسەکەی قبوڵ بکەم. پاشان من بۆی ڕوون دەکەمەوە کە خودی خۆمیش دڵنیانیم ئەگەر داعش بۆ کڕینەوەی سەرم داوای پارە بکات، دەبێت لەکوێ ئەم پارەیە ئامادە بکەم. من پێی دەڵێم هێشتانێك زۆر درەنگ نەبووە، دەتوانی بگەڕێیتەوە. مالکولم نوقمی

41- Business as usuall

بیرکردنەوە دەبێ، دوودڵ دەبێت، پاش کەمێك هیوادار دەبێت. ڕەنگە دەوڵەتی ئەڵمانیا دەستگیری بکەن و لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکەن. پێی دەڵێم: "بەردەوامیی بە خەونەکانت بدە!" مالکولم چی تر حەز ناکات هیچ شتێك لە بارەی پاشگەزبوونەوە و گەڕانەوەوە ببیستێت، پاشان بۆ خۆی دەفتەرێکی تێبینیی و یادگاریی گەورە دەکڕێت و لەو ڕۆژە بەدوا ئەو دەفتەرە دەبێتە تێنووسی تێبینیی و ڕاپۆرتەکانی.

فڕینی کاتژمێر ١٨ـی ئەمڕۆش کە بڕیارە بەرەو شاری غازی عەنتاب بفڕێت، بەهۆی خراپی بارودۆخی کەشوهەواوە، هەڵدەوەشێتەوە. من بە خێرایی بەرەو لای هۆدەی فڕینی ئەدەنە ڕادەکەم، کە خەریکە ئەویش دەبەسترێت. زۆر بە زەحمەت دەتوانم بلیت و جێگە بگرم. فردریك و مالکولم بەرنامەیان وابوو کەمێك شوێنەکانی ئەستەمبوڵ بگەڕێن، بەڵام لە ئێستادا بارودۆخ بۆ گەشتەکەمان بەرەو شاری ئەدەنە فەراهەم بووە و بە هیچ جۆرێك ناتوانین دوای بخەین.

لەنێو فڕۆکەکەدا منداڵانی پۆلێك دانیشتوون. لە نێو فڕۆکەکە کەشێکی زۆر خۆش بەرقەرارە. هەرچەندە ئەدەنە ڕێك دەکەوێتە نزیك سنووری سووریاوە، لەوێش شەڕ بەرقەرارە، بەڵام ئەم کوڕ و کچە خنجیلانانە زۆر دڵشاد و خۆشحاڵ دیارن. دوو کچی تەمەن ١٨ ساڵان بە شێوەیەکی پڕ لە جۆشوخرۆش و سەرنجڕاکێش باسی جوانی شارەکەیان بۆ من دەکەن. بە جۆرێك مرۆڤ ئاواتەخواز دەبێ ڕێك لە نزیکی سنوور بژێت. کاتێك فڕۆکەکە لەسەر ڕووی باندی فڕۆکەخانەی ئەدەنە دەنیشێتەوە، وەکوو گوڵ ڕەنگ و ڕوویان دەدرەوشێتەوە. کەشێکی تەماوییە و بۆنی داری سووتاو، گازوایل و مۆلیدە بە لوتمانا دێت، ئەدەنە شارێکە نوقم و خەڵتانی دووکەڵ و تەم.

لە وێستگەیەکی تەکسی ترۆمبێلێك و شۆفێرێك بە بڕی کەمتر لە ١٠٠$ دەگرم، بۆ ئەوەی ئێمە بباتە شاری غازی عەنتاب، ناوی شۆفێرەکەشمان ئەردۆغانە[٤٢]. ئەو لە ڕێگا باسی ئەوە دەکات کە زۆربەی چەکدارانی داعش لە ڕێگەی هاتای، ئورفە و غازی

---

٤٢- اردوغان

عەنتابەوە دەچنە نێو سووریا و لەو جێگایانەوە خۆیان بە خاکی سووریا دەگەیەنن. لە غازی عەنتابیش بۆ دەربازبوون لە سنوور دەبێ بچینە کیلیس.

لە ڕێگا لەلای باکووری قارەمان مەرعش[43] مووشەکەکانی پاتریوتی ئەڵمانی بۆ بەرگریکردن جێگیر کراون. هیچ کەسێك نازانێ بڕیارە ئەمانە بەرگریی لە چی بکەن. وڵاتی سووریا لەگەڵ ئەو وڵاتانەی کە ئەندامی هێزی ناتۆن شەڕ ناکات و لە ڕاستیدا بەم جۆرەش تیرۆریستەکانی ئاییندەی داعش بەژێر مووشەکە بەرگریکارە ئەڵمانییەکاندا لە سنووری تورکیا تێدەپەڕن و دەرباز دەبن. فڕۆکەوانەکانی هێزی ئاسمانی داتەپیوی سووریا چاودێریی ئەوە دەکەن تا لەم ناوچەیە چەکدارانی داعش دەستگیر بکەن. فڕۆکەکانی سووریا بەهەڵە بسووڕێنەوە دەکەونە بەر هەدەفی مووشەکە ئەڵمانییەکان. لە ڕاستیدا مووشەکە پاتریوتییەکانی ئێمە پارێزگاری لە تیرۆریستەکانی ئاییندەی دەوڵەتی ئیسلامی دەکەن.

دواجار دەوربەری کاتژمێر ١١ـی شەو دەگەینە هوتێلێك لە غازی عەنتاب، لەبەرخۆمانەوە بەو بریقوباق و سووکییەی پێشوازیکردنمان پێ دەکەنین. ئێمە وەکوو مافیا و کەسانی پارەدار و دەوڵەمەند دێینە پێش چاو، لە (لابی)ـێك دادەنیشین و ئەو خەڵکەش بە گومانەوە تەماشای ئێمە دەکەن. ئایا چەنێك لەم خەڵکەی ئێرە، کە کاتژمێرێك لە سنوورەوە دوورن، سەروکاریان لەگەڵ داعشدا هەیە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە تەنها دەتوانین بە بۆچوون و گریمانە و خەیاڵ بیدەینەوە. سەرەڕای ئەم هەموو ماندووبوونە تاوێکی باش دەخەوین، چونکە بە ڕاستی کارەکەمان لە سبەینێوە دەست پێدەکات .

## پێنجشەممە، ٤ـی دیسامبەری ٢٠١٤

ئەبوقەتادە تا ئێستا زەنگی لێ نەداوە. ئێمە وەك هەمیشە خوومان بە چاوەڕوانییەوە گرتووە. کەمێك بە نێو بازاڕدا پیاسە دەکەین و شتێکیش دەخۆین.

---

43- 43 Kahramanmaras

کەمێکیش بیر لەوە دەکەینەوە کە ئەگەر هاتوو بۆ ڕۆژانی دواتر ئەبوقەتادە زەنگی لێ نەدا چی بکەین و چ پلان و بەرنامەیەکی بەدیلمان هەبێت، بیرمان لە شاری (کیلیس)ـی سەر سنووری سووریا و تورکیا کردەوە، بەڵام لەو شوێنە زۆرێك لە بیانییەکان ڕفێنرابوون، بێگومان ئێمە نەماندەویست شتی لەم شێوەیە ڕوودات. هەڵبەت دەشمانتوانی لەوێ داوای هێزێکی ئاسایش بۆ پاراستن بکەین، بەڵام ئایا کارێکی لەم شێوە لە شوێنێکی وەهادا دەلوێت؟

بە مەبەستی عیبادەتکردن، بە نهێنیی دەچینە نێو مزگەوتێکی ڕۆمانتیکەوە. من ئاشقی فەزای عیرفانی مزگەوتەکانی تورکیام. پاشان دەچینە نێو بازاڕ و کەمێك کشمیش و فستق و مۆز دەکڕین. لەو شارە کۆمەڵێك کارگەی بچووکی لێ بوو کە خەڵکی بە گەرمیی تێیدا سەرقاڵی ئیشکردن بوون. ئەوان لەسەر کاسەی گەورەی کانزایی بە چەکوش و چەکوشکاریی هونەرمەندانە سەرقاڵی کاری هەڵکۆڵین و جوانکاریی بوون.

لەناکاو فریدریك چاو لە مۆبایلەکەی دەکات و دەبینێت ئەبوقەتادە ئۆنلاینە و نووسیبەتی کە ئێستا دەتوانێت لە ڕێگەی سکایپەوە گفتوگۆمان لەگەڵ بکات. پاش نیوسەعات لەگەڵ ئەبوقەتادەدا قسە دەکەین، بەگوێرەی وتەکانی ئەبوقەتادە لە ئێستادا شاری ڕەققە بارودۆخی ئارامە و لەم ڕۆژانەی دوایی ئەسەد شارەکەی بۆمبباران نەکردووە. بەهۆی خراپی کەشوهەواوە فڕۆکەوانەکانی ئەسەد ناتوانن شارەکە بۆردومان بکەن. ئەوان ناچارن بە فڕۆکە شڕەکانیان بەژێر تۆپەڵە هەورەکاندا بفڕن و لەم بارودۆخەشدا خۆیان دەخرێنە خوارەوە. جگە لەمە لە بارودۆخێکی واشدا نین تا بتوانن ئامانجەکانیان بە مووشەك بپێکن، هەر بۆیەش زۆرینەی ئەو خەڵکەی کە دەبنە قوربانیی مووشەکەکان خەڵکانی بێلایەن و مەدەنین. تۆ بڵێی بۆ ئەمریکاییەکان بارودۆخەکە جیاوازتر بێت! ئاخر ئەوان مەترسیدارترن، بەڵام بەهەرحاڵ ئەوانیش ناتوانن ئەوە ببینن کە ئایا چەکدارانی داعش لەنێو باڵەخانەکاندا خۆیان مەڵاس داوە یاخود خەڵکی بێگوناح.

ئێمە دەمانەوێ لەبارەی شوێنی نیشتەجێبوون و کاتی دەرچوونمانەوە لەگەڵ ئەبوقەتادە قسە بکەین، بەڵام ئەو وەڵامی وردی زۆربەی پرسیارەکانمان ناداتەوە. مەوعید بۆ سبەینێ دادەنێین تا کاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆ پێکەوە قسە بکەین.

بەهەرحاڵ ڕۆشتن بۆ سووریا لە درەنگانی شەودا لەبار و گونجاوە، دەبێت ئێمەش ئەو بوێریی و توانایەمان هەبێت بۆ ئەوەی سبەی یاخود دوو سبەی شەو بە ڕێ بکەوین. ئاشکراشە بۆ داعش (کات) زۆر گرنگ نییە.

لەگەڵ ئەبوقەتادە قسەمان لەسەر لێشاوی کۆمێنتەکانی تویتەر کرد، بە تایبەت ئەو ڕەخنانەی کە من لە داعشم گرتووە و لە ئێستادا لە زۆرێك لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بڵاوکراونەتەوە. بەڵام ئەبوقەتادە دیسان دووپاتی کردەوە کە ئەوان کێشەیان لەگەڵ ئەو بابەتانە نییە، گوتیشی بەڵێننامەکەی ئێمە شتێکی باوەڕپێکراوە و هیچ قسە و باسێکیش ناتوانێ پاشگەزیان بکاتەوە، یاخود پێیان بگۆڕێت، مەگەر ئەوەی کە کەسێکمان لەنێو دەوڵەتی ئیسلامیدا سووکایەتی بە خوا و پێغەمبەر و پیرۆزیی ئیسلام بکات، سا ئەوکات بەڵێننامەکەش ناتوانێ فریامان بکەوێ و لە مردن ڕزگارمان بکات. بەڵام ئەو قسە لەسەر ئەوە ناکات چ کاتێك ئاگاداری ئەوەبین کە کوفر نەکەین. دواتر فریدریك دەڵێت: (بەمزووانە ! ). فریدریك ئەو دەمەی من لەگەڵ توندڕەوەکان سەرقاڵی گفتوگۆکردنم، هەموو گیانی دەلەرزێت، بەڵام من ئەو کاتەی لە ئەفغانستانیش بووم بێ هیچ ترس و پەردەیەك بە ڕاشکاوانە پرسیارەکانی خۆم دەپرسی و قسەکانی خۆم دەکرد.

لە پاش ئەم گفتوگۆیە دیسانەوە بۆ ناوچە کۆنەکانی شارەکە دەگەڕێینەوە، تا جارێکی تر بە تێروتەسەلیی چێشتێکی تورکیی بخۆین. کەبابفرۆشێکی میللی و قەدیمی پەیدا دەکەین و داوای هەموو ئەو شتانە دەکەین کە بە لامانەوە ئاشنان، جۆرەها کەباب و موقەبیلات، لامان جون، زەلاتە و شتی تر. لە کاتێکدا کە سەرقاڵی نانخواردنین قسە لەسەر ئەوە دەکەین ئایا وا باشتر نییە پێش ئەوەی لە سنوورەکە تێپەڕینەوە هەواڵی سەفەرەکە و بەڵێننامەی سەفەرەکەمان لە فەیسبووك بڵاوبکەینەوە. چەند دەلیلێك بۆ ئەنجامدان یا ئەنجامنەدانی ئەم کارە دەخەینە ڕوو، یەکێك لەو شتانەی ئێمەی ناچارکرد بەوەی ئەم کارە نەکەین ئەمە بوو کە ڕۆژانی دواتر من ناتوانم بە هیچ جۆرێك ڕەخنەی ڕاشکاوانەم هەبێ، بەم جۆرە سەرئەنجام بڕیار دەدەین کە هەواڵی سەفەرەکەمان دوای گەڕانەوە بڵاوبکەینەوە. ئەگەریش دەستبەسەرکراین ئەوە ڤالری کچم دەتوانێ بەڵێننامەکەی خەلیفە بڵاوبکاتەوە .

پێش خەوتن کەمێك تەماشای تەلەفزیۆن دەکەین، بەڵام هەواڵەکانی ئەلجەزیرە باسی کوژرانی ٥٠ کەس لە ئێراق و باسی سەرکەوتنەکانی داعش و مرۆڤرفاندنەکانی تر دەکات، کە زۆر شتێکی سەرنجراکێش نییە. تەلەفزیۆنەکە دەکوژێنینەوە.

## هەینی، ٥ـی دیسامبەری ٢٠١٤

ڕۆژی دواتر کاتژمێر سێ، بەبێ ئەنجام چاوەڕێی زەنگی تەلەفۆنین. ئەم مەسەلەیە سۆماڵ دێنێتەوە یادم. چەند ساڵێك لەمەوپێش لەگەڵ تیمێکی تەلەفزیۆنی و یەکێك لە پەیامنێرانی ڕۆژنامەی فرانکفورتر ئالگە ماینە[44] بۆ بڕیاری چاوپێکەوتنێك لەگەڵ سەرکۆماری پێشوو زیاد بارە[45]، یەك هەفتەی ڕەبەق لە چاوەڕوانیدا بووین. وەختێکیش توانیمان قەرار بۆ درەنگانی شەو دابنێین، تیمە تەلەفزیۆنییەکە لە نادییەکی شەوانەدا بێ ناونیشان سەرنوقم بوون. تەنها پەیامنێرەکەی فرانکفورتر ئالگە ماین، گونتەر کرا[46]بە دڵێرانە بەرگریی کردبوو. فریدریك و مالکولم وەکوو یەك خۆڕاگربوون. بە ڕاستی ئەوان بۆ گەیشتن بە دەوڵەتی ئیسلامی هیچ پەلەیەکیان نەبوو

چاوەڕوانی، چاوەڕوانی، چاوەڕوانی. دیسانەوە بۆ چێشتخواردن دەچینە ناوچەی کۆنی شارەکە، بەڵام دواتر ئەبوقەتادە زەنگ لێ دەدات. ژمارەیەك بە ئێمە دەدات بۆ ئەوەی زەنگی بۆ لێ بدەین. مەسەلەکە جدیی دەبێت. زەنگ بۆ ژمارەکە لێ دەدەم. لە پشتی تەلەفۆنەکەوە کەسێك وەڵام دەداتەوە کە ئەڵمانی زۆر باش دەزانێت و بە ئەڵمانی قسە دەکات. من پێی دەڵێم، کە ئێمە ئامادەین. ئەو بەڵێن دەدات، کە تا ١٥ خولەکیتر زەنگمان بۆ لێ بداتەوە و بە ڕاستیش زەنگ لێ دەداتەوە بۆ ئەوەی بڵێت ئەمشەو ناتوانین لە سنوورەکە تێپەڕین. قەرارەکەمان بۆ بەیانی سبەینێ دوا دەکەوێت، کاتژمێر ٩ ئێمە دەبێت دیسان زەنگی بۆ لێ بدەینەوە. کەم کەم وەختە کاسەی چاوەڕوانیم سەرڕێژ بێت. بۆچی هەموو شتێك بەم ڕادەیە ئاڵۆزە؟ ئایا کێشەیەك لە ئارادایە؟



44- FAZ
45- Siad barre
46- Guenter Krabbe

# ده ڕۆژ له نێو دەوڵەتی ئیسلامی

## ڕۆژی یەکەم

**شەممە، ٦ـی دیسامبەری ٢٠١٤**

سـەعات ٨:٥٥ـــی بەیانییـە. کاتژمێرەکـەم زەنـگ لێـدەدات. سـەیرێکی کاغـەزەکانی تەنیشـتم لەسـەر مێزەکـە دەکـەم و ژمارەکـە لـە مۆبایلێکدا دەنووسمـەوە و پێوەنـدیی دەکەم، یەك – دوو جارێك زەنگ دەڕوات و کەسـێك وەڵـام دەداتـەوە: "بـاش نووسـتوی بەڕێز تۆدنهۆفەر؟" بـە بـەڵێ وەڵـام دەدەمـەوە و پرسـیار لـە بـارەی ڕۆشـتنەکەمانەوە دەکەم. ئەو پیاوە بە من دەڵێ: "پێنج خولەکی تر تەلەفۆنت بۆ دەکەمـەوە و بـە وردیـی پێ ڕادەگەیەنم کە چی بکەیت و چی نەکەیت."

پاش چەند خولەکێك زەنگ بۆ تەلەفونەکەم لێ دەدرێـت، مـن ئاگـادار دەکەنـەوە کـە دەبێ تا یەك – دوو کاتژمێری تر سواری تاکسی ببین و زەنـگ بـۆ ژمارەیـەکی دیـاریکراو لێ بـدەین. دەبێـت وشـەی نهێنیـی "عـەلی!" بـە ئـەو کەسـە بڵێین کـە زەنگـی بـۆ لـێ دەدەین، پاشان مۆبایلەکە بە شۆفێرەکەمان بدەین بۆ ئەوەی قسەی لەگەڵ بکات. دواتر خۆیان بە شۆفێرەکە دەڵێن کە دەبێ بۆ کوێ بڕوات. دواتریش لەو شوێنە چـەند کەسـێك بەدواماندا دێن.

نێوانچیەکەمان هەموو شتەکان بەڕێز و بە ئاوازێکی برایانەوە بـە ئێمـە ڕادەگەیـەنێت، ڕاستییەکەی زۆر شتێکی چاوەڕواننەکراوە. بەهـەرحاڵ مـەرج نییـە تـاك بـە تـاکی ئـەوان توندڕەو بن و وەکوو مرۆڤی سەردەمی بوق[٤٧] ڕەفتار بکەن.

فریدریك و مالکولم ئاگادار دەکەمـەوە کـە تـاکوو یـەك کاتـژمێریتر بـە ڕێ دەکـەوین، قاوەڵتییەکی پوختە دەخـۆین و کەلوپەلـەکانمان لـە هوتێلەکـە دێنینـە خـوارێ و لەگـەڵ هوتێلەکە حسابوکتابی خۆمـان دەکـەین. پاشـان سـواری یەکـەمین تاکسـی دەبـین، ئـەو ژمارە تەلەفۆنەی کە پێیان داوم دەگرم و بـە مۆبایلەکـەم زەنگـی بـۆ لـێ دەدەم، کـەس

---

٤٧- سەردەمانی کۆنی مێژوویی

وەڵام ناداتەوە، دووبارە زەنگ لێ دەدەم کەس وەڵام ناداتەوە، ئەم جارەیان کەسێك بە تورکی وەڵام دەداتەوە و دەڵێ: "بەڵێ؟ ئەلو؟" منیش دەستم دەخەمە سەر دەمم و چەند جارێك بە هێواشیی و بە ڕوونیی دەڵێم: "عەلی!" وشەی نهێنیی. دواتر دەڵێم: "ئێستا مۆبایلەکە بە شۆفێرەکەمان دەدەم." پاشان دەیدەم بە شۆفێرەکە، ئەویش دوو - سێ جارێك سەرێك بە مانای بەڵێ دەلەقێنێت و پاشان مۆبایلەکەم دەداتەوە و دەست بە لێخوڕین دەکات. کاتژمێر دە و چلوچوار خولەکە. پێنج خولەك بە ترۆمبێل ڕێ دەکەین و دواتر لە لاکۆڵانێکدا لە نزیك مزگەوتێکی بچووك ترۆمبێلەکە ڕادەگرین و دەوەستین.

پاش کەمێك سەروکەللەی دولمشێکی سپی پەیدا دەبێ، کە سێ گەنجی دیکەشی تێدایە. پێ دەچێت گەنجەکان خەڵکی ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا بن. وا بڕیارە لەگەڵ ئەم چەکدارە نوێیانە لە سنوورەکە پەڕینەوە. لەگەڵ گەنجەکان دەکەوینە قسەکردن و ئەوان حەز دەکەن بزانن ئێمە خەڵکی کوێین، ئەو گەنجانە یەکێکیان خەڵکی ئازەربایجان و دووانەکەی تر خەڵکی تورکمانستانن. ٢٢ و ٢٤ و ٢٨ساڵانن. لە سەرەتادا وا دیارە بە وردی ئاگاداری مەسەلەکە نین، یەکێکیان بەردەوام لەنێو مۆبایلەکەیدا هەواڵ دەخوێنێتەوە و بەدوای چەند شتێکدا دەگەڕێ. دوای کەمێك ئاوڕێك لە مالکولم دەدەنەوە و پێیان سەیرە لەوەی مالکولم بەردەوام لەنێو دەفتەرەکەیدا یادداشتەکانی دەنووسێتەوە، دوای کەمێك توڕە دەبن.

مالکولم دەیەوێت بۆیان ڕوونبکاتەوە کە ئەو سەرقاڵی نووسینی ڕاپۆرتی ڕۆژانەی خۆیەتی، بتەوێ و نەتەوێ کەس باوەڕ بە قسەکانی ناکات. هەرسێ گەنجەکە بە شڵەژانەوە دەست بە تەلەفۆنکردن دەکەن. لەپڕێکا فەزای نێو ترۆمبێلەکە بە تەواویی تێك دەچێ، کتوپڕ فەزاکە توندوتیژتریش دەبێ.

زەنگ بۆ ژمارەی نێوانچییەکەمان لێ دەدەم و داوای لێ دەکەم هەموو شتێك ڕوونبکاتەوە و ئەم گەنجانە تێبگەیەنێت. دواتر تەلەفۆنەکە دەدەم بە یەکێك لە گەنجەکان، پاش کەمتر لە خولەکێك فەزای نێو ترۆمبێلەکە ئارام دەبێتەوە و بە تەواویی

دەگۆڕێت. هەموو شتێك دەگەڕێتەوە سەر دۆخی ئاسایی خۆی و هـەموویان بـە ڕووماند پێدەکەنن. قامکی ئەسپێکوژەم بە مانای (ئۆکەی) بۆیان بەرز دەکەمەوە .

پاش دە خولەکێك ڕادەوەستین، چەند کوڕێکی گـەنجیتر لەگـەڵ خـانمێکی باڵابـەرزی چاوشینی پێستڕۆشن سواری ترۆمبێلەکە دەبن، ئەو خانمە ئەڵمانییـە، عەبایـەکی ڕەشـی پۆشیوە، یەك عەبای ڕەش، بەڵام بازووەکانی کەمێك هەڵئاوساون. چەند سـەد مـەترێکی تر دەڕۆین و دیسان دۆڵمشەکە دەوەستێت. لـە پێشـمانەوە دوو تاکسـی کۆنـە پارکیـان کردووە، گەنجێکی دیکە و دوو پیاوی بەتەمەن لە تەنیشتییەوە چاوەڕوانن.

سواری یەکێك لە تاکسییە کۆنەکان دەبین، فریـدریك دەچـێتە پێشـەوەی تاکسـییەکە دادەنیشـێ، بـۆ ئـەوەی لـە کـاتی تێپـەڕبوونمان بـە سـنووردا کـامێراوانی بکـات. بـەڵام شۆفێرەکە تەماشایەکی فریدریك دەکات و ئامـاژە بە ڕیشـە کورتەکـەی دەکـات و تکـا لـە فریـدریك دەکـات بچـێتە دواوە و لـە پشـتەوە دابنیشـێت. بـەم جـۆرە کـەمتر گومانمـان لێدەکەن. دوای ئەمە جێگاکەمان زۆر تەنگ و ناخۆش دەبێت.

هەر جۆرێك بووە جێگـای خۆمـان لـەنێو تەکسـییەکە دەکەینـەوە و بـەڕێ دەکـەوین. بەڵام پاش چەند خولـەکێك لەسـەر چـوارڕیانێك ڕادەوەسـتین، شـۆفێرەکە، کـە تـوڕەیـە، پێمان دەڵێت پۆلیس ترۆمبێلێکی تری ڕاگرتووە .

لە پاشان بێ ئەوەی قسەیەکمان لەگەڵ بکـات بـە ڕێ دەکـەوێت. فریـدریك زوو بـیری دێتەوە و زەنگ بۆ نێوانچییەکەمان لـێ دەدات و ئـەو کێشـەکە چارەسـە دەکـات. وابـزانم شۆفێرەکە نیازی وابوو ئێمە بەرەو سنووری فەرمی ببات، بـەڵام ئێسـتا تێگەشـتووە کـە دەبێ بەرەو لای دەروازەی قاچاغچییەکان بڕوات، بەرەو سنووری سەوز. لێـرەدا تاکسـی دووەمیش دەگاتە لامان.

لەسەر ڕێگای کیلیس، تەقریبەن هیچ هاتوچۆیەك نییـە. پـاش کـەمێك شـۆفێر لەسـەر جادە شەستییەکە لەناکاو دەچێتە سەر جادەیەکی لاوەکی پڕ بەرزونزمیی و بـەنێو وەرد و زەوی کشـتوکاڵیدا لـێ دەخوڕێـت. ئێسـتا هـەردوو تاکسـییەکە زۆر بـە خێرایـی بـەرەو

سنوور لێ دەخورن. ئەم دیمەنە لەسەرەوە جوانتر دەبینرێ، لەمە روونتر نابێت. لەسەر رووی تەپەیەك لە پێشمانەوە ئاڵای تورکیا دەشەکێتەوە. ئایا ئێرە سنووره؟

لەناکاو بەلای راستدا پێچ دەکەینەوە و دەچینە نێو باخچەیەکەوە، لێرەدا هەمووان دەبێ خێرا پیادە ببن و سواری فارەیەکی بێ کورسیی و تەخت ببن، دەبێت لەسەر زەوی یان لەسەر ئەژنۆ و چنجك دانیشین. دوای ئەوە بەسەر داروبەرددا لێ دەخورێت، لێرە بەدواوە نەك هەر بەسەر رێگای نێو وەردەکاندا ناچێت، بەڵکوو بەناو جەرگەی وەرد و زەوییە کشتوکاڵییەکاندا دەروات، ترۆمبێلەکە هێندە بە توندیی هەڵبەزودابەز دەکات هەموومان بەسەر یەکتردا دەکەوین. تا دێت خانمەکە زیاتر تەماشای ئێمە دەکات، وەك بڵێی لە شوێنێك پێشتر ئێمەی بینیوە و دەماننناسێتەوە. پێم دەڵێ دەموچاوی تۆ زۆر ئاشنایە بۆم. منیش بە نەرمییەکەوە دەڵێم: نازانم!

یەکێك لەو پیاوانەی کە لە پێشەوەی فارەکە دانیشتووە روو وەردەگێرێ و بە ئینگلیزییەکی نیوەتەواو بۆمان روونددەکاتەوە کە دەبێت هەر ئێستا بە دەستووری ئەو بە تەواویی شرۆشیتاڵمانەوە پیادە ببین. کەمێك دوای ئەوە فارە رادەوەستێت، دەرگاکەی دەکرێتەوە، هەموومان خۆمان هەڵدەدەینە دەرێ و دەست بە راکردن دەکەین.

سەد مەتر لە پێش ئێمەوە پیاوێك لەسەر سنوورەکە راوەستاوە و بۆ ئەوەی دەرباز بین تەلە درکاوییەکەی بەرزکردۆتەوە. هەرکەسە و تا دەتوانێ رادەکات، بەڵام راکردن بە کۆڵەوە بەنێو باخچە و وەرد و کلۆسمدا زۆر سەختە. فریدریك جانتاکەی من هەڵدەگرێت. من کێشەکێش کۆڵە پشتییەکەی خۆم و خانمە ئەڵمانییەکە دەبەم. چەند سەد مەترێك دوورتر پێنج ترۆمبێل لە پشتی درەختەکانەوە خۆیان حەشارداوە. پێنج پیاوی دەمامکدار پێشوازیمان لێ دەکەن.

خانمی باڵاپۆش خەڵکی بەرلینە و نزیکەی سی ساڵێك تەمەنی هەیە، ئەو دەڵێت بووەتە موسڵمان و سەفەری بۆ مەککە کردووە، بەڵام دواتر رێکخراوی ئەمنیی ئەڵمانیا لێی ئاگادار دەبنەوە و سەرئەنجام کورە شەش ساڵەکەی لێ دەستێنن، لەو رۆژەوەی بۆ

مەککە چووە هیچ هەل و بوارێکیان پێ نەداوە. ئێستا بۆ ئێرە هاتووە و دەڵێت تەواوی خەون و هیواکانم بە دەوڵەتی ئیسلامییە، ئەو چیتر نایەوێ بگەڕێتەوە بۆ ئەڵمانیا .

کەمێك بە سەرسامییەوە بە خانمەکە دەڵێم ئەم کارەی بە مانای ئەوە دێت کە کوڕەکەی بە یەکجاریی لە دەست دەدات. لە وەڵامدا دەڵێت: "من هەموو شتێکم لە دەست چووە، شتێکی ترم نییە تا لە دەستی بدەم."

قسەکانمان دەپچڕێت. لەبەر چەند هۆیەك دەبێت من و فریدریك و مالکولم بۆ جێگایەکی ئارام بگوێزرێینەوە. سواری دەبڵێکی سپی دەبین، دوو پیاوی چەکداری داعش لە پێشەوە دانیشتوون، شۆفێرەکە ریشێکی ڕەشی درێژی هەیە، لەسەر شانی وێنەی کڵاشینکۆف و تفەنگ دانراوە. کەلوپەل و شتەکانمان لە پشتەوەی ماشینەکە دادەنێین و ئێمەش سوار دەبین. شۆفێرەکە پێ بە بەنزیندا دەنێت و بەنێو ناوچەیەکی وشك و بەیاردا لێ دەخوڕێت. ناوبەناو بەنێو گوندەکانیشدا تێ دەپەڕین. وەك هەمیشە فوتبۆڵ کلیلی پەیوەندییەکان دەکاتەوە و بەفری بێدەنگییەکان دەتوێنێتەوە، ناوی یەکبەیەکی تەواوی ئەو یاریزانە موسڵمانانە دێنین کە دەیانناسین.

پاش کەمێك لە پێش خانوویەك ڕادەوەستین، پیاوێکی توندڕەو و کڵاشینکۆف بەدەست دەپرسێت ئایا لەلایەن (بی، بی، سی)ـەوە هاتووین. فریدریك دەڵێت نەخێر و بۆ یەکەمین جار بەڵێننامەکە لە گیرفان دەردێنێ و پیشانی ئەوانی دەدات. پیاوەکە زۆر بە سەرسوڕمانەوە نامەکە دەخوێنێتەوە و بە فریدریکی دەداتەوە و تاڕادەیەك بەڕێزەوە دەڵێت: "خەیاڵتان ئاسوودە، هەموو شتێك لە باشیدا دەبێت." ئەو خانمانەی لەو دەوروبەرەدان هەموویان باڵاپۆشن، هاوشێوەی هەموو دنیا منداڵان لە کوچە و کۆڵانەکان سەرگەرمی یاریی فوتبۆڵێنن، پێش ئەوەی بە ڕێ بکەوین شۆفێرەکەمان وەکوو ڕێزگرتنێك لە میوان، سەرو سێومان پێ دەدات.

لەبەردەم خانوویەکی کۆندا دادەبەزین، بەنێو ژوورێکدا تێپەڕ دەبین، کە خەڵکی خەریکی نوێژن، قەرارە ئێمە لە ژووری پشتەوە چاوەڕوان بین. بۆنی گازوایل دێت، بە تەختەی سەر دیوارەکەدا وادیارە ئێرە پێشتر قوتابخانە بووە. لەسەر قەفەسێك نارنجۆك

دانراوە، لەپشت مێزی پەڕاوگەکەوە ژمارەیەکی زۆر کلاشینکۆف و لەسەر مێزەکەش کۆنترۆڵی پلەیستەیشن دانراوە .

خەڵکی ئێرە تا بڵێی لەگەڵمان میهرەبانن. یەکێك لەوانەی کە لەگەڵ ئێمەدا قسە دەکات، خەڵکی مەراکیشە. لەگەڵ ئەو بە زمانی فەڕەنسی قسە دەکەین. چەکدارێکی میهرەبانی داعشی باس لەوە دەکات کە نزیکەی ٥٠٠٠٠ چەکداری بیانی لەنێو دەوڵەتی ئیسلامی دایە. ئەو دەڵێ ژمارەی وردیان نازانم، بەڵام بێگومان ٥٠٠٠٠ کەسێك دەبن، ئەو چەکدارانە هەریەکەو لە گۆشەیەکی ئەم جیهانەوە هاتوون. ئیشوکار و ئەرکی ئەم چەکدارەی داعش بریتیە لە ناونووسین و تۆمارکردنی ئەندامە نوێکانی داعش، ئەوانەی بە تازەیی دێنە نێو دەوڵەتی ئیسلامییەوە .

بۆ ئەو گرنگە کە ئێمە هیچ شتێك هەڵنەگێڕینەوە و نەیگۆڕین، لە ڕۆژئاوا تا بڵێی شتێلێکی نادروستیان دەربارەی ئیسلام پێ گوتووین. بۆ سبەینێ دەتوانین هەموو ئەو شارانەی کە حەزمان لێیە بگەڕێین و وێنەیان لێ بگرین. تێگەیشتن لە قورئان کارێکی دژوارە. پێویستە مامۆستایەکت هەبێت، زۆرێك لە موسڵمانانیش بە ڕاستی لە قورئان تێناگەن. تەنها دەوڵەتی ئیسلامیی بە کردەوە ئیسلامی ڕاستەقینەیە، ئیسلامی زیندووە. ڕۆژئاوا دژی ئیسلام دەجەنگێت، هەروەها یارۆ دەڵێ: "ئایینی ئێمە ئایینی ئاشتەواییە" .

لاف ئەوە لێ دەدات کە گرتەڤیدیۆییەکانی داعش بە قەستی تۆمار دەکرێن، تا ترس لە دڵی دوژمنان دروست بکەن. ئەم کارانە وەڵامێکن بۆ شەڕە توندڕەوانەکانی ڕۆژئاواییەکان لە دژی جیهانی ئیسلامی. تەواوی خۆشبەختیی و پێشکەوتنەکانی ڕۆژئاوا لەسەر حیسابی نەوت و گازی جیهانی سێیەم دێت. عەرەبەکان ناچارن نەوتەکەیان لە ڕووسەکان هەرزانتر بفرۆشن. ئەو دەڵێت: "ئێمە وەحشی نین، دەمانەوێ بە ئاسوودەیی بژین، لە جەنگی ڕۆژئاوای دژ بە ئیسلامدا، ئەمریکا ڕۆڵی قەساب و موسڵمانانیش وەك کاوڕ دەبینرێن. زیاد لە ٥٠ دەوڵەت لە دژی ئێمە پیلان دەگێڕن، بەڵام هەرگیز ناتوانن شکست بە ئێمە بهێنن. قودرەتی ئێمە لە چەك، پارە یاخود لە بە توانایی و لێهاتوویی

چەکدارەکانماندا نییە، بەڵکوو ئەو ڕاستییەیە کە ئێمە لەسەر حەقین." لێرە تەنها چەند هێرشێکی ئاسمانی پەرتەوازە دەبینرێت، ئەویش زۆر جێی ترس و نیگەرانی نین.

سەرکۆماری هەموو وڵاتە عەرەبییەکان موسڵمان نین، ئەوان ژێردەستە و ئەڵقەلەگوێی ڕۆژئاوان. لەگەڵ ئەوەی کە سەروەت و سامانێکی زۆریشان هەیە، بەڵام ئەوان گومڕان. من لە وەڵامی کابرادا دەڵێم سەرپێچیکردنی عەرەبەکان بە شێوازێکی زەق بۆ من قابیلی تێگەیشتنە، بەڵام کردەوە نەفرەتییەکانی داعش بواری بەرگریکردن لە میللەتە موسڵمانە ژێردەستەکان سەخت و دژوارتر دەکەن، چونکە وادیارە ئەم جۆرە کارانە بە دیوێکد بەرگریکردنە لە گروپی داعش نەك ئیسلام. من سەرسەختانە دژی توندوتیژیم، هەربۆیەش خۆشم لە کوشتارگە و کردەوە توندڕەوییەکانی داعش نایەت. ئەگەر گاندی لە جێگەی ئێوە بووایە بێگومان لە جیهانی عەرەبیدا دەیتوانی ڕێگاچارەی باشتر و سەرکەوتووتر پەیدا بکات، بەبێ توندوتیژیش. لەکوێ نووسراوە کە مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی ماف و ئامانجە ڕەواکانی خۆی دەبێت تەنها دەست بۆ توندوتیژی ببات و لەو ڕێگەیەوە دەستەبەری بکات؟

پیاوە مەراکیشییە میهرەبانەکە لە وەڵامدا دەڵێت، ئەوان پابەندن بە یاساکانی خواوەندەوە، بەهۆی داوێنپیسیی و ماددەی هۆشبەر و شەڕ و پارەپەرستییەوە، ئێمەی ڕۆژئاوایی لە ڕووی ئەخلاقییەوە فاسدین و بەرەو هەڵدێر هەنگاو دەنێین

من باسی چاکە، خێرخوازیی، بەخشندەیی و پێکەوەهەڵکردنی سەرکردەی کورد سەلاحەدینی ئەیوبی لەگەڵ مەسیحییەکان دەکەم، لەکاتی فەتح و ڕزگارکردنی ئورشەلیم، کابرای مەراکیشیی دەڵێت ئەگەر ئێمەش لە جەنگدا سەرکەوتن بەدەست بێنین ئەوا بە نەرمونیانی و بە باشی ڕەفتار دەکەین. ئێمە بەگوێرەی قورئان و شەریعەت لە ژیاندا دەژین، لەم ڕووەوە ئێمە لەسەر حەقین.

کابرای مەراکیشیی دووبارەی دەکاتەوە و دەڵێ ئێستا لێرە لە ئاسایشدا دەژین، ئەویش گوایە لەبەر ئەوەی کە ئەوان لەسەر بنەماکانی شەریعەتی ئیسلام دەژین و هیچ کاتێك یاسا و پەیمانەکان لەژێر پێ نانێن و نایشکێنن. ئەوان بەڵێنیان بە ئێمە داوە و

پابەند دەبن پێیەوە. مەسیحییەکان لە شاری ڕەققە و موسڵ و لەوێ دەژین، ئەوان دەتوانن بێ هیچ سنوور و لەمپەرێك لە ژیانی ئاسایی خۆیان بەردەوام بن. ئەو پێمان ڕادەگەیەنێت کە هەرگیز نایەوێت بگەڕێتەوە بۆ مەراکیش، ئەگەر بگەڕێتەوە ئەوە یەکڕاست قۆڵبەست دەکرێت و فڕێ دەدرێتە زیندانەوە.

گەنجێك بە کیسەیەکی سپییەوە دێتە ژوورەوە، مریشکی سوورەوەکراو، پەتاتەی سوورکراوە (فینگەر)، نانی بەربەری سووریی، ماست و سیر، پیپسی و دۆی ئایرانی هێناوە، هەموو شتەکان نایابن. ئێمە لەسەر زەوی دادەنیشین و لەسەر پارچەیەکی ناسك نان دەخۆین. مریشکە سوورەوەکراوەکە بێئەندازە بەلەزەت و خۆشتامە. پێش نانخواردن سەری پیپسییەکانیان هەڵپچڕیوە. چی تر پێگەکەمان ڕوونتر بووە، تا ئێرە ڕەفتار و هەڵسوکەوتیان لەگەڵمان باش دیارە، وادیارە تا ئەم چرکەیە باسوخواسی ڕفاندنی مرۆڤ لە گۆڕیدا نییە، بە پێچەوانەوە وادیارە چاودێریی سەلامەتی ئێمە دەکەن و بەردەوام شتێکمان پێ تەعارف[٤٨] دەکەن، وەکوو پەتوو، پاڵشت. "دەتەوێ بوخارییەکە داگیرسێنم؟ دیسان شتێك دەخۆیت بۆت بێنم؟"

لە ژوورەکەی تەنیشتمان، چەکدارانی داعش سەرقاڵی خواپەرستی و عیبادەتن. شەش سەرباز لە ڕیزێکدان، دانەیەکیش بۆ پێشنوێژی لە پێشەوە وەستاوە، هەموویان ڕووەو مەککە (قیبلە) ڕاستاون. هەروەکوو چۆن لە قورئاندا هاتووە. دوای نوێژ لەگەڵ سێ کەسیان گفتوگۆ دەکەین، بیست و چەند ساڵێك تەمەنیانە و لە شاری فرانکفۆرتەوە هاتوون. دەپرسن: "لێرە چی دەکەیت؟" سەریان سووڕماوە. بەڵام بلێی و نەڵێی کەمێکیش خۆشحاڵ دێنە پێش چاو، زۆرتر لەوە سەریان سووڕماوە ئێمە وەکوو شەڕکەر نا، بەڵکوو وەك ڕۆژنامەنووسێك بۆ ئێرە هاتووین. لەوەی کە ئێمە بە بەڵێننامەی بەرپرسە باڵاکانیان سەفەرمان کردووە، زۆر کاریگەربوون. ئەمە لەگەڵ ئەو شتانەی کە لە ڕێگەی گرتەڤیدیۆییە پڕوپاگەندەییەکانی داعشەوە بینیبوومان، زۆر جیاوازتر بوو.

---

٤٨- خولککردن، ڕێزگرتن، فەرمووکردن لە کەسێک بۆ نانخواردن یان هەر شتێکی تر.

شەڕکەرێك کە نەختێك قەڵەوە دێتە نێو ژوورەکەوە، دەمانچەیەك و کڵاشینکۆفێکی پێیە، پشتوێنێکی خۆتەقاندنەوەی لە دەوری کەمەری بەستووە. پیاوە مەراکیشییەکە ئەوەمان پیێ پیشان دەدات، کە کەمەربەندی خۆتەقاندنەوە چۆن بەکاردەهێنرێت، ئەو کەسانەی کە لەشولاریان سووك نییە و ناتوانن بە باشی لە دەستی دوژمن هەڵبێن. هەمیشە لە کاتی ئەنجامدانی چالاکییە سەربازییەکاندا ئەم پشتوێنانە لە خۆیان دەبەستن. بەم جۆرە لە دوا چرکەکانی ژیانیان دەتوانن خۆیان بتەقێننەوە و بەم کارەیان، ژمارەیەکی زۆریش لە دوژمنان بکوژن. بەگوێرەی قسەی ئەڵمانییەکانی ئەو شوێنە، پشتوێنەکە تا نزیکەی ٣٠ مەتر کاریگەریی هەیە و دەتوانێ زەرەروزیانی هەبێت. چەکدارانی چاونەترس و خۆبەخشەکانی[٤٩] یەکە تایبەتەکانیش پشتوێنی خۆکوژییان هەیە، لە جەنگەکاندا ئەم پشتوێنانە دوا چەکی دەستی ئەوانە .

پشتوێنە قاوەییەکە لە خۆم دەبەستم، سەیرم لێ دێت هێندە سووکوسۆڵە، تەنها چەند کیلۆیەك کێشیەتی و بە تەواویی بە لاشەتەوە دەنووسێت و لەژێر چاکەتەوە کەس ناتوانێت ببینێت. وام دانابوو لەمە نارێکوپێکتر بێت.

لەوێدا فریدریك کەمێك لێم تووڕە بوو. شەڕکەرە داعشییەکانیش کەمێك نیگەران دەبن. کە پشتوێنەکە دادەنێم هەموویان هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەکێشن.

جانتاکانمان هەڵدەگرین و لەگەڵ دوو پاسەوانە تازەکەمان سواری ترۆمبێلێکی ڕەشی مۆدێلبەرز دەبین. هەرچۆنێك بێت ئەمەیان فراوانترە و جێگای زیاترە وەك لە ترۆمبێلەکەی پێشتر، دوو چەکدارەکەی داعش لە پێشی ترۆمبێلەکە و ئێمەش لە پشتەوەیان دادەنیشین. بە ڕاستی ئەم جێگایە خۆشە. ڕادیۆکە پێدەکەین، ئەو سروودانە کە خۆیان پێی دەڵێن (نەشید) پەخش دەکەن. ئاهەنگەکان زۆر خێرا و توندوتیژ نین، بەڵکوو بەهۆی هەماهەنگی زۆری لەگەڵ فەزاکەدا بە ڕاستی زۆر خۆشە و چەند کۆپلەیەکیشی بڵێیت و نەڵێیت مرۆڤ هیپنۆتیسم دەکات .

---

٤٩- فیدائی

مـن و فـيردی بـه ئـه‌ڵمانیی له‌گـه‌ڵ یـه‌كتر قسـه ده‌كـه‌ین، بـه‌ڵام هـه‌م یـه‌كێك لـه پاسه‌وانه‌كان كه شێوه‌ی گـه‌نجێتی بـن لادن ده‌دات، هـه‌م شـۆفێره‌كه‌شمان كـه‌وا تۆزێـك قه‌ڵـه‌وه و هـه‌موو ده‌موچـاوی داپۆشـیوه، هـه‌ردووكیان نـه‌ك تـه‌نها زمـانی ئینگلیزیـی و فه‌ره‌نسـی، بـه‌ڵكو كـه‌مێكیش ئـه‌ڵمانی ده‌زانـن. فریـدریك ده‌ڵێـت: "داعـش یه‌كه‌یـه‌كی فره‌نه‌تـه‌وه‌یی هه‌یـه، بـه‌ڵام پـێ ده‌چـێت پاسـه‌وانه‌كانی ئێمـه‌یان بـه قه‌سـتیی و بـه كارامه‌ییه‌وه هه‌ڵبژاردبێت. بۆیه نایانه‌وێت پێمان بڵێن خه‌ڵكی كـام وڵـاتن و لـه‌كوێ زمـان فێربوون."

كه‌م كه‌م هه‌وا تاریك ده‌بێت و ئێمه‌ش هه‌ر نازانین بۆ كوێ ده‌چین. جارجار تابلۆیه‌كی هاتووچۆی شۆفێریی نادیـار یـاخود تابلۆیـه‌كی بچـووكی نـاوی ناوچـه‌كان ده‌رده‌كـه‌وێت، به‌ڵام ڕاستییه‌كه‌ی ناتوانین هیچ شتێك بخوێنینه‌وه، تـا كـار ده‌گاتـه ئـه‌وه‌ی لـه شـوێنێك ڕاده‌وه‌ستین. لای ڕاستمانه‌وه دیـواری مولكێـك ده‌بیـنین كـه نزیكـه‌ی ٢ مـه‌ترێك بـه‌رزه، ده‌رگایه‌ك ده‌كرێته‌وه و گه‌نجێك دێتـه ده‌ره‌وه و ئاماژه‌یـه‌ك بـه پاسـه‌وانه‌كانمان ده‌دات. ئێمه پیاده ده‌بین، شته‌كانمان هه‌ڵـده‌گرین و ده‌چـینه نێـو حه‌وشـه‌یه‌كه‌وه ڕووبه‌ره‌كـه‌ی نزیكـه‌ی ١٦٠ مـه‌ترێك ده‌بێـت، مـاڵێكی زۆر گـه‌وره‌یـه و به‌سه‌رسـووڕمانه‌وه ده‌چـینه ژووره‌وه، خانوویه‌كی ناته‌واوه.

جگه له سۆپایه‌كی گازیی و چه‌ند دۆشـه‌كێكی هـه‌وریی ناسـكی ڕه‌ش هـیچ شـتێك لـه ژووره‌كه‌مانـدا نییـه، بڕیـاره شـه‌و لێـره بخـه‌وین. بـن لادنـی لاو و باڵابـه‌رز، ئاوده‌سـت و گه‌رماو و ژووری چێشتلێنانمان پێ پیشان ده‌دات. ڕووبه‌ڕووی ژووره‌كه‌ی ئێمه ژوورێكیتر هه‌یه، كه بۆ ئێمه نییه بچینه نێو ئه‌و ژووره‌وه، له‌و ژووره ئه‌و چه‌كداره داعشـانه‌ی لێـره ده‌ژیـن، ده‌خـه‌ون. هـه‌موو شـته‌كانی ماڵه‌كـه زۆر نارێـك و سـاده‌یه و لـه ئاسـتی بـژێویی كه‌سێكی زۆر ساده دایه. له‌سه‌ر ئاوده‌سته‌كه‌ی نامـه‌وێت هـیچ بڵـێم، بـه‌ڵام ڕاسـتییه‌كه‌ی ئه‌م شتانه بۆ ئێمه زۆر گرنگ نین. هه‌نـدێك جـار سـاته‌وه‌ختێك دێتـه پێشـه‌وه كـه تێیـدا ئامرازه‌كانی خۆشگوزه‌رانی  لای مرۆڤ هێنده گرنگ نین .

دوای ئـەوەی لـە ژوورەكـەمان لەسـەر زەوی دادەنیشـین، بـن لادنـی لاو پێمـان ڕادەگەیەنێت ئەوەڵ خۆتان دەپشكنرێن، دواتر هـەموو جانتاكانتـان. ئەمـە پشـكنینێكی ئەمنیی سادەیە. من لەو كاتەدا بیر لە دەرمانـە تایبەتـەكانم دەكەمـەوە و بۆ ماوەیـەكی كەم هەناسە لە سینەمدا قەتیس دەبێـت.

لەگەڵ پشـكێنەرە لاوەكـەی داعش دەربـارەی خـوا و جیهـان قسـە دەكـەم. هـەروو لەگەڵ یەك هاوڕا نین و بۆچوونی جیاوازمان هەیە. فریدریك كـەمێك نارەحەتـە، بـەڵام بـە چپەیەك بە من دەڵێت نابێت هۆشدارییەكانی ئەبوقەتادە لەسەر كوفركردن لـەیاد بكـەم. كەسیش نازانێت داعش كام شتانە بە كوفر دەزانێت. بە بۆچـوونی چـەكدارە داعشـییەكە ئێرە ئەمریكای زلهێز نییە، بەڵكوو لێرە خوا هەیە و ئەو لە بەرەی خوا دەجـەنگێت، هـەر بۆیەش سڵ لە مردن ناكات و هەر خواشە، كە چركەساتی مردنی ئەو دیاری دەكات.

دواتـر چـەكدارێكی تـر، كـە قەڵـەوترە داوام لـێ دەكـات هەسـتمە سـەر پـێ، پاشـان هەموومان پێكەوە چـەند هـەنگاوێك بـۆ ئـەو دیـوی ژوورەكـە دەچـین، دەسـتەكانم بـەرز دەكەمەوە و ئەو هاوشێوەی بەشی پشكنینی فرۆكەخانـەكان، دەسـت بـە پشـكنینی مـن دەكات. هەڵبەتە تا ئێستا هێندە بە وردیی نەپشكنرابووم، بەڵام لەوە دڵنیام كـە شـتێكم پێ نییە تا پەیدای بكەن. دەبێ گیرفانەكانیشم هەڵڕێژم، هەموو كاغەزەكان دەكاتـەوە و تەواوی پاكەتی بنێشتەكان دەگەڕێت، سەری پێنووسـەكانیش لـێ دەكاتـەوە و دەیبـات میلیمەتر بە میلیمـەتر جانتـا و شـتەكانی نێـوی دەپشـكێنرێن. بـەس جێـی خۆشـحاڵییە پاكەتی دەرمانەكان هیچ گومانێك دروست ناكات.

دەپرسم: " بەدوای شتێكی دیاریكراودا دەگەڕێن؟"

- ئامرازی سیخوڕیی، جی، پی، ئێس و شتی لەم شێوەیە!

دەی كەوایە! خۆشبەختانە فریدریك پێش ئەوەی بە ڕێ بكەوین نەیتوانی دەزگایەكی شوێنهەڵگر[50] پەیدا بكات، كە زۆر بچووك بێت و بتوانرێ بشارێتەوە. وامان دانا كە ئەگەر هاتوو ڕفێنراین، ئەو دەزگایەمان پێ بێـت تـا ئـەوانیتر بتـوانن جێگاكـەمان پەیـدا بكـەن.

---

٥٠- ردیاب - GPS

چەند باش بوو کە شتێکی لەم جۆرەمان پەیدا نەکرد و نەهێنا ! ئەوکات ئێستا تووشی سەرێشە دەبووین.

لەگەڵ ئەوەی کە ئەوان خەریکن خۆمان و شتەکانمان دەپشکنن، گفتوگۆکانمان درێژە دەکێشێ و بەردەوام دەبێت. هەندێك لە وتەی چەکدارەکان:

**دەربارەی کوفر:**

تەواوی بێباوەڕان جێگایان لە دۆزەخە، وەزیفەی ئێمە بێدارکردنەوەیانە، چونکە کوفر گەورەترینی گوناهەکانە. ئێمە کردەوەی باش دەکەین و کردەوەکانمان هاوشێوەی ڕەفتاری کەسێکە، کە دەیەوێت فریای کەسێك بکەوێت لە کاتی کەوتنەخوارەوە لە شاخێکی بەرز و لە مردن ڕزگاری بکات، ئێمەش بە هەمان شێوە دەمانەوێت ئەوان لە دۆزەخ ڕزگار بکەین.

**دەربارەی ئایندەی ڕۆژئاوا:**

گەورەترینی شارستانێتەکان لە پاش ماوەیەك دیسانەوە تووشی داڕوخان دەبن. شارستانێتی ڕۆژئاواش تووشی ئەم داڕوخانە دەبێت.

**دەربارەی سزادانەکانی داعش:**

سزادانەکانی داعش بەهرەی ئیلاهی و ڕەحمەتن، چونکە دەبنە مایەی پاکبوونەوە و ڕزگاربوون لە سزاکانی تری دۆزەخ!

**دەربارەی شیعەکان:**

شیعەکان موسڵمان نین، یەکتاپەرست نین، چونکە هاوار و هانا بۆ ئیمامەکانیان دەبەن، ئیمامی (عەلی) و ئیمامەکانی دیکەی خۆیان بە پیرۆز دادەنێن، بەڵام یەکەمین یاسای خوا لە قورئاندا ئەمەیە: نابێت جگە لە خوا هیچ کەسێکی دیکە بپەرستی. بتپەرستیی گوناهێکی گەورەیە و سزاکەی بریتییە لە مردن.

**دەربارەی سوورییەکان:**

لە سەرەتادا میللەتی سووریا بەرانبەر بە دەوڵەتی ئیسلامی زۆر گەشبین نەبوون. بەڵام بەهۆی بۆردومانەکانی ڕۆژئاوا و بۆردومانەکانی دەوڵەتی سووریاوە ئێستە بۆچوونیان گۆڕیوە.

**دەربارەی تورکیا:**

ئەو وڵاتەیە، کە دواتر لەناو دەچێت.

**دەربارەی کاتژمێری فەرمیی خۆیان:**

ئێمە زۆر بە شێوەیەکی سادە کاتە هاوینەکان بەکاردێنین، ئێمە چاولێکەریی ناکەین. بۆ خۆمان ڕابەرایەتیی دەکەین .

دوای کاتژمێرێك لە پشکنینی موبەمو، یەکێك لە شەڕکەرەکان یەك باوەش کیسە دێنێتە نێو ژوورەکەمانەوە. چەرەسات، پیپسی و شەربەتی جۆراوجۆر، کێوی، مۆز و پرتەقاڵی تێدایە. پێم وایە ئەم کوڕە لاوە ئەمریکاییەکە بێت، شێوەزاری ئەمریکایی پێوە دیارە، زۆر قسە ناکات، بەڵام ئەو چەند قسەیە بەس بوو تا بزانین خەڵکی کوێیە. پانتۆڵ و پۆستاڵی سەربازی ئەمریکایی و سویت تیشێرتێکی نیلیی لەبەردایە و لە سەر ڕووی دەموچاویشی ماسکێکی ڕەشی داناوە. کیسەکان دادەنێت و دواتر دیاری نامێنێت. شەڕکەرێکی تری خۆشڕەفتار کە بە زمانی فەڕەنسی قسە دەکات دێتە ژوورەوە و دوو کیسەی تری بە دەستەوەیە، نان و کەبابی تێدایە. سەرەڕای ئەوەی کە زۆرمان برسی نەبوو – ئاخر پێشتر مریشکی سوورەوەکراومان خواردبوو – هەر یەکەمان دوو تیکە نان و یەك دوو تیکە کەباب هەڵدەگرین و کەمێك پیاز و کەرەوزیش دەخەینە سەری و نانەکە دەپێچینەوە و دەیخۆین، بە ڕاستیی بەتامە. ئەگەر بارودۆخەکە بەم شێوەیە بچێتە پێش و بەم جۆرە سەفەرەکەمان بەردەوام بێت، ئەوە هەریەکەمان چەند کیلۆیەکیش کێشمان زیاد دەکات.

شەرکەرە داعشییەکە، کە بە فەرەنسی قسە دەکات، پێمان دەڵێت: هەرچەندە ئەم خواردنە زۆر خۆش و بە تامە، بەڵام درەنگ هەزم دەبێت، هەر بۆیە لە کاتی خواردنی رێگە نادات بە باشی شەڕ بکەین. خواردنی باش مرۆڤ ماندوو و تەمەڵ دەکات. ئەم قسانە وەك بڵێی لە زەوقی مالکولم دەدات، چونکە تازە خەریك بوو چێژی لە خواردنەکان وەردەگرت!

من دەربارەی توندوتیژیی و بێڕەحمیی داعش قسە دەکەم و هەرچەند فریدریك تەماشام دەکات، بەڵام یەك یەکیان ناو دێنم. دەپرسم ئایا ئەم کردەوانە لەگەڵ قورئاندا وێك دێنەوە، کە زۆرینەی سوورەتەکانی بەم دێڕە دەست پێ دەکات: (بە ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان.) دەی کەوایە بەخشندەیی داعش لە کوێدایە؟ داعش بەم هەموو بێڕەحمییەی چۆن دەتوانێ بانگەشە بۆ ئەوە بکات کە کتێبی خوا جێبەجێ دەکات؟ بتەوێ و نەتەوێ ئەم پرسیارە بە بەزاندنی هێڵی سوور لەقەڵەم دەدرێت. بن لادنی لاو وەڵامێکی سادە دەداتەوە: "کەسێك کە بەهێزە دەتوانێ بەخشندە بێت، ئەوەشی کە لاوازە دەبێت وەکوو گورگ وابێت."

شەرکەرێك، کە تۆزێك قەڵەوە، دەربارەی کارە خێرخوازییەکانی من لە ئەفغانستان، ئێراق، سووریا و کۆنگۆ قسە دەکات، ئەو دەڵێت نارەحەتە کە کارە باشەکانی من بەفیڕۆ دەڕوات و هیچ سوودی بۆ خۆم نابێت، چونکە لەو دنیا لە بەرانبەریدا هیچ پاداشتێك وەرناگرم. ئەگەر ئێمە بە موسڵمانی نەمرین، ئەوە هیچ رێگای رزگاربوونێك نییە، تەنانەت کردەوە باشەکانیشمان هەژمار ناکرێن و فریامان ناکەون، لە دنیادا خواوەند تەنها پاداشتی چاکەکانمان دەداتەوە، بە سەلامەتی، خۆشبەختی و شتێلێکیتر، بەڵام لە پاش ئەوە ئیتر هیچ سوودێکی نابێت. من پێی دەڵێم ئێمە هەرگیز پاداشتمان ناوێ، دیاریشە کاتێك کەسێك پارە دەبەخشێ بەو مانایە دێت کە پارەدارە، ئەم کارە جۆرێکیشە لە پاشەکەوتکردن. ئەو شتەی کە زۆر گرنگە ئەمەیە، کە مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤەکان چۆن رەفتار دەکات، گفتوگۆکەمان بە هیچ ئەنجامێك ناگات.

دواتر باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە شەڕکەرانی داعش بە تەنیایی بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی نایەن، بەڵکوو زۆرجار بە خاوخێزانەوە ڕوو لە ئێرە دەکەن. هەر شەڕکەرێك، ئەگەر خێزانی هەبێ، دەتوانێ خێزانەکەی بۆ ئێرە بێنێت و خانوویەکیشی پێ دەدرێت. مافی دیاریکراو و نەگۆڕیشیان هەیە. شەڕکەران و فەرمانبەرانی دەوڵەتی ئیسلامی لە بەرانبەر خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان هیچ پارەیەك نادەن، زۆرێك لە شتەکان باشترە وەك لەوەی کە میدیا ڕۆژئاواییەکان پیشانی دەدەن. زۆرێك لە شتەکان وەکوو ژیانە لە بارودۆخێکی ئاسایی و نایابدا. هەندێك لە خێزانەکان تەنها لە پشووەکاندا دێنە ئێرە، بۆ ئەوەی چاویان بە خزم و دۆستەکانیان بکەوێت و پاشان بۆ وڵاتەکانی خۆیان دەگەڕێنەوە

بە بۆچوونی بن لادنی لاو دواتر دەوڵەتی ئیسلامی بە ئەندەلوسەوە گرێ دەدرێت و دەبێتە ناوەندی زانست و ئایین. گەرچی ئەمە تەنها بۆچوونی ئەو نییە، بەڵام ئەو باوەڕی بەوەیە، کە ڕۆژێك ئەم خەونەی دێتە دی و ئەم شتە ڕوو دەدات. ئەم بن لادنە لەگەڵ کەسایەتیی ئەو شەڕکەرانەی کە مرۆڤ لای خۆی بیری لێ دەکاتەوە، زۆر جیاوازترە. ئەو پێشتر بۆ یاریی ئیسکی سەردانی وڵاتی نەمسای کردووە، لە هەوادارە سەرسەختەکانی فوتباڵە و لە وەرزشیشدا شارەزاییەکی باشی هەیە. ڕاستییەکەی ئەو لە زۆر ڕووەوە هاوشێوەی ئێمەیە، بەڵام جیاوازییەکەمان لەوەدایە کە ئەو بۆ ڕێکخراوێکی تیرۆریستیی ئیش دەکات.

نزیکی نیوەشەو میواندارەکانی[٥١] ئێمە خواحافیزیی دەکەن، دەبێت یەکێك لەم شتانە هەڵبژێرین، یان مۆبایلەکان و لاپتۆپەکانمانیان تەسلیم بکەین، یاخود یەکێك لە چەکدارەکان بەهۆی هەندێك مەسەلەی ئاسایشییەوە لامان دەمێنێتەوە. داعش دەیەوێت دڵنیا بێت لەوەی، کە ئایا ئێمە پەیوەندیی بە هیچ کەسێکەوە ناکەین. ئێمە دەزگا ئەلیکترۆنییەکانمانیان ڕادەست دەکەین. غافڵی ئەوەش دەبین کە چیتر دەبێ لە ژوورێکدا پێکەوە بخەوین، چونکە لێرە بەدوا دەبێ پێکەوە بخەوین و زۆر ئاسایی دەبێت و هەر زووش لەگەڵیدا ڕادێین.

---

٥١- میزبان- خاوەنماڵ- خانەخوێ

## ڕۆژی دووەم

**یەکشەممە، ٧ـی دیسامبەری ٢٠١٤**

کاتژمێر چواری بەیانییە. چەکدارانی داعش خۆیان بۆ نوێژی بەیانی ئامادە دەکەن. گوێم لە دەنگی خۆیان و پێ و هەنگاوەکانیانە، پاش ئەوە قاوەڵتییەکەیان لە چێشتخانەکە ئامادە دەکەن. لەخەوهەستان لەو کاتژمێرەدا بۆ من زۆر زووە، هەر بۆیە لەسەر جێگەکەم دەمێنمەوە و دیسان دەخەومەوە. پێنج کاتژمێر دوای ئەوە لە خەو هەڵدەستین. ئەو چەکدارەی کە شێوەزاری ئەمریکی هەبوو هێندە بە توندیی لە دەرگا دەدات مالکولم وا دەزانێت پۆلیسی سەر سنوورە[52] هاتووەتە سەرمان. بە ترسێکەوە لە خەو ڕادەچڵەکێت. دەرگا دەکرێتەوە و شەڕکەرە ئەمریکییەکە دێتە ژوورەوە و دەپرسێت: "چی دەخۆن بۆتان بێنم؟ هێلکە؟ چایی؟[53] میواندارێتیی بە تەرزی داعش، بۆچی نا؟"

بەهەرحاڵ دوای دە خولەك بە هێلکەوڕۆن، ماسیی قوتو، نان و چاییەوە دەگەڕێتەوە و ئێمەش کەمێك خۆمان کۆدەکەینەوە. پێمان دەڵێت: "فەرموون قاوەڵتی ئەسڵی داعشیی!"[54] دوای ئەوەی قاوەڵتییە تایبەتەکەی داعشمان بۆ دێنێت، هەوڵ دەدات زوو بگەڕێتە دواوە.

فریدریك پرسیاری لێ دەکات: "تۆ خەڵکی 'نیوجێرسی' نیت؟"[55] شێوەزارەکەی، دۆستەکانی فریدریك لە فرانکلین لیکس[56] ـی نیوجێرسی دێنێتەوە یادی، ئەو لەم ڕووەوە دڵنیایە.

---

52- GSG9

53 You guys need anything? some eggs? Tea?

54 There you go. Typical IS breakfast

55 Are you from New Jersy?

56 Franklin Lakes

فریدریك دەڵێت بە شێوەزارەکەتدا دیارە تۆ خەڵکی نیوجیرسیت[57]، هەر لەم نزیکانە[58]. ئەو دەڵێت: "ئەمەت چۆن زانی؟"[59] لەمە زیاتر هیچ ناڵێت، پێ دەکەنێت و دواتر دەگەڕێتەوە بۆ لای هاوڕێ داعشەکانی.

کاتی چوونە حەمام پێنج کەس لە چەکدارەکانی داعش دەبینم لە نێو حەوشەکە لەبەر خۆرەتاو دانیشتوون و پێکەوە گفتوگۆ دەکەن. پێدەچێت سێیانیان تەمەنیان لە دەوروبەری بیست ساڵ بێت، دووانەکەی تر وادیارە سی ساڵیان تەواوکردووە. بە جۆرێک هەموو شتەکان چاوەڕوان نەکراون، ئێمە لای هێزەکانی داعشین و ئەوانیش زۆر بەڕێزەوە رەفتارمان لەگەڵ دەکەن، ئەویش لە ناو جەرگەی ناوچەیەکی جەنگیدا. هیچ یەکێکمان تا چەند رۆژ پێش بیرمان لێ نەکردبووەوە کە بەم شێوەیە لەگەڵمان هەڵسوکەوت بکەن بەڵام گوایە کۆتاییەکی تاڵ چاوەڕێمان دەکات؟

ئێمە پێشنیوەڕۆ دێینە نێو حەوشە و چاوەڕوان دەبین، بە خۆڕایی لە بەر ئەم خۆرەتاوە دانیشتووین و کەیف دەکەین، گوێمان لە دەنگی بۆمب و تەقینەوەی تۆپ دەبێت کە لە دوورەوە دێت، بەڵام هیچ کەس گوێی پێ نادات. چەکدارەکان لە پێشمان دادەنیشن و دەپرسن چی بەرنامە و پلانێکمان هەیە، ئەزقەزا ئێمەش دەمانەوێ هەمان پرسیار لەوان بکەین، بەڵام چەکدارەکان زۆر لێهاتوو و شارەزان و لە هیچ بارودۆخێکدا کەسایەتیی راستەقینەی خۆیان ئاشکرا ناکەن. تەنها بە گومان و مەزەنە دەتوانین هەندێك شت لەبارەی ژیانی پێشتریانەوە بزانین. زیاتر دەربارەی ئایندە قسە دەکەن بەڵام لەسەر رابردوو کەمتر و هیچ ناڵێن. کابرای ئەمریکی کە قاوەڵتییەکەی بەیانی بۆ هێناین، دواتر دان بەوەدا دەنێت کە خەڵکی نیوجیرسی ئەمریکایە. ئەو پێشتر لە هاتورن[60] کە بیست خولەك لە پاترسون[61]ـەوە دوورە کاری کردووە. فریدریکی کوڕە ئەو ناوچەیە وەکوو ناولەپی خۆی شارەزایە.

---

57 You sound like you re from Paterson jersy
58 Close-fast
59 What makes you think that?
60 Howthorne
61 paterson

ئەم ڕستانە لە کابرای خەڵکی نیوجرسی دەبیسین: "ئەگەر ئەمریکاییەکان بێنە سۆراغی دەوڵەتی ئیسلامییەوە ئەوا ئەزموونی فەللوجە دووبارە دەکەنەوە" یان "زیاد لە سەد ساڵە موسڵمانان سەرکوت دەکرێن، هەر بۆیە ئێمە تا کۆتایی لە ململانێکردن بەردەوام دەبین، بۆ ئەوەی پارێزگاریی لە هەژارەکان بکەین." بەردەوام هەوڵدەدا پێمان بڵێت کە کێشەیان لەگەڵ مەسیحیەکان نییە و نابێت، تەنها پێویستە خەراجێکی کەم بدەن. ئەمە تەنها باجێکە کە دەبێت بە دەوڵەتی ئیسلامی بدەن. ئەو وەکوو خۆی هیچ ڕێزێك بۆ جوولەکەکان دانانێت، بەڵام داوای لێبووردنیش دەکات و دەڵێت ئەم بۆچوونەی بۆچوونی شەخسیی خۆیەتی. ڕقی ئەو لە جوولەکەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە لە ئەمریکا بووە. دەڵێت: "ئەم ڕقە وەکوو زار و و زمان وایە، تەرکی عادەت سەختە"[٦٢]، فریدریك باسی باشەی دۆستە جوولەکەکانی لە نیویۆرك دەکات، بەڵام ناتوانێت بۆچوونەکەی ئەو بگۆڕێت.

چەکدارە ئەمریکییەکە بە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستەوخۆی ئەمریکییەکان خۆشحاڵ دەبێت، هیواخوازە ئەمریکا هێزە زەمینییەکانی خۆی بۆ سەر داعش بنێرێت. کۆتائارەزووی ئەوەیە دژی هێزە ئەمریکییەکان شەڕ بکات. بە پێکەنینەوە دەڵێت: "هەندێك لە چەك و تەقەمەنییەکانی ئەوانمان لەبەردەست دایە، زۆر حەز دەکەین ئەو باقی چەکەکانیشیانمان بە غەنیمەت دەست بکەوێت."

مالکولم لای لاوێك کە لە باخەکە دایە ماوەتەوە. من و فریدریك دەچینە سەربانەکە و لەگەڵ دوو چەکداری داعش دەربارەی ئێراقی زەمانی سەدام حوسێن گفتوگۆ دەکەین. من باسی هێزە بەرگریکارە ئێراقییەکانی ڕومادی دەکەم، کە لە ساڵی ٢٠٠٧دا دیتبووم. یەکێك لەو دوو چەکدارە وا دیاربوو ماوەیەکی زۆرە لە ئێراقدا شەڕ دەکەن، ئەوان دەڵێن ئەو کاتە لەگەڵ ئەو گرووپە بەرگریکارە عەشایەرییەدا بوونە و سەرقاڵی بەرگریکردن بوون، بەڵام لەم نێوانەدا وەك بڵێی تەنها وەڵامی ڕاست و دروستی پرسیار و ئارەزووەکانیان لای داعش دۆزیوەتەوە.

---

62 Its like the accent. Its difficult to lose it.

زۆر حەزمان کرد بێینە دەرەوە و سەردانی ئەو گوندە بکەین کە ٥٠٠ مەتر لە ئێمەوە دوور بوو، بەڵام چەکدارەکانی داعش دەڵێن بەگوێرەی دەستوورەکان جارێك ناتوانین لەم خانووە دەربچین. نابێت هاوکات هەموومان پێکەوە لە سەربان بین. نابێت بێهودە سەرنجراکێشین. لە کۆتاییدا، دەنگی چەکی قورس و تەقەینەوەی تۆپ دەهاتە بەر گوێمان.

کاتژمێر سێ دەرگای حەوشە دەکرێتەوە، بن لادنی لاو هەرچۆنێك بووە ئەو هەواڵە خۆشەمان بۆ دێنێت کە دەمێکە چاوەڕوانین. دەبێت بە ڕێ بکەوین. دەبێت جانتاکانمان لەگەڵ خۆمان بێنین. پێنج خولەك پاش ئەوە بە جانتاکانمانەوە دەچینە دەرەوە.

ئەو لەوێیە! ئەبوقەتادە![63] کێشی نزیکەی ١٥٠ کیلۆ دەبێت، بتەوێ و نەتەوێ درێژیی و پانی وەکوو یەکە. ڕیشێکی چڕوپڕی خەنەیی هەیە. کریستیان ئا. ئیلیاس ئەبوقەتادە جلێکی شینی عەرەبی لەبەرکردووە و دەستماڵێکی سووریشی لەسەری ئاڵاندووە.

وەکوو پێشوازیکردن باوشمان بۆ دەکاتەوە، ئەم ڕەفتارە لەنێو وڵاتە عەرەبییەکاندا باوە، بە نیشانەی بەخێرهاتن یەکتر لە باوەش دەگرن. فریدریك بە گاڵتەوە، بەڵام بە شێوەیەکی جدیی دەڵێت: "ئاخریی هاتی!" ئەبوقەتادەش هاوڕێیەتی دەکات و بە بزەیەکەوە وەڵام دەداتەوە: "بەڵێ، هاتم".

جانتا و شتومەکەکانمان دەخەینە پشتی ئەو پیکابە سپییەوە، کە ئەبوقەتادە و شۆفێرەکەی پێی هاتوون، دواجار بەرەو شاری ڕەققە بە ڕێ دەکەوین. شۆفێرەکەمان سەروچاوی بە شاڵێکی ڕەش و خۆڵەمێشیی وەها داپۆشیوە، تەنها لوت و چاوی دەبینرێت. بە هێواشی و بە شێوەزارێکی خۆش بە ئینگلیزیی سڵاوێك دەکات.

لەبەر هەندێك مەسەلەی ئەمنیی ناتوانین بە جادە سەرەکییەکەدا بچین، ناچارین بە چۆڵەوانیدا بڕۆین. سێ کاتژمێری پێ دەچێت تا دەگەینە شوێنی مەبەست. ئەبوقەتادە لاف ئەوە لێدەدات کە ئابووری دەوڵەتی ئیسلامی بوژاوەتەوە. تەقریبەن هەموو

63 Christian E.Alias Abu Qatadah

دووکانەکان دەرگایان کراوەتەوە. زۆرێك لە خەڵکی سەرقاڵی کڕینن، بە تایبەت لە بازاڕە گشتییەکاندا. ژیان بە شێوەیەکی سادە دەگوزەرێت. پڕۆژەی دروستکردنی باڵەخانەی نوێ سەرنجی ڕاکێشاوین. ئەبوقەتادە دەڵێت: "ئەو شوێنەی بۆردومان نەکرێت، ژیان تیایدا بە شێوەیەکی ئاسایی بەڕێوە دەچێت، لە ڕەققەش وەهایە."

ئەبوقەتادە پێمان دەڵێت بۆ ئەوپەڕی دنیا دەتانبەین، بۆ (الرای) لە ڕۆژئاوای دەوڵەتی ئیسلامی لە شاری حەلەب دەتانبەین، ئەو ناوچەیە ٢٠٠ کم لە شاری ڕەققەوە دوورە. مانگی (مەی) ساڵی پار دەستیان بەسەر ئەم ناوچەیەدا گرتووە. دواتر کەمێك قسە لەسەر شەریعەتی ئیسلامی دەکات.

ئەگەر کەسێك دزیی بکات و نرخی ئەو شتەی کە دزیویەتی لە ٤٠ دۆلاری ئەمریکی زیاتر بێت، ئەوکات دەستی دزە دەبڕدرێت. ٤٠$ دەکاتە یەك گرام ئاڵتون .

مەسیحییەکان دەبێت جزیە بدەن، بڕەکەشی بۆ هەژاران و دەستکورتەکان نزیکەی ٣٠٠ دۆلاری ئەمریکی و بۆ دەوڵەمەند و پارەدارەکان ٦٠٠ دۆلاری ئەمریکییە لە ساڵێکدا، بەڵام ئەمە تەنها باجێکە کە لە خەڵك وەردەگیرێت. مەسیحییەکان لە ڕیزی چینە دەوڵەمەندەکانی کۆمەڵگەی دەوڵەتی ئیسلامی هەژمار دەکرێن، ئەوان دەتوانن تەنها بە فرۆشتنی چەند مەڕێك پارەی جزیەکەیان کۆبکەنەوە.

موسڵمانەکانیش باجەکەیان بریتییە لە زەکاتبەخشین، ئەویش بەگوێرەی ئاستی بژێویی کەسەکان دیاریی دەکرێت، هەر بۆیە موسڵمانە دەوڵەمەندەکان زیاتر لە مەسیحییەکان و موسڵمانە هەژارەکانیش کەمتر لە ئەوان باجوخەراج دەدەن. ئەم پارانە دەخرێتە خزمەتی پڕۆژە کۆمەڵایەتییەکانەوە. تەنها لە شاری ڕەققە داعش سەرپەرشتی سێ نەخۆشخانە دەکات و بەڕێوەیان دەبات.

لە ئێستادا داعش زۆربەی داراییەکانی لە ڕێگەی دەستکەوتی شەڕ و فرۆشتنی نەوت و باجوخەراجەوە دابین دەکات.

چوار لەسەر پێنجی دەستکەوتە جەنگییەکان بەشی چەکدارانی داعشە و یەك لەسەر پێنجی بە دەوڵەت دەدرێت. لەبەر ئەمەیە کە مووچەی دەوڵەتی چەکدارەکانی داعش

زۆر کەمە. ئەبوقەتادە لەبەرانبەر کارەکەی لە بەشی میدیایی داعش، لە مانگێکدا بڕی ٥٠ دۆلاری ئەمریکی وەردەگرێت، جگە لەوەی کە خانوویەکیشی پێدراوە، بەمە ڕازییە و دەڵێت هێندە بەسە بۆ ژیانم.

لە ڕاستیدا بازاڕی کۆیلە و کەنیزەك فرۆشتن وەکوو ئەوەی ئێمە بیرمان لێ دەکردەوە، وجودی نییە. کۆیلە و کەنیزەکەکان وەکوو دەستکەوتی جەنگیی سەیر دەکرێن، یان بە چەکدارانی داعش دەدرێن، یاخود دەفرۆشرێن. لە ئێستادا نرخی کۆیلەیەکی ئێزیدی ١٥٠٠ دۆلاری ئەمریکییە، ڕێك نرخی چەکێکی کلاشینکۆفە.

بە چەند ناوچەیەکدا تێپەڕ دەبین کە ویلایەتی توسکالی ئیتاڵیام بیر دێنێتەوە، بەڵام جیاوازییەکەی ئەوەیە، کە هەموو شتەکان لێرە هەژارانە و کەمبایەخترە. لەسەر هەندێك لە باڵەخانەکان ئاڵای داعش شۆڕ بووەتەوە، لە هەموو لایەك ئاڵای داعش بەرچاو دەکەوێت، تەنانەت لەسەر جێتێکی جەنگیی وەرگەڕاوی سووریش، کە سەرەوخوار چەقیوەتە زەوی، ئاڵا ڕەشەکەی داعش هەڵواسراوە و دەشەکێتەوە.

50کیلۆمەتری ماوە بگەینە شاری ڕەققە. لە خاڵێکی پشکنین ڕادەوەستین، لاوێکی ١٥ ساڵە بە کلاشینکۆفەکەی دەستی ئاماژەمان پێ دەدات.

شۆفێرەکەمان کە هەموو سەروچاوی داپۆشیوە، هیچ قسەیەك ناکات. تەنها یەکجار قسەی کرد، ئەویش کاتێك فریدریك وێنەی دووکانێکی میوەفرۆشی گرت، ئەویش دەمی چرۆی کرد و قسەی کرد. ترۆمبێلەکەمان ڕاگرت بۆ ئەوەی کەمێك خواردنەوە و خرتکەوپرتکە بکڕین و بیخۆین، ئسپریت و مێرەندا و و پیپسی و... لەو جۆرە خۆراکانە بوون کە ئەبوقەتادە بۆ خۆی و بۆ ئێمەشی هەڵبژارد.

کاتێك دەگەینە شاری ڕەققە دنیا تەواو تاریك بووە، بەڵام هەندێك لە خەڵکی ئەو شارە لە کۆڵانەکاندا دێن و دەچن. بە فلکەیەکی بازنەیی کە چەندین جار لە میدیاکانەوە بینیومانە، تێدەپەڕین، چواردەوری ئەم فلکەیە شیشی ئاسنە، لەم شوێنە سەری دوژمنەکان بە سەری دارەوە هەڵدەواسن. پێشتر وامدەزانی ئەم مەیدانە ترسناکە ڕووبەرێکی زۆر گەورەتری لە ئێستای هەیە. فریدریك بۆی نییە وێنە بگرێت. ئەمە

بۆچوونی کابرای سەروچاوپێچراوە، کە وادیارە زۆر قسەی پێیە بۆ گوتن. ئەبوقەتادە بە شلەژاوییەکەوە ورتەورتێك دەکات و بەڵێن دەدات کە ئەم شتانە لەگەڵ وردەکارییەکانی دیکەی سەفەرەکە، دواتر تۆمار دەکرێن.

بەپێی قسەکانی ئەبوقەتادە پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی شاری ڕەققە نییە، لە میدیاکاندا ئەم شتە زۆر گەورە کراوەتەوە و باسکراوە. ئەم شارە بۆ داعش گرنگییەکی زۆری نییە. لای داعش موسڵ وەکوو شارێکی چەند ملیۆنی گرنگییەکی زیاتری هەیە.

لە پێش کەبابخانەیەك ڕادەوەستین، بۆ ئەوەی شتێك بۆ خواردن بکڕین، تەماشای دەوروبەری خۆمان دەکەین. وادیارە لە شاری ڕەققە ژیانێکی زۆر ئاسایی دەگوزەرێت، هەرگیز ناتوانرێ باوەڕ بەوە بکرێت کە ڕێکخراوێکی تیرۆریستی حوکمی ئێرە بکات و ئێمەش لە ناو جەرگەی تیرۆردا بین. هەڵبەتە ئەو وەختەی کە ئەوان سەری مرۆڤەکانیان بە داردا هەڵدەواسی و مرۆڤەکانیان لە خاچ دەدا، ئێمە لێرە نەبووینە.

فریدریك دەپرسێت چی لە جەستەی بارمتە کوژراوەکان دەکەن، چی لە جەستەی جیمز فولی و ئەوانی تر دەکەن؟ ئەبوقەتادە بە ڕاشکاوانە وەڵام دەداتەوە و دەڵێت: "هەریەك لە شوێنێکدا بە خاکیان دەسپێرین." دەبێ ئەوەش بگوترێت سەربڕین وەکوو سزایەکی مەرگ بڕیارێکی سیاسی داعشە و لەلایەن بەرپرسە باڵاکانی داعشەوە ئەو بڕیارە دەردەکرێت .

مـن دووبارە باسوخواسی لێبوردەیی قورئان دێنمە پێشەوە و دیسان نموونەی سەڵاحەدینی ئەیوبی دەگێڕمەوە، بەڵام ئەبوقەتادە گومانی لە هەقیقەتەکانی نێو مێژوو هەیە. ڕەنگە لەبەر وەرگێڕانی هەڵەی هەندێك لە شتەکان بێت. چونکە پێی وایە لە زۆرێك لە نووسینەوە مێژووییەکاندا بابەتەکانی تایبەت بە جیهاد و شەریعەت لەبەر هۆکاری سیاسی سانسۆر دەکرێن و دەسڕێنەوە، لە سەردەمی پێغەمبەرانەوە تاکوو ئێستا ئەو کارە بوونی هەیە .

من گومانی خۆم لەسەر قسەکانی ئەبوقەتادە دەخەمەڕوو، لەناکاو ڕیزێك ترۆمبێل بە هۆرێنلێدان بە تەنیشتماندا تێپەڕ دەبن. کوڕێك لە پەنجەرەی ترۆمبێلی یەکەمەوە خۆی

دەرهێناوە و دەست ڕادەوەشێنێت. لە ترۆمبێلەکەی پشتەوەی وێنەگرێك دەبینین کە خەریکە فیلم لە ترۆمبێلەکەی دواتر دەگرێت، کەوا بووك و زاوایەکی تێدا دانیشتووە. دڵنیام لە ئەڵمانیا کەس باوەڕ بەم شتانە ناکات، بەڵام لەنێوانی ئەم ۲۰۰ هەزار نیشتەجێبووە سەیر نییە ئەگەر بووك و زاوایەکیشی تێدابێت.

بەردەوام دەبین لە لێخوڕین لەسەر ڕێگاکەمان. لە پێش خانوویەکی چەند نهۆمی ئاسایی ڕادەوەستین. لەم ناوچەیە تەنها ئەم جۆرە خانووانەی لێیە. ئاپارتمانەکەی ئێمە لە نهۆمی دووەمە. کارەبا نییە. هەربۆیە شۆفێرەکەمان دەڕوات تا مۆمێك یاخود لایتێکمان بۆ بێنێت. پێویستمان بە پەتووی زیاتر هەیە. ئەم جارەش وا دیارە دیسان دەبێ هەموومان لەسەر زەوی بخەوین، ئەویش لەم ژوورە سارد و بچووکانەدا. ئاپارتمانەکە ژوورێکی دانیشتنیشی هەیە، ڕێك لە پێشی هۆڵەکەوەیە. هەروەها چێشتخانەیەکی گەڕۆك و گەرماوێکی بێ ئاو و بۆڕیی و ئاودەستێکی نیوەپیسیشی تیایە. هەموو شتەکان زۆر سادەن، بەڵام بەهۆی کیسەخەوێکەوە مرۆڤ دەتوانێت خەوێکی خۆش بۆ خۆی دروست بکات، ئەو تەنها شتەی کە ئێمە هەمانە.

لە ژووری نیشمەنەکە دادەنیشین تا دەربارەی هەندێك لە بابەتەکان قسە بکەین و ساندویچیش بخۆین. ئاپارتمانەکە تاریکە. هەوا کەم کەم سارد دەبێت. پەنجەرەکان باش نابەسترێن. کورسییەکەی ئەبوقەتادە هاوشێوەی کورسی نووسینگەکەی بۆی تەنگ و بچووکە، بەڵام بڕیارە کورسییەکی نوێ بۆ نووسینگەکەی ئەبوقەتادە بهێنن، ئەو کورسییەش لەنێو باڵەخانەی کونسولگەریی ئەمریکا لە موسڵەوە دەهێنرێت. تەماشایەکی لەشولاری خۆی دەکات و تاوێکی باش بە لەشولار و سەروسەکوتی خۆی پێ دەکەنێت .

ئەبوقەتادە باس لەوە دەکات لەبەر ئەوەی هەندێك لە کتێبەکانم وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی عەرەبی و بە عەرەبی بڵاوکراونەتەوە، بۆیە منیان بۆ ئێرە بانگهێشت کردووە. ئەم قسانە وادەکات زیاتر باوەڕم بە خۆم هەبێت. بەم پێیە ڕەنگە بتوانم بە زوویی پەیوەندیی لەگەڵ داعشدا دروست بکەم.

پاشان چاوێك بە لیستی داواكارییەكانی مندا دەخشێنن. بواری چاوپێكەوتن لەگەڵ تێكۆشەرە ناودارەكانی وەكوو دزو داگ[64] و باقی ئەستێرە پیاوكوژەكانی داعشدا نییە، داعش ئارادەیەك پێی خۆش نییە هەندێك لە كەسایەتییەكانی لە میدیاكاندا گەورە بكات، داعش هەوڵ دەدات چەكدارەكانی لە میدیاكان دوور بخاتەوە، بۆ ئەوەی ژیانی تایبەتیی و چارەنووسیان بە داعشەوە نەبەسترێنەوە. داعش بۆچوونێكی باشی لەسەر ئەو بابەتە نییە، كە چەكدارەكانی وێنە و گرتەی ڤیدیۆیی تاوان و كردەوەكانی خۆیان لە میدیاكان بڵاوبكەنەوە. دواتر ئەبوقەتادە دەست بە شیكردنەوە دەكات. مالكولم كە زۆرجار لە ئاستی ڕووداوەكاندا بێدەنگە، بە خێرایی دەست بە نووسین دەكات:

خەلیفە ئەبوبەكر بەغدادی، تا بكرێت زۆر دەرناكەوێت، لەبەر چەند هۆكارێك: یەكێك لە هۆكارەكان بابەتی ئەمن و ئاسایشە. ئەگەر من لەگەڵ بەغدادی قسە بكەم، ئەوكات ڕێكخراوی سی، ئای، ئەی، ئاگادار دەبێتەوە و زانیاریی لەسەر ئەوە وەردەگرێت كە ئەبوبەكر بەغدادی لە كوێ دادەنیشێت. وەگەرنا دەوڵەتی ئیسلامی نایەوێت ئەبوبەكر بەغدادی پیرۆز بكات.

هەروەها بۆ ئەوەی خەلیفە یەكجار لە مزگەوت ئامادە بێت و لە پێش چاوی خەڵكیدا دەركەوێت، پێویستی بە سێ مانگ بەرنامەڕێژیی و ڕێكخستنی سەرەتایی هەیە. پێویستی بە كات و تێچوونی زۆر هەیە. هەرچییەك بێت لەبەر ئەوەیە كە ئێمە دوژمنی زۆرمان هەیە و خەریكین لەگەڵ ٦٠ دەوڵەتدا شەڕ دەكەین.

"نووسینگەی پەخشی درۆ"ی ڕۆژئاواییەكان بەردەوام تووشی شۆكمان دەكەن. خێزان و كوڕەكەی بەغدادی وەك ئەوەی كە میدیا ڕۆژئاواییەكان دەیڵێن، هەرگیز لە لوبنان دەستگیرنەكراون، هەروەها ئەو درۆیانەش كە باسی هێرشكردنە سەر كاروان و ئۆتۆمبیلەكەی خەلیفە دەكەن، ئەوانە هەمووی درۆی زەقن. سێیەمین جارە ئەبوقەتادە ئەم شتە بۆ من دەگێڕێتەوە: "ڕاستیی تۆ پێت وایە بەغدادی هێندە گەمژەیە كاروانێك

---

64 Deso Dogg

چەکدار دوای خۆی دەخات، بۆ ئەوەی دەرکەوێت و سەرنجی هەموو لایەك بۆ خۆی ڕابکێشێت؟"

نووسینگەی خەلیفە دەتوانێت بەرنامەڕێژیی بۆ هەموو شتێك بکات، بەڵام خەلیفە بۆ خۆی تەواوی بڕیارە چارەنووسسازەکان دەر دەکات. پێدانی مۆڵەتی سەردانیکردنی ئێمەش بۆ دەوڵەتی ئیسلامی و پاراستنی گیانیشمان دیسان بە بڕیاری بەغدادی بووە.

کۆمەڵێك مەسیحی لە شاری ڕەقفە دەژین، بەڵام بە هیچ جۆرێك کڵێساکانیان بە کەڵکی ئەوە نایت سوودی لێوەربگرن، نەوەك لەبەر ئەوەی داعش وای لێکردبن، نەخێر، بەڵکوو کاری گروپە شۆڕشگێڕەکانی تری سووریایە کە لە پێش داعش لێرە دەسەڵاتیان گرتوەتە دەست.

هێزە ئاسمانییەکانی ئەسەد تەنها لە ڕۆژدا بۆردومان دەکەن، نەوەك لە شەودا. فڕۆکەکانیان زۆر کۆن و داڕزاون، ئەسەد لە کەشوهەوای نەخوازراودا توانای بۆردومانکردنی نییە. بەڵام ئەمریکییەکان لە شەویشدا بۆردومان دەکەن.

بە بۆچوونی ئەبوقەتادە بەرەی نوسرە و سوپای ئازاد دوو گروپی (مورتەد)ـن، بەڵام ئەگەر لە موقابیلی ئەو تاوان و هەڵانەی کە کردوویانە داوای لێبوردن بکەن، ئەوە دەتوانن بێنە نێو ڕیزەکانی داعشەوە .

لە ئێستادا لە ئەڵمانیا ئەگەری هێرش و پەلاماردان هەیە. عەدنانی وتەبێژی داعش، وەکوو ئەوەی هەموو خەڵك دەزانێت، بانگەشەی بۆ ئەو کارە کردووە. بە بۆچوونیان سیاسەتی ئەڵمانیا زیرەکانەیە، چونکە لە ڕێگەی دەزگا هەواڵگرییەکانەوە کاروچالاکی زۆر دەکات، تا خەڵکی ئەڵمانیا ئاگاداری هیچ شتێك نەبن. بۆ نموونە ڕێکخراوی ئاسایشی ئەڵمانیا لە وڵاتی سعودییە بەشدارە لە دروستکردنی دیوارێکی سنووریی لەو وڵاتەدا. مەگەر دەکرێت لەسەر ڕاهێنان و مەشقی هێزە ئەمنییەکانی سعودییە و ناردنی بە لێشاوی چەك بۆیان بێدەنگ بن! پشتگیریکردنی کوردەکان و پشتگیریکردنی ئەمریکا لە جەنگی دژ بە داعشدا چەند بەڵگەیەکیترن لەسەر ئەوەی کە داعش بە فەرمی وڵاتی ئەڵمانیا بە دوژمنی ئیسلام دەزانێت. جگە لە خەڵاتبەخشینەکەی مێرکڵ بە

کاریکاتێریستە دانیمارکییەکە کە سووکایەتی بە پێغەمبەری ئیسلام کرد، هەروەها بابەتی ناردنی چەك بۆ ئیسرائیل و زۆر شتی تر، ئەمانە هەموو بەڵگەن لەسەر ئاراستەکردنی ئەڵمانیا دژ بە ئیسلام. "چەند وڵاتێك هەن لەم کێشە و گرفتانە دوورن و لەم مرۆڤکوشتن و تاوانکارییانەدا بەشدار نین، داعش هەرگیز لەم وڵاتانە کاروچالاکیی ئەنجام نادات."

دێینە سەر باسی چاوپێکەوتنی تێروتەسەل لەگەڵ چەکدارێکی داعشیدا، کە لەوەوپێش بەرنامەمان بۆی داڕشتووە. لەم بارەیەوە بیرمانکردووەتەوە و بە ئەبوقەتادەش دەڵێین بەهۆی لەبەرچاوگرتنی باری خێزانەکەی نامانەوێت ئەم چاوپێکەوتنەی لەگەڵدا بکەین. چونکە ڕەنگە بۆ دایکی لێدانێکی سەخت و دژوار بێت. لە گفتۆکردن لەگەڵ ئەبوقەتادەدا نەك تەنها پرسیار لەسەر قورئان، بەڵکوو پرسیار لەسەر کوژراوەکانیش دەکەین، بۆ ئەبوقەتادە وەکوو یەکە و هیچ جیاوازییەکی نییە: "دەتوانێ تەحەمولی بکات، ئیتر بەم شێوەیە." کاتێك بێدەنگ دەبێت من تەماشای دەکەم. ئەبوقەتادە بە توڕەییەکەوە دەڵێت: "دەبێت چیتان پێ بڵێم؟ نیگەرانیی دایکم مەبن. لێرە کەس بە ئاسانی ناتوانێت چاوپێکەوتنتان لەگەڵ بکات. شتێکە و تازە ڕوویداوە. ئەو کەسەی کە گفتوگۆ دەکات دەبێت شارەزابێت، بە وردیی بزانێت چ شتێك هەڵەیە و چ شتێك ڕاستە."

سبەینێ ـ لەسەر داواکاریی من ـ بڕیارە بچینە شاری موسڵ، چونکە من ئەو شارە دەناسم و دەمەوێت بارودۆخی ئێستای شارەکە لەگەڵ موسڵی زەمانی سەدام حوسەیندا بەراورد بکەم. مۆبایلەکانمان کە پێشتر ئەبوقەتادە لێی وەرگرتین، جارێك پێمان نادەنەوە. بەهەرحاڵ خزمەتگوزاریی ئینتەرنێت لە شاری ڕەققەدا نییە، چونکە ئەسەد پچڕاندوویەتی، هەروەها لە موسڵیش ئینتەرنێت نییە، چونکە داعش پچڕاندوویەتی. لە موسڵ، لەبەر ئەوەی ئایفۆنەکانمان شوێنهەڵگری تێدایە هەر بۆیە ناتوانین دەریانبێنین و بەکاریان بهێنین، چونکە لە ڕووی ئەمنییەوە کێشە لە موسڵ دروست دەکات. لە هیچ

بارودۆخێکدا نابێت شوێنەکەمان ئاشکرا بێت. هەر بۆیە مۆبایلەکانمان جارێك لای ئەواز دەمێننەوە. لەکۆتایی و لە کاتی ڕۆشتنەوەمان دەتوانین مۆبایلەکانمان وەربگرینەوە.

ئەبوقەتادە پێمان دەڵێت لە کۆتایی سەفەرەکەماندا هەموو گرتەڤیدیۆیی و وێنەکانمان کۆنترۆڵ دەکرێت. دەشڵێت ئەم هەڵسوکەوتە لە کاتی جەنگدا شتێکی ئاساییە. نیگاکانمان تێکەڵ بەیەك دەبن و تەماشای یەکتر دەکەین. بەڵام بڕیارمان و نەبوو. هەوڵ دەدەین ڕێگاچارەیەك بدۆزینەوە، بەڵام شۆفێرەکەمان کە سەروچاوی داپۆشیوە وەکوو ڕۆژی ڕووناك دیارە دەسەڵاتی زیاترە لەوەی کە پێشتر بیرمان لێ دەکردەوە. جارێکیتر بە ئاوازێکی توند و وشك و ڕوون و ئاشکرا مەرجەکانیان دەڵێتەوە. بە ئاوازێکی توندوتیژ و بە شێوەزارێکی بەریتانیایی سەیر کە هەرگیز لە یادم ناچێت. کاتێك لەگەڵمان قسە دەکات سەری بۆ پێشەوە شۆڕ کردووەتەوە. بە نیگایەکی قوڵ سەیرێکی چاوەکانمان دەکات، تا بزانێ ئێمە لە مەبەستیان تێگەشتووین یاخود نا. پێڵوەکانی سەر چاوی کەمێك مەیلەوچاڵە، ڕەنگە لەبەر ئەوە بەم سەختییە مامەڵە دەکات تا شێلگیرتر و خوێنساردتر بێتە پێش چاو.

بێدەنگییەکی قورس باڵ بەسەر فەزاکەدا دەکێشێت. ئاوازی دەنگی فەزاکەمان لەپڕێکا تەواو گۆڕاوە، چیتر خەبەرێك لە ڕێزگرتنی گەرموگوڕیی هاوشێوەی سەربازگەکەی داعش نەما، من لەوە تێگەشتم ئیتر شتەکان جدیی دەبنەوە. لە دیدی شۆفێرەکەمانەوە ئێمە وەك دوژمنێك تەماشا دەکرێین، دوژمنێکی خوێنیی. بارودۆخی سەفەرکەمان زۆر ڕوون نییە و لە ئێستاشدا بواری هەڵبژاردن و بڕیاردانمان بەدەست نییە. یەکەم جار ئەبوقەتادە وەڵامی پرسیارە ڕەقەکانی کابرای سەروچاوداپۆشراو ناداتەوە، دواتر دەردەکەوێت ئەم قسانە بە کامی ئەبوقەتادەش نییە

فریدریك لە کاتی پێویستدا تەنها دەتوانێت یەك ئیمەیڵ لەشاری ڕەققەوە بنێرێت. ئەویش لە کاف نێت و بە چاودێریی ئەبوقەتادە. کاف نێت لەسەر کوچەکەیە، ئەبوقەتادە یەك دەقە دەچێتە کاف نێتەکەوە و کۆدێك بە فریدریك دەدات، بۆ ئەوەی لە مۆبایلەکەی بینووسێت و ئۆنلاین بێت، ئەبوقەتادە بە فریدریك دەڵێت: "خێراکە! دەتوانی دوو

خولەك لەسەر هێڵ بیت! تەنها دوو خولەکت لەبەردەستدایە!" فریدریك نامە بۆ دایك و خوشکەکەی و نامە بۆ خێزانەکەی مالکولم و چەند کەسێکیتر، کە ئاگاداری سەفەرەکەی ئێمە بوون، دەنێرێت. نامەیەکی کورت، پێیان دەڵێت، کە دیسان بە گوێرەی پێویست هەواڵیان پێ دەداتەوە.

لە کاتی گەڕانەوەماندا ئەبوقەتادە باسی ئەوە دەکات کە عەرەبەکان زۆر تەمبەڵن و هەڵسوکەوتکردن لەگەڵیان زۆر سەخت و دژوارە. ئەو زۆر ڕێز لە عەرەبەکان ناگرێت. فریدریك پرسیاری لێ دەکات: "ئایا لێرە خەڵکی ئێوەی خۆش دەوێ؟" ئەبوقەتادە بە پێکەنینێکەوە وەڵام دەداتەوە: ڕاستیت دەوێ نەخێر. هەر جۆرێك بێت ئێمە وەکوو بیانی لەقەڵەم دەدرێین، بەڵام ڕۆژگارێك دێت لەگەڵمان ڕابێن."

دوای کەمێك، سەروسەکوتی چەکدارێکی باریکی بەهێز کە تەمەنی لە نزیکی ٢٥ ساڵێکدایە، لە باڵەخانەکەمانەوە دەردەکەوێت. ڕیشێکی کورتی هەیە و عەینەکێکی ڕەشی لە چاودایە و قژێکی ڕەشی درێژی پێوەیە. بە شەرواڵە سوور و تیشێرتە شینەکەی و بە کڵاوە نوکتیژەکەی لە بەزمگێڕ و مۆسیقاژەنەکانی سەتەکانی ناوەڕاست دەچێت. ناوە جەنگییەکەی (ئەبولوت)ە[٦٥] .

دەپرسم: "ئەم ناوە لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت؟" دەڵێت: "لوت لە دژی هاوڕەگەزبازیی شەڕی کردووە، نازانم ئێوە دەیناسن یاخود نا. من کارەکەی بەرز دەنرخێنم و هاوڕای ئەو کارەم کە ئەو کردوویەتی. ئەو دژی فەساد بووە، دژی هاوڕەگەزبازیی بووە، هەر بۆیە منیش ئەم ناوەم بۆ خۆم هەڵبژاردووە."

مالکولم و فریدریك هەوڵ دەدەن پێش بە پێکەنینەکانیان بگرن. ئایا بە ڕاستی ئێستاش بەو جۆرە بیر دەکاتەوە؟ منیش دەڵێم، لوت کەسایەتییەکی بەناوبانگی نێو قورئانی پیرۆز و تەوراتە، ئەو پێش ئەوەی خوا سزای خۆی بەسەر دوو شاری سەدوم[٦٦] و عەمورە[٦٧] دا داباریێنێت، لەم دوو شارە دەرچووە. تەنها ژنەکەی نەیتوانیوە خۆی

---

٦٦- ابولوط

66 sodom
67 Gomorrha

بکات، چونکه له کاتی هەڵاتنیان له شارەکه سەرەڕای ئەوەی خوا فەرمانی کردبوو بەوەی که ئاوڕ له پشت سەری خۆیان نەدەنەوە، بەڵام خێزانەکەی لوت ئاوڕی داوەتەوە و تیاچووە...

ئەبولوت، ئەڵمانییە، بەڵام ڕیشە نەژادییەکەی مەراکیشییە. لە ئێستادا لە شاری ڕەققە دەژێت، پێشتر بۆ ماوەیەکی زۆر له شاری حەلەب ژیاوە. ئەو دەڵێ بارودۆخی حەلەب زۆر سەخت و دژوار بووە. باسی ئەوەمان بۆ دەکات که زۆرجار لێرە یاریی بلیارد و پلەیستەیشن دەکات. جیهادییە مەراکیشییەکان پێیان باشە یاریی فوتبۆڵێن بکەن، بە تایبەت لە هاویندا له هەندێك شوێنی دیاریکراودا یاریی دەکەن. ئەو بۆ گاڵتە و تەوس دەڵێت ڕەنگە بەمزووانە دەست بەسەر وڵاتی (قەتەر)ـیشدا بگرن و خۆیان جامی جیهانیی بەڕێوە ببەن. هەرچەندە دەوڵەتی ئیسلامی لە ئێستادا بۆ خۆی هەڵبژاردەی فوتبۆڵی نییە، بەڵام ئەوکات هەڵبژاردەی فوتبۆڵیش دروست دەکەن.

**ڕۆژی سێیەم**

**دووشەممە، ٨ـی دیسامبەری ٢٠١٤**

لە دەوروبەری کاتژمێر هەشتی بەیانی لە خەو هەڵدەستین. ئەبولوت و ئەبوقەتادە لە ژووری نیشەمەنەکە خەوتوون و ئێمەش لە ژوورەکەی تەنیشتیان. شەو لە ڕێگای سەرئاوکردن و چوونە تەوالێت[٦٨] چەند جارێك چاومان بە یەکتر دەکەوێت. بە تایبەت ئەوانەی که شەربەتیان زیاتر نۆش کردبوو. ئەبوقەتادە بۆ قاوەڵتی چەند جۆرێك پیتزا و نانی بەربەری هێنابوو.

ئەو دەڵێت، دەبێت ئێستا چاوێك به بەرنامەکانی سبەینێماندا بخشێنین. تووڕە دیارە. هەروەها داخوازییەکەی ئێمە بۆ کاری ڕۆژنامەوانیی ئازاد، بێ سانسۆر و بێ پاسەوان لەلایەن بەرپرسە باڵاکانی داعشەوە بەرپەرچ دراوەتەوە. وا دیارە ئەم کارە مەترسی زۆری لەسەر ئاسایشی ئەوان هەیە. تەنها وێنەیەك بەسە بۆ ئەوەی کەسێك بکوژرێت.

---

68 W.C

من دەڵێم: "ئامادە نیم سانسۆر قبوڵ بکەم." میدیا ڕۆژئاواییەکان وازم لێ ناهێنن. من دەزانم مەبەستی داعش لە سانسۆرکردنی ناوچە دوورەدەستە سەربازییەکان نییە، یەکەم جار دەبێت بە ئاسانی خۆمان بە دەستەوە نەدەین، هەروەك دەگوترێت یەکەم جار شەڕ بکەین و ئاشتیی جێ بێڵین بۆ دوایی. ئەگەر من ئێستا بە ڕاشکاویی نارەزایی خۆم لەسەر ئەم بابەتە پیشان نەدەم، ئەوکات داعش بە بەردەوامی مەرجی نوێ و سەختترمان بۆ دادەنێت. هەربۆیە پێیان دەڵێم تاکوو مەبەستتان لە سانسۆرکردنی هەندێك لە شتەکان کە ئێوە دەیڵێن ڕوون نەبێت، ئەوە پێم وایە گەڕانەوەمان باشترە.

دەمەقاڵە هەڵدەگیرسێ، ئەبوقەتادە پێمان ڕادەگەیەنێت کە ئەمڕۆش بۆمان نییە بچینە نێو شاری ڕەققەوە. دەبێ تا کاتی ڕۆشتنمان بۆ شاری موسڵ لە باڵەخانەکەدا بمێنینەوە، واتە لە ئێستادا تەنها بواری بینینی شاری موسڵمان پێ دەدەن و بەس. ئارەزووی منیش تەنها ئەوە بوو کە بچمە ئەو شارە و موسڵ ببینم. من دەپرسم ئایا پێش بەڕێکەوتنمان بۆ شاری موسڵ دەتوانم جۆن کانتلی[69] بەیامنێر یاخود جۆن جیهادی[70] سەربڕی ناودار ببینم، وەڵامی ئەبوقەتادە بەم شێوەیە بوو: "نەخێر، مەگەر جارێك چی ڕوویداوە؟"

دەرگاکە دەکرێتەوە، ئەبولوت و شۆفێرەکەمان کە هێشتانێك دەموچاوی لە پشت شاڵێکەوە داپۆشیوە، پەیدا دەبن. کابرای سەروچاوداپۆشرا و بە شێوەزارێکی بەریتانی و بە زمانی ئینگلیزی دەست بە قسەکردن دەکات و بە هەڵچوونێکەوە دەڵێت: "ئێوە ئازادن بڕۆن!"[71] شۆفێرەکەمان لەئەسڵدا متمانەی بە پەیامنێران نییە و ئەگەریش بەم مەرجانە ڕازیی نین ئەوە دەتوانین بگەڕێینەوە. "پێت وایە کارێکی ئاقڵانەیە کەسێك، کە

69 John Cantlie
70 Jihadi John
71 You are free to leave

نایناسین، بانگهێشت بکەینە ئێرە، بۆ ئەوەی دەوڵەتەکەی ئێمە ببینێت، ئەو دەوڵەتەی کە هەمووان دوژمنین، ئەوکات کۆنترۆڵیشی نەکەین؟"[72]

پێشنیاری ڕێککەوتن دەخاتە پێشمان، ئەو دەڵێت لەم سەفەرە هەندێك لەو شتانەی کە خوازیاری دیتنین، پیشانمان دەدات. ئەگەر بیسەلمێنین جێگەی متمانەین، ئەوە دەتوانین جارێکیتریش سەردانی ئێرە بکەن. ئەوکات هەموو بەربەستەکان لە ڕێگاماندا هەڵدەگرن. بەهەرحاڵ ئێمە تا ئێرەی سەفەرەکەش شتی زۆرمان دەستکەوتووە. هەروەها بەختیش یاوەرمان بووە. چونکە یەکەمین پەیامنێری ناموسڵمانین هاتووین بۆ ئێرە، بێ ئەوەی سەرمان بپەڕێنن. ئەو دەڵێت: "تەنانەت ئێمە پێتان دەڵێین دەتوانن دووبارە بێنە ئێرە".

من تووڕەتر وەڵام دەدەمەوە: "ئەمە ئەو شتە نەبوو کە لەسەری ڕێککەوتین. من هەرگیز ڕێگا بە کەس نادەم سانسۆر لەسەر کارەکانم دابنێت، هەر بۆیە ئێستا من بەم کارە ڕازیی نابم. من هەمیشە ئەو شتە دەڵێم کە پێم وایە دروستە، جگە لەمە ڕاپۆرتی ئازاد بە مانای ڕاپۆرتی ئازاد دێت."

کابرای سەروچاوداپۆشراو حەز دەکات بزانێت: بۆچی ئێمە پەرۆشی ئەوەین کە جۆن جیهادی و جۆن کانتلی ببینین؟ بۆچی ئەو هەموو موسڵمانە بەدبەختەی دەوڵەتی ئیسلامی سەرنجمان ڕاناکێشێت؟ بۆچی سەرنجمان لەسەر ئەم دوو کەسەیە، لە کاتێکدا شتێلێکی گرنگتریش هەن؟

بەڵام سەرەڕای ئەمانەش وادیارە ئەو زۆر خۆشی لە مەسەلەکەی جۆن کانتلی دێت. ئەو پێشنیارێکی سەیر دەخاتە بەردەم ئێمە، دیدار لەگەڵ جۆن کانتلی بەو مەرجە دەبێ کە جۆن کانتلی نامەیەك بۆ دایکی و نامەیەك بۆ جیمز کامیرۆن بنووسێت. جۆن کانتلی ئەو نامانە بە ئێمە دەدات و ئێمەش دەتوانین لەو دەرفەتەدا لەگەڵ ئەو قسە بکەین.

---

72 Do you think it is smart to let somebody come‹ that you don't know ‹ to invite him to your state that every body is fighting against. And then you don't control him?

بەڵام ئێمە ناتوانین وێنە و فیلمی دیدارەکە تۆمار بکەین، دیدار و وەرگرتنی نامەکان دەبێت لەلایەن داعشەوە تۆمار بکرێن و بڵاوبکرێنەوە.

دەزانم کە نابێت ئەم پێشنیارە قبول بکەم. من نامەوێت لە شانۆگەرییەکی پروپاگەندەیی داعشیدا بەشداریی بکەم. زۆر حەزم دەکرد جۆن کانتلی ببینم و هاوکاریی بکەم، بەڵام ئەم کارەی داعش خوازیاری بوو ناو و ناوبانگی منی لەکەدار دەکرد. هەر بۆیە منیش پێشنیارم کرد لە کاتی دیدار لەگەڵ کانتلی نابێت هەردوو لامان فیلم بگرین.

نازانم بۆچی، بەڵام وا دیارە شۆفێرە سەروچاوداپۆشراوەکەمان بە شێوەیەکی سەیر شێرەی چووە بە مەسەلەکەی جۆن کانتلیدا. ئەو دەیەوێت لەگەڵ سەرەوەی خۆی قسە بکات، تا بزانێت ئێمە دەتوانین بچینە شاری ڕەققەوە یاخود نا، یان ئایا بواری ئەوە دەدەن لەگەڵ جۆن کانتلیدا بەبێ کامێرا چاوپێکەوتن بکەین یاخود نا. ئەبوقەتادە دوای دەکەوێت، وادیارە گەشبینە، بە هێواشی لە بنگوێمدا دەڵێت پێم وایە دەتوانین بە ڕێگاچارەیەکی مەنتقی بگەین؟

ئەبولوت دەڵێت ڕەفتاری هەردووکیان ئاساییە. دەکرێ دیدارەکەی ئێمە کارێکی مەترسیدار بێت لەسەر ڕێکخراوی داعش، ڕەنگە زۆرێک لە شتەکان ئامانجی خۆیان نەپێکن. ڕاپۆرتە ئینتەرنێتییەکانی پەیامنێرە موسڵمانەکانی وایس نیوز لە لایەن بەشی میدیای لۆکاڵی داعش لە شاری ڕەققە ئامادە دەکرێن، بەڵام بە پێچەوانەوە دیدارەکانی ئێمە لە لایەن بەشی میدیایی نووسینگەی فەرمی خەلیفەوە ڕێک دەخرێن. هەر بۆیە پێویست ناکات هیچ کەسێک بترسێت.

پاش ئەوە ئەبولوت باسی ئەوە دەکات کە بۆچی جیهادی هەڵبژاردووە و لە ئێستادا لە دەوڵەتی ئیسلامیدا ژیان بەسەر دەبات. ئەمە هەندێك لە هۆکارەکانییەتی کە خۆی دەیلێت:

ـ ئێوە بە هەڵە لە چەمکی ئازادیی تێگەیشتوون. ئێوە پێتان وایە ئازادیی بریتییە لە بەزاندنی هەموو سنوورێك، بێسەروبەریی و پابەندنەبوون بە بەها و ئەخلاقەکانەوە. ئەمە تێگەشتنێکی خراپە، کەسێکی موسڵمان ناتوانێت بەم شێوازە بژی.

- یاسا و بەهاکان لە ڕۆژئاوادا نەماون... شتێلێکی وەکوو بێ مەترسیی پێشاندانی مەسەلەی هاوڕەگەزبازیی... ئەم ژیانە بێسنوورە... بەردەوام هەموو ئەمانە کەسێکی موسڵمان تووشی کێشە و سەرێشە دەکەن.

- دیموکراسیش لەگەڵ ئیسلامدا وێك نایەتەوە. هیچ کەسێك مافی ئەوەی نییە کە یاسا مرۆڤایەتییەکان لە پێش یاساکانی خواوە دابنێت.

- گەرچی لە دنیای ئێستادا لە هەموو شوێنێك بواری ئەوە هەیە مرۆڤ ژیانێکی گۆشەگیرانە و زاهیدانە بۆ خۆی هەڵبژێرێت، بەڵام هەموو مرۆڤێك پێویستی بە کۆمەڵگا هەیە. بۆ من ژیان لەم خەلافەتەدا خەونێکی گەورەیە، هاتنەدی هیوایەکی گەورەمە.

- زۆرترین توندوتیژییەکانی ئەم جیهانە لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا ئەنجام دەدرێن. هەموو ئافرەتێکی موسڵمان خوشکی منە، من دەبێت بەرگریی لێ بکەم. کاتێك خوێنی موسڵمانێك دەڕێژن ئەرکە لەسەر هەموو موسڵمانان کە بە هانایەوە بچن.

— ئێمە ئێستا لە سەردەمی بێداری ئیسلامیدا دەژین... دەستهەڵگرتن لە دیموکراسی... گەڕانەوە بۆ پێشینان.

- گرنگ نییە کە شەڕکەرەکانمان چەندە ژمارەیان کەم بێت، ئێمە دەزانین دواجار براوە دەبین.

— ئێمە لە یەك – دوو ساڵی داهاتوودا ڕێککەوتنامەیەکی ئاشتەوایی لەگەڵ ڕۆژئاواییەکاندا مۆر دەکەین، دواتر ئەوان ئەو ڕێککەوتنامەیە دەشکێنن و لەژێر پێی دەنێین. ئەمە پێغەمبەری ئێمە محەمەد (درودی خوای لەسەر بێت.) پێشبینیی کردووە.

لەسەر چەمکی(پێغەمبەر محەمەد) دەبێت بڵێم کە ئەگەر محەمەد لە ئێستادا زیندوو بووایە، بێ شك ئاشتیخوازێکی گەورە دەبوو، پێشکەوتنی دەکردە پەرجووی سەرکەوتنەکانی، هاوشێوەی ئەوەی کە لە ڕابردوودا کردی. ئەبولوت هەوڵ دەدات باسی ئەوە بکات کە هەرچەندە یاساکانی ئیسلام هی ١٤٠٠ ساڵ پێشترن، بەڵام لە هەموو ئانوساتێکی مێژووییدا دەکرێت سوودیان لێ وەربگیردرێت. هەربۆیە پێویستمان بە چاکسازیی نییە لە ئیسلامدا. دواجار هەر دەبێ یاساکانی خواوەند پەیڕەو بکرێن.

ئەبوقەتادە و شۆفێرەکە دووبارە دێنە ژوورەوە، هەردوو زۆر تووڕانە تەماشای نێو ژوورەکە دەکەن، واتا وەڵامی نەخێریان وەرگرتووە؟ دووبارە شۆفێرەکە لەسەر کورسییەك ڕووبەڕووی من دادەنیشێ و بە بێنەدەبیی و بە توندییەکەوە بە من دەڵێت: یان موسڵ یان تورکیا وەگەرنا هیچ[۷۳]. سەبارەت بە جۆن کانتلیش هەر ئەوەبوو کە پێشتر گوتمان. شێوازی قسەکردن و شێوەی ڕەفتاری تەواو مات و مەلولم دەکات، ئایا ئەم قسانە بە جدیی دەکات؟ ئەو ماف ئەوەی نییە بەم جۆرە لەگەڵ من قسە بکات. لە جێگای خۆم هەڵدەستمە سەر پێ و زۆر ڕك و ڕاست و بێ پەردە پێی دەڵێم: "وادەزانی بەرازت لە گەوڕا ڕاگرتووە، سەیر بکە گێلەپیاوە بیر لە چی دەکاتەوە!"

بەڵام شۆفێرە سەروچاوداپۆشراوەکە سەرەڕۆیانەتر لە پێش بە من دەڵێت ئەهلی مامەڵەکردن نییە. یان دەچینە موسڵ یان دەگەڕێینەوە. شۆفێرەکەمان زۆر تووڕەیە، هەروەها ئەبوقەتادەش. وابزانم هەردوو لەلایەن بەرپرسە باڵاکانەوە خراپ سەرزەنشت کراون. تا دوێنێ لە دەوڵەتی ئیسلامیدا پەیامنێریان سەردەبڕی، ئێستا هەر ئەو پەیامنێرەی کە خۆیان ڕێگەیان پێداوە بێتە دەوڵەتی ئیسلامی، مەرجی بۆیان هەیە! دیسانەوە کابرای بەریتانی سەروچاوداپۆشراو دەڵێت، لە موسڵیش چەند بەربەست و سنووریکمان هەیە. زۆر بە توندیی قسەمان لەگەڵ دەکات.

چیتر کاسەی سەبرم پڕ دەبێت. بە ئارامییەکەوە، بەڵام بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە پێی دەڵێم ڕێگرتن و قەدەغەکردنی چوونەدەرەوەمان لە باڵەخانەکە بۆ خۆی جۆرێکە لە بێشەرمیکردن بەرانبەر بە ئێمە. تەنانەت ئەو کاتەی لە تاڵیبانیش بووم ئەوان ئەم کارەیان بەرانبەر من نەکرد. شۆفێرەکە کە تەنها چاوەکان و پێڵوی چاوەکانی دیارە مۆڕەیەك دەکات و دەڵێت: "ئێمە تاڵیبان نین!" فریدریك زۆر بە سەرسامی چاوی بڕیوەتە کابرای بەریتانی و زەق زەق تەماشای دەکات.

73 Mosoul or Turkey. That’s it.

دەڕۆم بەڵێننامەکەی خەلیفە لە جانتاکەم دەردێنم و دەڵێم: "ئێوە ئێمەتان بە شێوەیەکی فەرمی بە سڵاو و سەڵاواتەوە بۆ ئێرە بانگهێشت کردووە، ئێستا زیندانیمان دەکەن؟ کاتێك ئێوە چوونەدەرەوەمان لێ قەدەغە دەکەن بە مانای زیندانیکردن دێت."

چی تر وەڕز دەبم. نابێت بە هەموو مەرجێکی ئەوان ڕازیی بین و خۆمان بە دەستەوە بدەین. من پێی دەڵێم: "خێرا ڕەفتار و قسەکردنتان بگۆڕن!" هێندە دەنگم بەرزە ئەو کەمێك لە جێی خۆی ڕادەچڵەکێت.

بەڵام وادیارە نایەوێ لەگەڵ پیاوێکدا مشتومڕ بکات کە لە پڕێکا هەڵچووە و تووڕە بووە. جۆرێك تەماشامان دەکات وەك ئەوەی حەز بکات سەر لە لاشەمان بکاتەوە. ئێستا ئەم توندوتیژییە لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت؟ ئایا هەنووکە بەڵێننامەکەی خەلیفە باوەڕپێکراوە؟

دەبێت هەوڵ بدەین ئەم مشتومڕە لەوە زیاتر ئاڵۆزتر نەبێت و کاریگەریی خراپ لەسەر ئەوان دانەنێت. هەروەها پێویستە لە پێش هەموو شتێکەوە دیسان قسەیان لەگەڵ بکەین و لەسەر چەندوچۆنی مەسەلەکە ڕێگاچارەیەك بدۆزینەوە و بڕیارێکی دروست بدەین. هەر بۆیە بە شێوەیەکی ئارام بە کابرای بەریتانی دەڵێم ئێستا ئێمە دەچینە ژوورەکەمان و بڕیار لەسەر ئەوە دەدەین کە ئایا بچین بۆ موسڵ یاخود بگەڕێینەوە، کە تەواوبووین ئاگادارتان دەکەینەوە. فریدریك هەر چاوی بڕیوەتە کابرای بەریتانی سەرەوچاوداپۆشراو، وەك بڵێی شتێکی تیا بەدی دەکات. دواتر دەڕۆین.

مالکولم پێی وایە کە ئەگەر ئێستا کۆتایی بە سەفەرەکەمان بێنین و بڕیاری گەڕانەوە بدەین ئەوە ئەگەری هەیە داعش بۆچوونی خۆی بگۆڕێت و سەرئەنجام سەربڕین و ڕفاندنمان بە باشتر بزانن. دیوی نەرێنیی ئەم کارە کەمترە لەوەی کە سەفەرەکەمان بە نیوەچڵ بەجێ بهێڵین و بگەڕێینەوە و دوای گەڕانەوەش بڵێین سەردانیکردنی دەوڵەتی ئیسلامی بەهای قرۆشێکی نەبوو. هەموو ئەم شتانە بۆ من زۆر سەخت و دژوارە، من وەکوو خۆم نامەوێت بەهۆی ئەم چەند دەمەقاڵێیەوە کۆتایی بە سەفەرەکەم بهێنم .

ڕۆژئاواییەکانیش لەو جێگایانەی کە جەنگ بەرپایە بەهۆی بابەتە ئەمنییەکانەوە فیلم و وێنــەی پــەیامنێران کــۆنترۆڵ دەکــەن، هــەر بۆیــە مــن بڕیــار دەدەم لــە ســەفەرەکەمان بەردەوام بین، بەڵام بەو مەرجەی ڕەفتار و قسەکردنیان بگۆڕن.

کاتێك کابرای بەریتانی و مـالکولم لـە ژوورەکـە دەچـنە دەرێ، فریـدریك ڕەنگـی وەك گەچ سپیی بووە و ڕەنگ لە ڕووی پەڕیوە، لە تەنیشتم دادەنیشێت و بـە هێواشـییەکەوە لە بناگوێمدا دەڵێـت: "من زۆر دڵنیا نیم، چونکە من لێرە بـەبێ لاپتـۆپ نـاتوانم بـە دوای هیچ شتێکدا بگەڕێم و هیچ شتێك ببینم، بەڵام من بەگومانم لـەوەی کـە کـابرای بـەریتانی سەروچاوداپۆشراو بۆ خۆی خودی جۆن جیهادی سەربڕە. چاوە نیوەکراوەکانی زۆر زەق بوون، لە چاوی هەڵۆ دەچوون، زمانە توندەکەی بە ئاواز و شـێوەزاری بـەریتانیایی، ئـەم دەنگەم چەندین جار لە مونیخ بیستبوو. هەرگیز فەرامۆشی ناکەم و لـە یـادم ناچێتەوە. دەی ئێستا چی بکەین؟"

وەختە دڵم لە لێدان بوەستێ، ئایا بڕیارە ئەو کەسەی ملـی جیمـز فـولی و ئـەوانیتری بڕیوە، پاسەوانی ئێمە بکات؟ من بە فریدریکم گوت: "سەیرکە! هیچ شـتێك لای مـالکولم نادرکێنی، هەرکات گەشـتینە ماڵـەوە دەتـوانین دڵنیـابین لـەوەی کـە گومانەکـەت ڕاسـتە یاخود نا. ئێستا پێویستە بڕۆین." ناهێڵم کـەس هەسـت بـە تـرس و شـڵەژانەکەم بکـات، بەڵام دیسان وا هەست دەکەم کە بۆ ژووری ئەشتەرگەریمان دەبەن، ئەو ژوورەی پڕە لـە بـۆنی دەرمـان و دیتـۆڵی تیمـارکردن. ئـەو ژوورەی کـە حەزناکـەم هـەرگیز بچمە نێـوی، بـەڵکوو دەمـەوێت لێـی بێمـە دەر. بـەڵام تـا ئێـرە هـەموو شـتێك بـێ کێشـە و سەرێشـە ڕۆشـتووەتە پێشـێ. ماوەیـەکی زۆر لـە تەنیشـت یـەك دادەنیشـن و بـە واقوڕماوییـەوە تەماشای دەموچاوی یەکتر دەکەین.

دەگەڕێینەوە بۆ ژووری نیشمەنەکە و بـەو گروپـە داعشـەی کـە پاسـەوانیمان دەکـەن دەڵێین، بڕیارمان داوە بەردەوام بین لە سەفەرەکەمان و تا کۆتـایی بمێنینـەوە. هەڵبـەت ئێمە چاوەڕوانی ڕەفتارێکی باشترمان لەوان دەکرد. ئەو سێ کەسە بە بێدەنگیی گوێیـان لە بڕیارەکەی ئێمە دەبێت. ئەبوقەتادە و ئەبولوت هـەوڵ دەدەن بـە باسوخواسـی چـەند

هەواڵێکی نوێ لەسەر دەوڵەتی ئیسلامی کەمێك فەزاکە خۆشتر بکەن. ئەوان باسی ئەم شتانەیان کرد:

جگەرەکێشان لە دەوڵەتی ئیسلامیدا قەدەغەیە. ئەم قەدەغەکردنەش بەکراست جێبەجێ نەکراوە، بەڵکوو هەنگاوبەهەنگاو خراوەتە بواری جێبەجێکردنەوە. لە هەنگاوی یەکەمدا فرۆشتنی جگەرە قەدەغەکراوە و دواتر جگەرەکێشان لە شوێنە گشتییەکان. دواجار فرۆشتن و بەکارهێنانی بە شێوەیەکی فەرمیی قەدەغەکراوە. بەپێی قسەکانی ئەبوقەتادە داعش چاودێریی و سانسۆر ناخاتە سەر ئەو خەڵکەی کە لەنێو چواردیواریی ماڵەکەی خۆیاندان. ئەگەر کەسێك بیەوێ لە ماڵی خۆی جگەرە بکێشێت، ئەوکات خۆی بەرپرسی کاری خۆیەتی و داعش هیچ سانسۆرێکی لەسەر دانانێت، داعش چاودێریی ئەم کارانە ناکات و کاری بەسەر ئەم جۆرە شتانەوە نییە. بەڵام ئەگەر هەر کەسێك بەهۆی جگەرەکێشان لە شوێنە گشتییەکان دەستگیر بکرێت، ئەوا سزاکەی بریتییە لە لێدانی ٣٠ شەلاق.

مۆسیقاش قەدەغەیە، ئەبوقەتادە هەوڵ دەدات ئەوەمان بۆ ڕوون بکاتەوە کەوا چەند لێکۆڵینەوەیەك سەلماندوویانە هەندێك جۆری مۆسیقا کاریگەریی خراپ لەسەر زاتی گوێگر بەجێ دەهێڵن و دەبنە مایەی دڵتەنگبوون و نیگەرانیی گوێگر. ئەو خۆی درکی بەم ڕاستییە کردووە، سەرەڕای ئەوەش پێشتر خۆی زۆر گوێی لە مۆسیقا و گۆرانی گرتووە. ئەبوقەتادە زۆرتر گوێی لە هیپ هۆپ و ڕاپی ئەڵمانی گرتووە بە تایبەت گروپەکانی دایش کیند[٧٤] و فیتس برۆت[٧٥].

ئەبوقەتادە بەردەوام دەبێت، خەڵکی سووریا میللەتێکی نیشتیمانپەرستن، ئەوە یەك ساڵ دەبێت داعش دەستی بەسەر شاری ڕەققەدا گرتووە، بەڵام تا ئێستاش خەڵکی ئەم شارە وەکوو بێگانە و بیانی سەیرمان دەکەن، نیگاکانیشیان نیگایەکی ڕەخنەگرانەن و باش تەماشامان ناکەن. تەنانەت هەندێك لەو خەڵکە وەکوو داگیرکەر لە داعش دەڕوانن.

---

74 Deichkind
75 Fetts Brot

قاچاغچییەکانی مرۆڤ بۆ دەربازکردنی هەر نەفەرێك لێرە و هەناردنی بۆ ئەورووپا بڕی ٦٠٠$ لە هەر هاوولاتییەکی سووریی وەردەگرن .

ئەبوقەتادە دەڵێت، ئەو شتەی بۆ ئێمە زۆر گرنگە ئەوەیە، کە دەولەتی ئیسلامی بە باشی پاسەوانی و حوکمی ئەم خەڵکە بکات. تەنانەت داعش ڕێگە بە خوێندکارەکانی شاری ڕەققەش دەدات، بۆ درێژەدان بە خوێندنەکەیان بچنە زانکۆکانی ژێر دەسەلاتی ئەسەد، زۆرن ئەو کچانەی لەم دەرفەتە سوود وەردەگرن. چونکە بە هەر جۆرێك بووە دەبێ دەولەتی ئیسلامی ژیانێکی پڕ لە ئارامی و ئاسایش بۆ ئەو خەڵکە فەراهەم بکات.

لێرەدا زۆر گرنگە لایەنی دارایی لەبەرچاو بگیردرێت، پارە هەموو دەرگا داخراوەکان دەکاتەوە و چارەسەری هەموو کێشەکان دەکات.

گەورەترین سەرچاوەی دارایی داعش ئەو دەسکەوتانەیە کە لە ڕێگەی فرۆشتنی نەوتەوە وە چنگ دەکەوێت. داعش هەر بەرمیلێکی نەوت بە بڕی ١٢$ دەفرۆشێت. ئەوان سەرچاوەی گازیشیان هەیە، بەلام گازەکە خەلکی خۆیان زیاتر سوودی لێ دەبینن.

لە ئاییندەدا داعش پارەی لە جێی دۆلار وابەستەی ئاڵتون دەبێت، پارەی ئاڵتونی ئێستا لەبەردەستدایە، بەلام هەرکاتێك یەکەمین سکەی ئاڵتونی لێدرا، ئەوکات سکەی ئاڵتونی دەبێتە پارەی ڕەسمی دەولەتی ئیسلامی.

داعش لە ساڵی ٢٠٠٦ لە ئێراق پەیدابووە و لە لایەن خەڵکی هەندێك لە ناوچە جیاجیاکانی ئێراقەوە پێشوازییان لێ کرا. "لێرە خەڵك باش لەوە تێگەشتوون کە تا ئەو کاتەی پێچەوانەی یاسا خواییەکان ڕەفتار نەکەن، دەتوانن ژیانێکی پڕ لە ئارامییان هەبێت".

لە وڵاتی سووریا داعش لە سەدا ٧٠ ی هێزەکانی بیانین و ٣٠ لە سەتی هێزەکانیش سوورین، بەڵام لە ئێراق پێچەوانەیە، ٧٠ لە سەتی هێزەکانیان ئێراقی و ٣٠ لە سەتی هێزەکانیان بیانین.

هەر کەسێك کە تازە دێتە نێو داعشەوە، دەبێت سەرەتا بچێتە کەمپێکی مەشق و ڕاهێنانەوە، ڕاهێنان و فێرکردنیش دوو قۆناغ لە خۆ دەگرێت: لە قۆناغی یەکەمدا ئەو کەسەی کە تازە هاتووە دەبێت یاساکانی شەریعەت و بنەما ئیسلامییەکان فێر ببێت. ئەم قۆناغە ٢ بۆ ٤ هەفتە دەخایەنێت. لەوێ ئەندامە نوێیەکان فێری ئەوە دەکرێن کە چی شتێك باشە و چی شتێك خراپە و چۆن بەگوێرەی یاسا ئیسلامییەکان ڕەفتار و هەڵسوکەوت بکەن. قۆناغی دووەم مەشق و فێرکارییە سەربازییەکان لە خۆ دەگرێت. لەم قۆناغەدا تەنها چۆنێتیی شەڕکردن و بەکارهێنانی هەموو جۆرە چەکێکیان فێر دەکرێت، ئەندامە نوێیەکان هەر زوو شەڕکردن و شارەزای بەکارهێنانی هەموو جۆرە چەکێك فێر دەبن. زۆریش سەخت نییە. هەروەها یەکێك لە مەرجە گرنگەکانی چەکدارە نوێیەکان بریتییە لە خۆڕاگریی و دامەزراویی و پایەداریی پێیەکانیان. هەموویان بە دڵ و بە گیان حەز دەکەن فێر بن و بەگوێرەی توانای خۆیان هاوکاریی داعش بکەن. هەموو کوشتەی شەڕکردن و مردنن. بە ڕاڤەی ئەوان یەك کاتژمێر شەڕکردن لەبەرەکانی پێشەوەی جەنگ، وەك ئەوە وایە ٦٠ساڵ عیبادەت و خواپەرستی بۆ خوا بکەیت.

بەڵام کەسیش بۆی نییە بە خۆڕایی خۆی بە کوشت بدات و گیانی خۆی بخاتە مەترسییەوە. بۆ نموونە خەلیفە ڕێگە بەوە نادات کەسێکی لێهاتووی بەتوانای مەشقپێکراو لەشەڕ یاخود هێرشە خۆکوژییەکاندا خۆی بتەقێنێتەوە، چونکە ئەو کەسە ئەرکی گرنگتری بۆ ڕاپەڕاندن هەیە .

لە دەوڵەتی ئیسلامیدا ئافرەتێکی زۆر لەنێو دەوڵەتدا کار دەکەن، بەڵام نەك وەك سەرباز و ئەو ڕۆڵەی کە ئافرەت لەنێو هێزە کوردییەکاندا دەیگێڕێت. بە ڕای ئەوان پێشمەرگەکانی پەکەکە خەڵکانێکی (بێغیرەت)ـن، چونکە ئافرەتەکانیان ڕەوانەی ڕیزەکانی پێشەوەی جەنگ دەکەن .

لە دەوڵەتی ئیسلامیدا منداڵەکان لە قوتابخانە فێری سێ شت دەکرێن: قورئان، یاسا ئیسلامییەکان (شەریعەت) و شەڕکردن، ئەم سێ شتە بە کۆڵەکەی سەرەکی سیستمی پەروەدەیی و پرۆگرامی فێرکردنی داعش دادەنرێت.

ئەبوقەتادە بەردەوام دەبێت، لە ئێستادا یەکەکە بەهێزترین دوژمنی ئێمەیە، کە خاوەنی هێزێکی تۆکمەی زەمینییە، بەڵام ئەگەر هاوکاریی هێرشە ئاسمانییەکانی ئەمریکا نەبووایە، داعش کۆبانێشی کۆنترۆڵ دەکرد. لە ئێستادا ئەمریکا هێندە ئەو شارەی وێرانکردووە، چیتر جێگایەك نەماوەتەوە بۆ ئەوەی چەکدارانی داعش خۆیانی تێدا بشارنەوە . ئەو شارە وەکو ناکازاکی دوای بۆردومانە ئەتۆمییەکەی لێ هاتووە. ئەگەر ئەمریکییەکان بەم ستراتیژییە مامەڵە لەگەڵ داعش بکەن ئەوە ڕۆژگارێکی ڕەش چاوەڕوانی عەرەبەکان دەکات. ئەبوقەتادە باس لەوە دەکات لە کۆبانێ نزیکەی ٥٠٠ چەکداری داعش و ژمارەیەکی یەکجار زۆری خەڵکی بێلایەن کوژراون. زۆرینەی کوژراوەکانیش لە ئەنجامی بۆردومانی هێرشە ئاسمانییەکانی ئەمریکاوە بوون .

ئەو دەڵێت ئێزیدییەکان یان دەبێت موسڵمان بن یان دەکوژرێن. بە قسەی ئەبوقەتادە ئێزیدییەکان تەنها باوەڕیان بە شەیتان نییە، بەڵکو دەشیپەرستن. دەڵێن زۆرێك لە ئێزیدییەکانی شەنگال موسڵمان بوونە و ژمارەیەکی زۆر لە ژنەکانیشیان وەکوو کەنیزەك بەکاردەهێنن.

ئەبوقەتادە دەڵێت تا کۆتایی ٢٠٠١ هەواداری سەرسەختی ئەمریکییەکان بووە، تەنانەت لە دوای هێرشەکانی ١١ی سێپتەمبەر لە نووسینگەی ڕێزگرتن لە کوژراوەکانی ئەو ڕووداوە هاوخەمیی خۆی دەربڕیوە، بەڵام دوای کەمێك گومانی لەسەر هەموو شتەکان بۆ دروست دەبێت. بۆچی هێرش کرایە سەر ئەمریکا؟ مالکولم پێی باشە بزانێت ڕاوبۆچوونی ئەبوقەتادە لەسەر دەنگۆی پیلانگێڕیی پشتەوەی ڕووداوی ١١ی سێپتەمبەر چۆنە. ئەبوقەتادە بزەیەك دەکات و دەڵێت: "بەڵێ، ئێمەش گومانمان هەیە، بەڵام گومانێکی تەواو."

سەرێك دەلەقێنم. زۆرینەی خەڵکی دنیا قوربانی دەستی کاری سیخوڕیی و کاری پیلانگێڕانەن. بە ئەبوقەتادە دەڵێم: "تەنانەت هەندێك خەڵك هەیە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە گرتەی ڤیدیۆیی سەربڕینەکانی داعش دەستکرد و ساختەن." ئەو بەم جۆرە وەڵام دەداتەوە: "گرتەڤیدیۆییەکان زۆر بە وردیی و بە ئاگایانەوە مۆنتاژ دەکرێن، بۆ

ئەوەی شوێن و پێگەکانیان ئاشکرا نەبێت." هەروەها بە قسەی ئەبوقەتادە محەمەد (درودی خوای لەسەر بێت.) خۆی جیمز فولی سەربڕیوە. پێش ئەو باو نەبووە سەری هیچ کەسێك ببڕدرێت. یەکەمین جار ئەو بڕیاریدا، کە سەری تاوانبار لە جەستەی لێ بکرێتەوە .

خۆ پێغەمبەری گەورەی ئیسلام ناتوانێت لە دوری ١٤٠٠ ساڵەوە لەسەر ئەم مەسەلەیە بەرگریی لە خۆی بکات، بەڵام بەداخەوە تەواوی ئەو کارانەی داعش دەیانکات، لەسەر ئەو دەنووسرێنەوە. ئەگەر ڕۆژێك داعش دەست بەسەر وڵاتی فەرەنساشدا بگرێت. بێگومان بانگەشەی ئەوە دەکات کە (گیوتین)ـیش دروستکراوی دەستی پێغەمبەرە. ئەبوقەتادە دەڵێت: "بەڵگەی سەربڕینەکانی ئێمە تەنها هۆشداریدانە و بەس."

ئەبوقەتادە لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێت: "محەمەد جۆلانی ڕابەری گروپی تیرۆریستیی بەرەی نوسرە، دەستی بەسەر دە ملیۆن دۆلاردا گرت، ئەمە یەکێکە لە هۆکارەکانی جیابوونەوەی ئێمە لە گروپەکەی ئەو. ئەو مێردمنداڵەی کە وێنەکەی لە میدیاکاندا بڵاوکراوەتەوە ڕاستییە و ئەوە خودی محمد جۆلانییە."

ئەبوقەتادە کاروچالاکییەکانی گروپی ڕادیکاڵی (تاڵیبانی پاکستان) بە باش وەسف دەکات. بەڵام بە پێچەوانەوە تاڵیبانی ئەفغانستان بە کارەسات ناو دەبات. هەروەها دەڵێت مەلا عومەر پیاوێکی دەستوپێ سپی و شایستەی ئەوە نییە ببێتە ڕابەری یەکێك لە خەلافەتە ئیسلامییەکان، چونکە لە ڕەگەز و بنەماڵەی قورەیش نییە و کوڕی بنەماڵەیەکی ئیسلامی بەناوبانگ نییە. جگە لەوەش، ئوسامە بن لادن ئەوی بۆ ئەم کارە دەستنیشان نەکردووە.

ئەو، ئەو ئەڵمانیانە بە هەڵگەڕاوە دەزانێت کە بۆ ئەڵمانیا گەڕاونەتەوە، ئەگەر پاشگەز نەبنەوە لەم قسەیەیان و داوای لێبووردن نەکەن ئەوە حوکمی کوشتن چاوەڕێیان دەکات. وەختێك من چەند جارێك دەربارەی کاروچالاکی تیرۆریستی ئەو کەسانەی گەڕاونەتەوە بۆ ئەڵمانیا پرسیاری لێ دەکەم، تەنیا پێ دەکەنێت: "کەس نازانێت، بەڵام

لە ڕاستیدا ئەو کەسانەی گەڕاونەتەوە بۆ ئەڵمانیا نەیانتوانی لێرە هیچ کارێك وەکوو خۆی و بە جوانیی ڕاپەڕێنن."

ئەبوقەتادە دەڵێت کە ٤٤ سەربازە کڵاوشینەکانی ڕێکخراوی میللیی دوورگەکانی فیجی کە ئەمساڵ لەلایەن بەرەی نوسرەوە رفێنرابوون، لە ڕاستیدا ئەو سەربازانە لەژێر دەستی سوپای ئازادەوە دزرابوون، بەڵام بەرەی ئازادیی سووریا بەهۆی لەبەرچاوگرتنی پشتیوانی ڕۆژئاواییەکان، بۆ ئازادکردنیان داوای پارەیان لە ئەمریکا کرد. بەم شێوەیە ئەوان بارمتەکانیان دایە دەستی بەرەی نوسرە و پاشان پارەکەیان لەنێوان خۆیاندا دابەشکرد.

بۆ نانی ئێوارە پیاوێکی داعشی قاپێکی گەورەی برنج و مریشك بۆ ئەبولوت دێنێت، لەگەڵ کەمێکیش ماست و شوشەیەك پیپسی. مالکولم دیسان شەربەتی دەوێت، بەڵام من و فریدریك دەمانەوێت لەم داوایەی پاشگەزی بکەینەوە، چونکە لەوێ تەنها یەك تەوالێتی لێ بوو. بەڵام ئەو گوێ بە ئێمە نادات، هەر دەڵێی گەدەی لە ئاسنە.

فەزاکە کەمێك ئارامتر دەبێتەوە، چونکە بڕیارە سبەینێ زیندانیکردنی ئێمە لەنێو ئەم خانووەدا کۆتایی پێ بێت. ئەبوقەتادە و ئەبولوت هەوڵدەدەن ئەو دەمەقاڵەیەی کە لەنێوانمان ڕوویداوە لە بیری کابرای بەریتانی سەروچاوداپۆشراو ببەنەوە و پینەی بکەن. وەختێك ئێمە بە شێوەیەکی توند مامەڵەمان لەگەڵ دەکرێ، دەچینە بەر هەیوانەکە بۆ ئەوەی چاو لە ژیانی خەڵکیی بکەین، بەڵام بۆ ئەم کارە ئەوان هیچ قسەیەك ناکەن.

ئەمڕۆ لە ڕۆژەکانی پێشتر زووتر جیا دەبمەوە و دەچمە نێو کیسە خەوەکەمەوە. فریدریك لای ئەبولوت و ئەبوقەتادە دەمێنێتەوە و مالکولمی بێچارەش بەردەوام لە ڕێی ئاودەست خەریکی هامشۆکردن دەبێت. مالکولم بە گەدە ئاسنینەکەیەوە بەرگەی هەندێك لە شەربەتە تازە عەرەبییەکان ناگرێت.

شەو نیوە بووە، کەچی دەنگی تەقەی بەرز دەبیستین. تەقەکان لە شوێنێکی زۆر نزیکەوە دێن. سەرەتا ئەبوقەتادە کەمێك پەرێشان دیارە، دوای چەند خولەك دڵەخورپێ دڵنیا دەبێتەوە لەوەی کە تەقەکان لە لایەن چەکدارەکانی خۆیانەوە بووە. نازانین

تەقەكان لەبەر چی كراون، بەڵام وادیارە لە دەرەوە شادییەك بەرپابووە. ئەبولوت دەچێتە دەرەوە تا پرسوڕایەك بكات. دوای چەند خولەك بە ڕووخۆشی و شادمانییەوە دەگەڕێتەوە و دەڵێت داعش ناوچەیەكی گرنگی نزیكی (دێرزور)ـی ڕزگاركردووە، هەر بۆیە براكانمان ئێستا بەم هۆیەوە خەریكن جەژن دەگێڕن.

تەقەكردن و یاریی ئاگرین تەنانەت لە كاتی لەم شێوەیەشدا لە دەوڵەتی ئیسلامی ڕێگەپێدراو نییە. بە تایبەتی لەو ناوچانەی كە خێزان و منداڵی تێدا نیشتەجێیە. دواتر كاتێك ئەبولوت دەست بە تەقەكردن دەكات بە ئاسماندا، پۆلیسێكی داعش دێت و چەكەكەی ئەبولوت دەبات، یەك هەفتە پاش ئەوە چەكەكەی پێ دەدەنەوە.

### ڕۆژی چوارەم

### سێشەممە، ٩ـی دیسامبەری ٢٠١٤

كاتژمێر ٨:٢٠ لە بەردەم دەرگای باڵەخانەكەمان لەنێو دۆڵمشێكی بچووك دادەنیشین، بڕیارە ئەم دۆڵمشە بەرەو موسڵ بە ڕێ بكەوێت. من و فریدریك و مالكولم كەموكوت چاومان بە خەوەوەیە. شتێكی ئاساییە، چونكە هیچ یەكێكمان لێرە ناتوانین بە باشی و بە ئاسوودەیی بخەوین. شۆفێرە سەروچاوداپۆشراوەكە بە فریدریك دەڵێت لەنێو ماشینەكەشەوە بۆت نییە وێنەی شاری ڕەققە بگریت. هەركات گەشتینە موسڵ دەتوانی وێنە و فیلم بگرێت.

دیسانەوە بە مەیدانێكدا تێپەڕ دەبین، لێرە جارجارە داعش سەرە بڕدراوەكانی نمایش كردووە. ناوی مەیدانەكە (دەوار نەعیم)[٧٦] ـە. بە جۆرێك هەموو شتەكان لە مۆتەكەیەك دەچن. تۆ بڵێی بە سەلامەتی لەم خاكە ڕزگارمان بێت؟ جارێك تەنها پارچەكاغەزێك (مەبەستی بەڵێننامەكەیە) ئێمەی لە شمشێری مەرگباری داعش پاراستووە، ئەویش بەگوێرەی ئەو قەولوقەرارانەی كە بە ئێمەیان داوە. سەرم گێژ دەخوات. بەگوێرەی ئەو قسە توندانەی دوێنێی كابرای سەروچاوداپۆشراو، وادیارە ئەو

---

76 Douwar Naeem

دەربارەی پێدانی مۆڵەت و بەڵێننامە بە ئێمە بۆ سەردانیکردنی دەوڵەتی ئیسلامی زۆر ڕازیی نییە. ئێستاش ئەو هەستە ئازاری من و فریدریکی کوڕم دەدات. تا ئێستا هیچ یەک لە پەیامنێرانی ڕۆژئاوایی بە سەلامەتی لە دەستی دەوڵەتی ئیسلامی ڕزگاریان نەبووە، باشە دەکرێت چارەنووسی ئێمە جیاواز بێت؟

دەمەقاڵەکەی دوێنێ بۆ یەکەمین جار ئەو هەستەی پێداین کە بە تەمای گیان و ڕۆحی خۆمان نەبین، بەڵام لە ئێستادا وادیارە شۆفێرەکەمان بەو جۆرە بەرانبەرمان توڕە نییە، کەمێك ئارام بووەتەوە.

هیچ کەس لەسەر شەقامەکان نییە، چونکە خەڵکیی لە بۆردومانەکانی ئەسەد دەترسن، خەڵکی ئێرە ژیانیان لەگەڵ فڕینی فڕۆکەکاندا ڕێك خستووە. کاتێك کەشوهەوا خۆشە و ئاسمان ساماڵە کەمتر لە ماڵەکانیان دێنە دەرێ، کەچی کاتێك دنیا تاریك دەبێ هەست بە ئارامی دەکەن و لە ماڵەکانیان دێنەدەرێ. هەرچەندە دوای ئەسەد ئەمریکییەکان دەست بە بۆردومانکردنی ناوچەکە دەکەن. وەك دەبینین دەرگای قوتابخانەکان کراوەیە. قوتابخانەیەکی کچان هەشت هەزار خوێندکاری کچی هەیە، قوتابخانەیەکی زۆر گەورەیە. جگە لەمە قوتابخانەی تایبەتیی زۆری لێیە، بەڵام سەرەڕای ئەمانە زۆرێك لە منداڵەکان دەبێ ئاگایان لە خێزانەکانیان بێت، چونکە ئەوان لە جێی خوێندن ناچارن کار بکەن.

لە شاری ڕەققە پرۆژەیەکی زۆری باڵەخانەدروستکردن تووشی سەرسامی کردین! بێگومان هەندێکیان هیی سەردەمی ڕژێمی ئەسەدن. ئایا ڕۆژێك دێت تەواو بکرێن؟ ڤێلایەکی زۆر بەرچاو دەکەوێت، باشە بەم حاڵەوە چ کەسانێك لێرە دەژین؟

دیسان شۆفێرەکەمان دەپرسێت: "ئای پاد، تابلێت یاخود مۆبایلی دیکەتان پێیە یاخود نا؟" من ئایپادێکم پێیە کە تەنها بۆ نووسین سوودی لێ وەردەگرم. کابرای سەروچاوداپۆشراو بە ئارامییەکەوە دەڵێت: "ئەویشم بدەرێ." فریدریك بە شێوەیەکی زوویرانە تەماشام دەکات. بە زمانی بێ زمانی چاوی پێم دەڵێت کە لەگەڵ شۆفێرەکەمان

مشتومڕ نەکەم. بۆ ماوەیەکی کەم لە شوێنێك ڕادەوەستین و ئایپادەکەمان بە لاوێکی داعشی دەدەین.

سوود لەم دەرفەتە وەردەگرین و کەمێك دەست و لاقمان دەجولێنین. پیرەژنێك لەولاوە دێت و نانە تازەکانی لەسەر زەوییە خۆڵاوییەکە بڵاو دەکاتەوە بۆ ئەوەی سارد ببنەوە، کچەکەشی یارمەتی دەدات. نانەکان یەك یەك لەسەر زەوی دادەنێن و دواتر هەڵیان دەگێڕنەوە. ئەبوقەتادە دەپرسێت، کەمێك نانمان پێویست نییە؟ بەڵام ئێمە ئارەزوومان ناچێتە سەر نانی خۆڵاویی و دیسانەوە بە ڕێ دەکەوین.

لەنێوان دوکانی سەوزە و میوەفرۆشەکان لە هەموو لایەکەوە کەلاوە وێرانەکانی بۆردومانکراو دەبینرێت. هەندێك لە باڵەخانەکان بە تەواویی وێران بوون، بەڵام هەندێکی تریان تەنیا نهۆمی سەرەوەیان وێران بووە. ئەمانە وادیارە جێدەستی بۆردومانەکانی بەشار ئەسەدن. چونکە ئەمریکییەکان کاتێك خانوویەك بۆردومان دەکەن ئەو خانووە لە بێخ دەهێنن و خاپووری دەکەن. بە تەنیشت مزگەوتێکی شیعەکاندا تێپەڕ دەبین، کە ئەمریکی یا سوورییەکان بۆردومانیان نەکردووە و داعش وێرانی کردوە و وادیارە شانازیش بەم کارەیانەوە دەکەن. تەنها سووچێکی ئەو مزگەوتە ماوەتەوە، ئەو سووچەی وێنەی لەسەر کێشراوە .

هەرچەندە بە ڕواڵەت لە شاری ڕەققە خزمەتگوزاری گواستنەوەی خۆڵ و خاشاك هەیە، بەڵام تەپۆڵکە و کۆگای خۆڵ و خاشاك لە هەموو شوێنێك بەرچاو دەکەون. هەندێکیان لە کاتی سووتاندندان. بە قسەی ئەبوقەتادە ئەم کێشەیە پەیوەندیی بە بەرپرسەکانی داعشەوە نییە، بەڵکوو دەگەڕێتەوە بۆ کەمتەرخەمی خەڵکی ناوچەکە خۆی.

لە خاڵێکی پشکنین کە چەکدارانی داعشی تێدا جێگیر کراوە ڕادەوەستین. شۆفێرەکەمان کاغەزێك دەردێنێ و پیشانیان دەدات، پاشان ئەوان ڕێگە بە تێپەڕبوونمان دەدەن. دواتر بەناو دڵی بیاباندا و لەسەر ڕێگایەکی نزیك لە هێڵی سایکس بیکۆ دەست بە لێخوڕین دەکەین، ئەو هێڵەی پێشتر فەڕەنسی و بەریتانییەکان بەهۆیەوە ئێراق و

سورییایان لە نێوان خۆیاندا دابەش کرد. دوای چەند کیلۆمەترێك لێخوڕین بەناو زەوییەکی بیابانیدا خاڵێکی پشکنینی تر دێتە پێشمان، لێرە ژمارەیەکی زۆر لە ئاڵای داعش هەڵواسراون و دەشەکێنەوە. لەم وێستگەیەش بێ هیچ ڕێگریکردنێك تێپەڕ دەبین.

ئێستا لەسەر جادەیەکین کەوا بەرەو شاری حەسەکە دەڕوات. تا ئەو شوێنەی چاوم بڕ دەکات هیچ شتێك لەم بیابانە نابینم، جگە لە چەند شوانێك و ڕانەمەڕەکانیان و چەند تەپۆڵکەخۆڵێکی بچووك.

پاش کاتژمێرێك لێخوڕین بەلای ڕاستدا بۆ جادەیەکی بیابانیتر پێچ دەکەینەوە ، بەڵام لێرە دەوڵەتی ئیسلامی تابلۆکانی خۆی داناوە. ئەم جادەیە دەڕواتە سەر(ئەلشەدادی)[77] لەوێ دەمانەوێت بچینە سەرئاو(w.c) ، بەڵام ئەوان ڕێگەمان پێ نادەن. شۆفێرەکەمان لەژێر لێویەوە دەڵێت: "لەبەر هۆکاری ئەمنی!"[78] بەڵام دواتر خواردنەوەمان بۆ دێنێت. ئەبولوت کە چیتر سەر لە مەسەلەکە دەرناکات دەبێ چی بکەین و چی نەکەین، پێمان دەڵێت کە بەگوێرەی دەستوور و فەرمانەکانیان ڕەفتار بکەین. فریدریك دەڵێت: "هەر هیچ نەبێ شۆفێرەکە دەتوانێت لەگەڵمان میهرەبانتر بێت، خۆ ئێمە هیچمان پێ نەکردووە." ئەبولوت لە وەڵامدا دەڵێت: "ئەو هەر بەم شێوەیە ڕەفتارێکی بێئەدەبانە و ئاڵۆزی هەیە، ئەمە بووەتە بەشێك لە جەستەی و پێویست ناکات ئێمە پێی دڵگران بین."

بەڵام چوونە سەرئاو بابەتێکی شەخسییە. زۆر گەمژانەیە. پیادە دەبین و بۆ سەرئاوکردن لە پشتی ماڵۆچکەیەکی قەدیمی بۆ سەرئاوکردن خۆمان حەشار دەدەین. با شۆفێرەکەمان هەر هاتوهاوار بکات. فریدریك و ئەبولوت بەدوای مندا دێن. پاش سەرئاوکردن دووبارە سواری ترۆمبیلەکەمان دەبین. بە گەرمییەکەوە سوپاسی شۆفێرە سەروچاوداپۆشراوەکەمان دەکەین لەبەر هێنانی خواردنەوە نوێیەکانی. ئەو بە سەسووڕمانەوە تەماشای ئێمە دەکات. ئاشکرایە دەیەوێت بتەقێتەوە.

---

77 Al shadadi

78 For security reasons!

وا دیاره بازاڕی کڕین و فرۆشتنی ماتۆڕ له ئەلشەدادی زۆر گەرمه، شەقامەکان پڕن له ماتۆڕسوار. لێره به ڕاستی ژیان بەردەوامه. پڕ جۆشوخرۆشترین ناوچەی دەوڵەتی ئیسلامی لەنێو ئەو ناوچانەی که من بینیم، ناوچەی ئەلشەدادی بوو.

جگه له ئەبولوت، کەس لەنێو ماشینەکه قسەمان لەگەڵ ناکات. شۆفێرەکەمان لەبەر هەر هۆیەك بێت بێدەنگه، ئەوەی تەنیشتیشی که ماسکێکی یاریی ئیسکی پۆشیوه هیچ ناڵێت، ئەبوقەتادەش یان ماندووه یان بیری له جێگایەکی تره. ڕێگایەکی ناڕێکه و بەرەو لای چوارڕیانێك دەڕوات. به بەردەم ناوچەیەکی چاککردنی ترۆمبێلدا، که وێرانبووه، تێپەڕ دەبین. پێ دەچێت فڕۆکەکانی ئەمریکا بۆردومانیان کردبێت، بۆ ئەوەی داعش نەتوانێ ئامرازەکانی گواستنەوه و کەرەسته جەنگییەکانی لەوێ چاك بکاتەوه.

له هەموو شوێنێك بەرمیلی کانزایی و ژەنگاویی دەبینم که دووکەڵی ڕەشیان لێ بەرز دەبێتەوه. له تەنیشتیان و لەنێو چاڵێکی ڕەش و ڕۆناویی پیاوێك وەستاوه که هەموو گیانی ڕەش هەڵگەڕاوه. ئەبولوت دەڵێت هەرچەند سەد مەترێك دەڕۆین، کەسێکی ڕۆنگۆڕی ترۆمبیل دەبینین.

وابزانم ئەبوقەتاده نوقمی خەونەکانی خۆی بووه و ئەبولوتیش لەملاوه باسی ئەو کەسانەمان بۆ دەکات که دێنه نێو داعشەوه: "مندالترین شەڕکەری ئەڵمانی لەنێو داعشدا کوڕێکی ١٦ ساڵان بوو که ئێستا مردووه. ئەو ئەڵمانییەکی به نەژاد بۆسنایی بوو، که هێشتا قوتابی بوو و بۆ خوێندنگا دەچوو. ئەو له خاڵێکی پشکنیندا بووه قوربانی فیشەکێکی سوپای ئازادی سووریا."

بوراك، شەڕکەرێکی تری ئەڵمانییه، که بۆ داعش شەڕ دەکات، ئەو یاریزانی تیپی فوتبۆڵی لاوانی ئەڵمانیایه. کوڕی یەکێکی دیکه له بانکداره ناودارەکانی بەریتانیاش بۆ داعش شەڕ دەکات. برایەکیشمان له ویلایەتی تەکساسەوه هاتووه، ئەو باوکی له سوپای ئەمریکا دایه. چەند کەسێکیش له ئیسرائیلەوه هاتوون و بۆ داعش شەڕ دەکەن، ئەو ئیسرائیلییانەی که به نەژاد عەرەبن و ناسنامەی ئیسرائیلییان هەیه.

شۆفێرەکەمان جێگاکەی دەگۆڕێت و شۆفێریی بە کابرای تەنیشتی دەسپێرێت. دوای ۱۵ خولەك دەنگی تەقەیەك دێت، ئێمە لەگەڵ لۆرییەکدا پێکدا دەکێشین. ئەوەی کە ماسکێکی ئیسکی پۆشیوە بە زمانێکی بەریتانی قولتر لە شۆفێرە سەرەکییەکەمان دەست بە پرتەوبۆڵە دەکات و دەڵێ مەگەر ئێستا وەختی گازداین و گرتنی ئستۆپی نەفرەتی بوو[79] . لێی دەپرسم: "تۆ بەریتانیت؟"[80] یەکەم جار وەڵام ناداتەوە، بەڵام دواتر بە عەرەبی دەڵێت: "خەڵکی 'نیۆرك'ـە، ئەو شوێنەی کە بە هیچ جۆرێك بە خەیاڵیدا نایەتەوە." دواتر بۆ ئەوەی سەیر بکات ترۆمبێلەکە چەندە زیانی پێ گەیشتووە، پیادە دەبێت. گڵگیری لای ڕاستی ترۆمبێلەکە زەربەی خواردووە و شۆڕ بووەتەوە. هەموومان بە هاوکاریی و بە زەحمەتێکی زۆر ئەو پارچەیە دەخەینە جێگای خۆی. ئاخر دەبێ تا شاری موسڵمان ببات. لەوێ دەبێ بگۆڕدرێت یان چاك بکرێت. پێش ئەوەی لە شوێنی ڕووداوەکە خەڵکمان بەسەردا بڕژێت بە ڕێ دەکەوین.

دوای کاتژمێرێك دەگەینە سنووری سایکس بیکۆ، بەڵام هیچ شتێك نابینرێت. ئەو باڵەخانە سنوورییانەی، کە ڕۆژگارێك جێی ژیانبوونە ئێستا هەموویان وێران بوون، هەموو شتێك تەخت بووە و لەگەڵ زەوی یەکسان بووە. لەسەر ستوونێك ئاڵای داعش هەڵکراوە. لەسەر بەردێك وێنەی ئاڵای ئێراق کراوە، بەڵام کەسێك دوای ئەوە هێما و سیمبوڵەکانی دەوڵەتی ئیسلامی تێدا کێشاوە.

ماوەیەك بە ئاراستەی درێژایی کێوەکانی شەنگال ڕێ دەکەین، ئەو شوێنەی کە ئێزدییەکان لە هاویندا هەڵاتبوون و ڕۆشتبوونە سەری. ناوچەکانی دەوروبەرمان وەکوو شوێنەکانیتر هەمووی وشك و چۆڵ و بیابانین تەنها ئەوە نەبێت کە جار جارە گوندی بچووکمان بەرچاو دەکەوێت. دواتر لەناکاو چاومان بە ژمارەیەکی زۆری ماشینی شرپوشیتەڵکراو و سووتێنراو دەکەوێت، کە لە کەناری جادەکەوە فڕێدراون. چما گرتەڤیدیۆییەکانی داعش لێرە تۆمار کراون، ئەوەی کە داعش یەك لە دوای یەك

79 He Just Went on his Fucking Brakes.
80 Your are British?

دەستڕێژی گولله بەنێو ماشینەکاندا دەکات و دواتر هەموو سەرنشینەکانیان دەمرن. پاشان باڵەخانەی وێرانتر لە ناوچەکەدا دەبینین. تا ئێستاش فریدریك بۆی نییە وێنەی ناوچەکانی دەوروبەرمان بگرێت. هێشتا ئەو قەولوقەرارەی وێنەگرتن لەنێوانماندا ماوە. کە پێشتر پێیان گوتین: "تەنها لە موسڵ."

ئێستا دەزانین کە ئەبولوت و ئەبوقەتادە و هەشت گەنجی تر لە (زولیگن)[81] ـەوە بۆ نێو داعش هاتوون. لەم ماوەیەدا دوو کەسیان مردوون. یەکێکیان ناوی ڕۆبەرت ب[82]. بووە، ئەبوقەتادە و ئەو پێکەوە لە زیندان بوونە. ئەبولوت و ئەبوقەتادە زۆر ڕێز بۆ ڕۆبەرت، ب، دادەنێن. ئەوان دەڵێن، ڕۆبەرت، ب، بێپەروا و ئیماندارێکی توندڕەو بوو و دەیویست بەهەر شێوەیەك بووە چالاکی خۆکوژی ئەنجام بدات. چەند مانگ چاوەڕوان بوو تا نۆرەی بێت، ١٦٠ کەسی تر پێش ئەو ناویان بۆ کردەوەی خۆکوژیی نووسی بوو. لە لیستی چاوەڕوانیدا بوون. بەپێی وتەکانی ئەبولوت ژمارەی ئەو کەسانەی کە داوای ئەنجامدانی هێرشی خۆکوژیی دەکەن، زۆر زۆرە. ڕۆبەرت، ب، بە خۆتەقاندنەوەی نزیکەی ٥٠ کەسی لەگەڵ خۆیدا لەناو برد.

دەڵێت لیستی ئەو کەسانەی کە خوازیاری کاری خۆکوژیی بوون لەمە زیاتر بووە. ئەبولوت باس لەوە دەکات کە پێشتر لە شاری حەلەب نزیکەی ٦٠٠ کەس لە لیستی چاوەڕوانیدا بوون. لە من دەپرسێت کە ئایا چەند مانگی پێش لەگەڵ فیلیپ، ب، دا قسەم نەکردووە. ئەو لە یەکێك لە ڕۆژەکانی ئەم هاوینەدا خۆی تەقاندەوە.

هێشتا ٦٠ کیلۆمەتری ماوە تا بە موسڵ بگەین. دووبارە دەگەینە خاڵێکی پشکنین و لەوێش بێ کێشە و سەرێشە دەرباز دەبین. ئاماژەمان پێ دەدەن کە تێپەڕین. کەم کەم لە ناوچەکانی دەوروبەری موسڵ نزیك دەبینەوە. بە تەنیشتی زیندانێکی گەورەدا ڕەتدەبین، یەکێك لە دیوارەکان وێران بووە. ئەبوقەتادە بە غرورێکەوە دەڵێت داعش لێرە چالاکی خۆکوژیی ئەنجام داوە و تەواوی زیندانییەکانی ئازاد کردووە. ئەو و

---

81 Solingen
82 Robert B.

ئەبولوت یەکەمین جارە دێنە شاری موسڵ. هەرچەندە نایانەوێ لە پێش چاوی ئێمە هیچ شتێك ئاشکرا بکەن، بەڵام وادیارە ئەوانیش بە بینین و سەردانیکردنی موسڵ زۆر خۆشحاڵ دیارن.

بە تەنیشت پاڵاوگەیەکی نەوتدا تێپەڕ دەبین، وابزانم خەریکی ئیشکردنە. هێزە ئەمنییەکان لە پێش دەرگاکەی وەستاون و چەند کەسێکیتر دەبینین کە لە حەوشەکەیدا دێن و دەچن. ناوچەکە پڕە لە چاڵی نەوت. لێرە تەنها دامەزراوە نەوتییەکان بەرچاو ناکەوێت، بەڵکوو بۆنی نەوتیش دێت.

بە تەنیشت ئۆردوگایەکی پەنابەراندا ڕەتدەبین، لێرە خەڵکانێکی زۆر لەنێو خێمەکاندا نیشتەجێ بوون و دەژین. خەڵکی کوێن و بۆچی پەنابەری داعشن؟ لە وەڵامدا دەڵێن لەو ناوچانەوە هاتوون کە شەڕی تێدایە، یان لەو ناوچانەوە هاتوون کە وێران کراون.

بە دوو خاڵی پشکنینی تردا تێپەڕ دەبین و دواجار دەگەینە شوێنی موسڵ. دەروازەیەکی ڕەشی گەورە کە لە کەوانێك دەچێت و ڕەنگی کەوانەکەش ڕەشە و بەسەر جادەیەکی چەند خەتیدا کێشراوە. دەروازەکە بە دڵی داعش دروستکراوە، ڕەنگی ڕەشە و پڕە لە نووسینی سپیی ڕەنگی نێو ئاڵاکەی داعش! دواجار فریدریك مۆڵەتی پێدەدرێت لێرە بەدوا گرتەی ڤیدیۆیی تۆمار بکات.

ئێستا چیتر لە شاری چەند ملیۆنی موسڵین، لەناو دڵی قەڵەمڕەوی دەوڵەتی ئیسلامی. پێنج هەزار چەکداری داعش کۆنترۆڵی ئەم شارە دوو ملیۆن کەسییەیان لە دەستدایە. لێرە کەمتر لە ٤٠٠ کەس توانییان زیاد لە ٢٠٠٠٠ سەربازی ئێراقی، واتە دوو لەشکری پڕ چەك و ئامادە ڕاوبنێن، تەنانەت ئەبوقەتادە دەڵێت: کاتێك هێرشیان کردۆتە سەر موسڵ ١٨٠ کەس بوونە.

بارودۆخی موسڵ زۆر ئاسایی دیارە، هاوشێوەی شارە گەورەکانیتری ڕۆژهەڵاتی نزیك. لێرە هێندە ڕەمزی داعشی دژەشارستانی و داعشی چاخە بەردینەکان نابینرێت. بە پێچەوانەوە، موسڵ شارێکی گەورەی پڕ جۆشوخرۆش و پڕ لە خەڵك و ترۆمبێلە، کە

بەنێو شەقامەکاندا دەسووڕێنەوە. وابزانم بەلای پۆلیسێکی هاتووچۆی داعشدا تێپەڕ بووین، زۆر دڵنیا نیم، بەڵام پێم وایە پۆلیسی هاتووچۆ بوو.

هەڵبەت هەرگیز ئەوەم بیر ناچێتەوە کە لەم شارە ژمارەیەکی زۆر خەڵکی شیعە و ئێزیدی کوژران و لەسەر ماڵ و حاڵی خۆیان دەرکران و بە هەزاران مەسیحیش هەڵاتنیان هەڵبژارد، تا لەژێر سایەی داعشدا نەژین. ئێستا کەمتازۆر شاری موسڵ بووەتە شارێکی یەکدەستی سوننەنشین، هەر چۆنێك بێت ئاخرشەڕیی، ئازار و ناڕەحەتی کوژراوەکان و ڕفێنراوەکان بەرچاو ناکەوێت.

بۆ شەقامێکی لاوەکی پێچ دەکەینەوە، تا چاومان بە کەسێك لە بەشی میدیایی خەلافەتی داعش بکەوێت. بڕیارە ئەو کاروچالاکی و ڕەوتی سەفەرەکەمان بۆ ڕوون بکاتەوە. لە دەرگایەکی شووشەوە دەچینە نێو دوکانێکی بچووکەوە. ئێرە بەشی بڵاوکراوەی (چاپەمەنییەکانی داعش)ـە. لێرە کتێب و نامیلکە جۆراوجۆرەکانی داعش دەستە دەستە دانراون و بڕیارە بەمزووانە بەسەر تەواوی مزگەوتەکاندا دابەش بکرێن. لە جامێکی شووشەدا، تازەترینی بڵاوکراوە و نامیلکەکان دانراون. ناوی هەندێکیان بە نموونە دەهێنم:

- چۆن لەگەڵ کەنیزەکەکان ڕەفتار بکەین؟
- چۆن سوێندی یاسایی و وەفاداریی بۆ خەلیفە بخۆین؟
- دەبێت ئافرەت چۆن ڕەفتار بکات و چۆن جل بپۆشێت.
- چۆن یارمەتیی هەژاران بدەین؟
- چۆن دەتوانی ببیتە شەڕکەرێکی باشی داعش؟

هەروەها نوێترین کتێب کە داعش بڵاوی کردۆتەوە لێرە خراونەتە ڕوو: (فقه الجیهاد)ـە، نووسەری کتێبەکە (ئەبو عەبدوڵای المهاجر) ڕاوێژکاری مەعنەوی زەرقاوییە. ئەو کەسە بوو کە زەرقاوی قایلکرد بەوەی کە هێرشە خۆکوژییەکان نەك هەر حەڵاڵە، بەڵکوو ڕێگایەکی ڕاستیشە. ئەبوقەتادە دەڵێت ئەگەر لە ئەڵمانیا ئەم کتێبە بە دەستی تۆوە ببینن ئەوە سزای حەوت ساڵ زیندانیت بەسەردا دەسەپێنن.

دەست دەکەن بە باسی هەر یەك لە نامیلکەکان و ئێمەش گوێیان لێ دەگرین. هەروەها باسی کتێبەکەش دەکەن. دواتر داوایان لێ دەکەین سەرو نامیلکە و کتێبمان پێ بدەن. جگە لە کتێبەکان چەند ئاڵایەکی داعشیشمان بە دیاریی پێ دەبەخشن، ئاڵاکان هەر یەکەیان لە ئەندازەیەکدان.

فریدریك و مالکولم برسییانە. بڕیار دەدەن کە جارێکیتر بگەڕێینەوە ئێرە و سەردانی ئەم شوێنە بکەین. بۆ ئەوەی شتێکمان بۆ خواردن دەستکەوێت، بەرەو ناوەندی شار بە ڕێ دەکەوین، لە موسڵ تەنانەت هوتێلیش نییە، هەڵبەتە هەموو هوتێلە چاکەکان لە سەردەمی داگیرکردنی موسڵەوە داخراون، چونکە وەك پێویست خزمەتگوزاریی کارەبایان نییە. هەروەها مافی ئەوەش بە ئێمە نادەن کە لە هوتێل بمێنینەوە. داعشەکان بە هیچ جۆرێك نایانەوێت لە پێش چاویان ونبین، ئەوان دەیانەوێت هەمیشە و بەردەوام نزیکیان بین و لەژێر چاودێریاندا بین. دوای ئەوەی زۆر تکایان لێ دەکەین بۆ ئەوەی لە هوتێل بمێنینەوە، بەڵام بێئەنجام دەبێت، ناچار تەسلیم دەبین.

ئەو ڕێستۆرانتەی کە بۆی دەچین لە یەکێك لە فەست فودەکانی ئەمریکا دەچێت، بەڵام پڕن لە زەرقوبەرق. تەنها دوو دانە لە مێزەکان گیراون و خەڵکیان لەسەرە. من و ئەبوقەتادە و ئەبولوت و فریدریك و مالکولم و شۆفێرە موسڵییەکە دەچینە نهۆمی یەکەمی ڕێستورانتەکە و ئەبوقەتادە هەڕەمەکی داوای نیوەی خواردەمەنییەکانی سەر کارتەکە دەکات. پێشخوانەکان بریتین لە زەڵاتەی جۆراوجۆر و لە قاپی بچووکدا پێشکەشمان دەکرێن، خواردنە سەرەکییەکانیش: مریشکی برژاو، مریشکی کەبابی، کەباب، کوتلت، پیتزا، پەتاتەی سوورکراو و نانە. خواردنەوەش وەك پێویست داواکراوە و وەك هەمیشە، پیپسی و ئاو و سپرایتە. پێدەچێت خواردنەکانی موسڵ زۆر باشتر بێت لە خواردنەکانی شاری ڕەققە. ئەبوقەتادە هیچ شتێك ناهێڵێتەوە.

ئەبولوت دەست بە باسکردنی پاڵنەرەکانی بۆ جێهێشتنی ئەڵمانیا و هاتنی بۆ دەوڵەتی ئیسلامی دەکات، ئەو دەڵێت کاتێك لە زولیگن بووم هاوشێوەی ئەبوقەتادە،

زۆرجار دەچوومە مزگەوتی (میلاتو ئیبراهیم)[83] . ئەو دەڵێت هەموومان شەیدای ئیمامی پێشوی مزگەوتەکەمان بووینە، پیاوێك بە ناوی محەمەد مەحموود ئیلیاس ئەبوئوسامەی قەریب، ئەو دەڵێت پاش وتاری هەینی لە دەوری یەکتر کۆدەبووینەوە و گفتوگۆمان دەکرد. من دەپرسم: ئایا ئەو سەلەفی بوو؟ بەڵام ئەبولوت حەزی بە چەمکی سەلەفی نییە. باس لەوە دەکات کە نازانێت بۆچی لە پرێکا هێرش و فەوزایەکی میدیایی گەورە لەسەر ئیمامی مزگەوتەکەیان دروست دەبێت، لە زۆرێك لە میدیاکان ئەو پیاوە بە نەفرەتی و بڵاوکەرەوەی نەفرەت ناو دەهێنن. ئەبولوت لە ترسی دەزگای پاراستنی دەستوور ماوەیەك تەرکی مزگەوتی کردووە و هاتوچۆی مزگەوتی نەکردووە. ئەو دەڵێت هەر زوو بۆ خۆی تێگەیشتووە ئەو شتانەی کە ئیمامی مزگەوتەکەیان لە وتارەکانیدا باسی دەکات بریتین لە (صراط المستقیم). ئەو دیسانەوە لەگەڵ هاورێکانی دەچێتەوە مزگەوت و کاتێکی زۆر لە مزگەوتەکەدا بەسەر دەبەن و پێکەوە گفتوگۆ دەکەن، دواتر لەگەڵ هاورێکانی پێکەوە یاریی فوتبۆڵ دەکەن یاخود کەبابیان ساز کردوە.

دواجار لە ساڵی ۲۰۱۲ هەموویان پێکەوە ڕوو لە جیهادکردن دەکەن. ئەو دەڵێت ئەم کارەیان بە فەرمانی خوایی زانیوە. نزیکەی دوو مانگ لە لیبیا دەورەیەکی مەشق و فێرکاریی دەبینن، فێرکارییەکان زیاتر بابەتە دینییەکان و چۆنێتیی بەکارهێنانی چەك و مەشقی تەکنیکی بوون. ئەبولوت پێی وایە لە ڕۆژئاوا بەهایەك نەماوە و کاری لێکۆڵینەوە و ڕاگەیاندنی دەرئەنجامی لێکۆڵینەکان بابەتێکی شەفاف نییە، ئەم بارودۆخە تادێت خراپتریش دەبێت. ئەو بارودۆخەی ئەمڕۆ ڕۆژئاوا تووشی بووە خواستی پەروەردگاری ئێمە نییە، بەهەرحاڵ ژیان بریتییە لە تاقیکردنەوە و بۆ ئەم تاقیکردنەوەیەش، مرۆڤ پێویستی بە پێشەوایەکی چاوساغ و لێزان هەیە.

کاتێك لێی دەپرسم ئەگەر محەمەد (درودی خوای لەسەر بێت) لەم سەردەمەدا بۆ مرۆڤایەتی ڕەوانە بکرابایە، ئەوکات فەرمانی بە چی دەکرد؟ گفتوگۆیەکی گەرم لە نێوانماندا دروست دەبێت. دەپرسم ئەگەر پێغەمبەر لە سەردەمی ئەمڕۆدا ڕەوانە بکرایە

---

83 Millatu Ibrahim mosche

ئایا وەکوو رابردوو لە پێش هەمووانەوە نەدەبوو؟ ئایا پشتگیریی چاکسازییە مۆدێرنەکانی ئەمڕۆکەی نەدەکرد؟ بێگومان یەکێك لە گەورەترین چاکساسیخوازەکانی مێژوو (مەبەستی پێغەمبەرە) پشتیوانی لە دابونەریتی ١٤٠٠ساڵی رابردووی نەدەکرد. وەك ئەوەی وەڵامەکە بۆ ئەبوقەتادەی رووگرژ روون بێت دەڵێت: "ئەگەر محەمەد ئەمڕۆ زیندوو بووایە هەروەکوو رابردوو هەڵسوکەوتی دەکرد و دەژیا. چونکە هیچ کتێبێکی ئاسمانیی پاش قورئان لەلایەن خواوە بۆ مرۆڤایەتیی نەنێردراوە و محەمەدیش تەنها ئەو کارانەی کردووە کە خوا فەرمانی پێ کردووە. مەسەلەکە چاکسازیکردن نییە، بەڵکوو مەسەلەکە هەڵبژاردنی رێگای راستە. رێگای هەموو پێغەمبەران. محەمەد بۆ ئێمە پێشەوا و سەرمەشقی ژیانێکی راست و دروستە." من بەم جۆرە وەڵام دەدەمەوە: "ژیانێکی راست و دروست بۆ سەردەمی خۆی، زیاد لە ١٠٠٠ ساڵ پێش"، دواتر دەڵێم: "ئەگەر ئێمە ئەمڕۆ بمانەوێت بەپێی بنەماکانی رابردوو بژین، ئەوا دەبێ هەموومان دەست بدەینە کاری کشتوکاڵ و شوانکاریی." ئەبوقەتادە بە ئارامییەکەوە دەڵێت: "دەی ئێوە خەریکی ئەم کارەن ئێستا." گرنگترین پەیام ئەوەیە مرۆڤ تەنها یەك خوا بپەرستێت، ئەو شتەکانی تریش بەدوای ئەم شتە بنەڕەتییەدا دێن. کوشتن و بردنی کەنیزەك. هاوبەشدانان بۆ خوای تاکوتەنها، گوناهی گەورەن. هەر بۆیە ئەو کەسانەی باوەڕیان بە دیموکراسییە و لە ئیسلام بە باشتری دەزانن، ئەوانە گومڕابوون. چونکە یاسای مرۆڤیان لە یاساکانی خوا بە باشتر داناوە. شتێك بە ناوی ئیسلامی میانڕەو و مرۆسالاریی نییە، کە زۆر حەز دەکەم دەربارەی بدوێم، شتی وا لە واقیعدا بوونی نییە. چونکە ئەوانەش موسڵمان نین هەموویان مورتەدن. هیچ تاکێکی موسڵمان کەسێك ناکاتە هاوبەش بۆ خوای تاکوتەنهای خۆی، هیچ پەرلەمانێکیش شایستەی ئەوە نییە یاسا دەربکات و یاسا دابنێت، ئەم مافە تەنها مافی(الله)یە .

لە ئەبوقەتادە دەپرسم بۆچی ئەو خوایەی کە هێندە گەورە و بەخشندە و بە دەسەڵاتە، کە منیش باوەڕم بەو سیفەتانەی هەیە، تەنها ئەوەی لە ئێمەی مەخلوقی بێکەڵك دەوێت کە بیپەرستین. ئایا ئەنجامدانی کاری باش و چاکەکاریی بۆ ئەو گرنگتر

نین لە پەرستن؟ بۆ من خـوا زۆر بەخشـندە و گـەورەترە لـەوەی ئێـوە دەیڵێن، ناکرێت خواوەند وەك ئەوەی ئێوە وێنای دەکەن بچووك بێت.

دەزانم بەم قسانەم خـەریکم لـە هێڵـی سـوور نزیـك دەبمـەوە، کـە ئەبوقـەتادە پـێشتر سەفەرەکەمان هۆشداریی پێمان دابوو، ئەوەی کە گوتی هەر کەس کـوفر بکـات سـزاکەی مەرگ دەبێت. بەڵام ئایا ئەگەر من خوا لەوە بە گەورەتر بزانم کـە ئـەوان باسـی دەکـەن. ئەم باوەڕەی من کوفرە و بە گوتـەی کـوفر هـەژمار دەکرێت؟ ئەبوقـەتادە بـە تـەرزێکی سـووکانەوە تەماشـایەکم دەکـات، لـەو چـرکەیەدا تروسـکاییەك یەکتاپەرسـتیی لـە چاوەکانیدا بەدی ناکەم. دەڵێت: "تۆ هەڵـەیت، ئـەو موسـڵمانە خراپـەش کـە درۆ و فێـڵ دەکات و مرۆڤ دەکوژێت لای خوا خۆشەویستتر و ئـازیزترە لـەو کەسـەی کـە بـاوەڕی بـە خوا نییە و کردەوەی باش دەکات".

لێرەدا گفتوگۆکەمان کۆتایی پێ دێت، شۆفێرە موسـڵێیەکە هـەواڵ بـە ئەبوقـەتادە و ئەبولوت دەدات کە دەتوانین بە ڕێ بکەوین. ئێستا ئەوانی دیکـەش لـەوێن؟ کـام ئـەوانی دیکە؟ دوو شۆفێرەکەی ڕەققە.

دوبارە دەگەڕێینەوە ئـەو دوکانـەی کـە نامیلکـەکانی تێـدا نمـایش کرابـوو، لـە پـێش دەرگاکـە ڕادەوەسـتین و چاوەڕوان دەبـین، چـونکە میوانـدارەکانمان نوێـژی جەماعـەت دەکەن. لـە تەنیشـتمانەوە سـەربازێکی لاو دادەنیشـێت و تەماشـای هەواڵـەکانی کـەناڵی جەزیرە دەکات. کەسێکیتری داعش دێتـە نێـو دوکانەکـەوە و سـڵاوێکی دۆسـتانەمان لـێ دەکات. ئەو باڵای نزیکەی ١٥٠ سانتیمەترێك دەبێت و پێ ناچێت تەمەنیشی لـە ١٣ سـاڵ تێپەڕی کردبێـت، بـەڵام بـۆ خـۆی دەڵێـت ٢١ سـاڵ تەمەنییـەتی و خـەڵکی عەرەبسـتانی سعودییە. وا دیارە لای چەکدارە ئێراقییەکانی داعش، ئەوانـەی کـە کـەم کـەم لـە نوێـژی جەماعەت دەگەڕێنەوە، ئەم گەنجە زۆر خۆشەویستە، چونکە هـەموویان بـە بینـینی ئـەم گەنجە خۆشحاڵ دەبن.

ئـەبولوت ڕازیـی دەکـەم لەگـەڵما بـۆ سـەر شـەقامەکە بێـت. دەڵێـت: "باشـە، بـەڵام ماوەیـەکی زۆر کـەم" ئاشـکرایە ئـەو ڕێزێکـی زۆر بـۆ شـۆفێرە بەریتانییەکـە دادەنێـت.

دەمەوێت کاتژمێرێکی دەستیی بکڕم، چونکە مۆبایلەکانیان لێ وەرگرتووین، بۆ ئەوەی کاتێك لە خەو هەڵدەسم هەر هیچ نەبێ بزانم کاتژمێر چەندە. لە دەرەوە دنیا تەواو تاریك بووە. شەقامی زانکۆ، کە ئێمە پیاسەی پیا دەکەین، لە هەموو لایەکەوە ڕووناکە و پڕە لە هاتوچۆی خەڵکی. هەموو دوکانەکان کراوەن. هەموو جۆرە وشکەیەك، کشمیش، میوەی وشك، بەستەنی، قاوە و چایی و هەموو جۆرە خرتکەوپرتکەیەك بۆ کڕین دەست دەکەوێت. تەنانەت دوکانێکی خوریفرۆشیشی لێیە. ئێرە لەو شارە ترسناکە ناچێت کە ئێمە لە خەیاڵدا وێنامان کردبوو. کاتژمێرێکی دەستی دەدۆزمەوە. کاتژمێرێکی زۆر هەرزان. ئەبولوت سوورە لەسەر ئەوەی کە پارەکەی بدات. نرخەکەی ١٢ یۆرۆیە. چونکە میوانی ئەواین ڕێگە نادەن پارە خەرج بکەین. پێی دەڵێم لە کۆتایی سەفەرەکەماندا کاتژمێرەکەت بۆ دەگەڕێنمەوە. ئەبولوت پێدەکەنێت و دەڵێت: "نیگەران مەبە، دەتوانیت لای خۆت هەڵی بگریت."

ئەوبەری شەقامەکە قەرەباڵغە و خەڵکێکی زۆر خڕبوونەتەوە. نزیکەی ٥٠ نەفەر لە پێش دوکانێك، کە ئاڵایەکی گەورەی داعشی لەسەر هەڵکراوە، خڕبوونەتەوە. دەچینە ئەو بەری شەقامەکە تا بزانین چی خەبەرە وا ئەم خەڵکە کۆبوونەتەوە. لە تەلەفزیۆنێکی شاشە مامناوەندەوە، تازەترین گرتەڤیدیۆییەکانی داعش پەخش دەکرێت، ئەو گرتەڤیدیۆییانەی کە لە کاتی شەڕکردن لە شەودا بە دووربینی شەو تۆمارکراون. مالکولم و فریدریکیش لەنێو ئەو خەڵکەدان. فریدریك گرتەی ڤیدیۆیی تۆمار دەکات. جێی سەرسووڕمانە خەڵکانێك لە ناو جەرگەی ناوچەیەکی قەیراناویدا حەزیان بە بینینی ئەم جۆرە ڤیدیۆیانە هەیە. لە نێوان ئەو هەموو پیاوە ڕیشنە یەکێکیان بە وردیی تەماشای فریدریك دەکات. بە تووڕەییەکەوە بەرەو لای فریدریك دەڕوات دەیەوێت بزانێت بۆچی فیلم لەم شوێنە دەگرێت. پاڵ بە فریدریکەوە دەنێت. لە ماوەی چەند چرکەیەکدا یەك گەلەپیاوی تووڕە فریدریك لەوێ دووردەخەنەوە. ئەو لە پشتەسەرمانیشەوە دەڵێت: "کێشە نییە." فریدریك بەدوای ئەبولوتدا دەگەڕێت. ئەبولوت لەودیوی شەقامەکەوە ڕاوەستاوە، فریدریك بە تووڕەییەکەوە چەند جارێك بانگی ئەبولوت دەکات. داعشییەکان

پێشتر وەکوو سێبەر بەسەر سەرمانەوە بوون، ئێستا کە پێویستمان پێیانە دیاریان نەماوە.

من و مالکولم هەوڵ دەدەین ئەو پیاوانەی کە دەیانەوێت یەخەی فریدریك بگرن بە ئارامی بڵاوە پێ بکەین و بە نێوانیاندا ڕێگا بۆ تێپەڕین بکەینەوە. مالکولم بە لەشولاری خۆی هەڵدەداتە ناوەند، بەڵام خۆشبەختانە ئەبولوت خێرا فریامان دەکەوێت و بۆیان ڕوون دەکاتەوە کە ئێمە ڕاستەوخۆ لە ڕێگای خەلیفەوە بانگهێشت کراوین، تا دەربارەی ڕووداو و ڕاستییەکانی دەوڵەتی ئیسلامی ڕاپۆرتێك ئامادە بکەین، دەڵێت ئەمانە ڕێگەیان پێدراوە کە هەرچییەکیان ویست فیلم و وێنەی لێ بگرن.
لە پڕێکا نیگا گرژ و تاڵەکانی کابرای ڕیشن دەگۆڕێت بۆ پێکەنینێکی دۆستانە و دەڵێت: "ببورە هاوڕێکەم، بەخێر بێن..."[84] ئێستا چیتر هیچ یەکێکیان نایەوێت بە کەسێکی خراپ ناویان بهێنرێت. وادیارە خێزانی کابرای تووڕە لە بەغدا دەژین، هەر بۆیە پێی خۆش نییە لە گرتەڤیدیۆییەکاندا دەرکەوێت و ببینرێت. ئەگەر بناسرێتەوە ئەگەری هەیە خزم و دۆستانی ڕووبەڕووی کێشە ببنەوە. ئێمە لەوە دڵنیای دەکەینەوە، کە پێویست ناکات نیگەران بێت. فریدریك گرتەڤیدیۆییەکە دەسڕێتەوە.بەهەمەحاڵ، بۆ ئێحتیات دەڕۆینە ئەوبەری شەقامەوە. هەمیشە کۆبوونەوەی خەڵك مەترسیدارە.
تووشی سێ چەکداری لاو دەبین. ناکرێت پشتگوێیان بخەین، چون دوو دانەیان ئەورووپین. یەکێکیان فینلەندی و یەکێکیان سویدی و ئەویتریان کوردە، ئەویش لە موسڵ! ئەمە سەرەتای نوکتەیەك نییە ئەمە واقعییەتی داعشە. سویدییەکە موسڵ بە "بەهەشتی من لەسەر زەوی و کاتەکانی ئێرە بە خۆشترین چرکەکانی ژیانی" وەسف دەکات.

وەختێك فریدریك دەیەوێت فلیم لە گفتوگۆکەمان بگرێت، هەر سێکیان ماسکەکەیان دەکەنە سەریان. ئەوان حەز ناکەن بناسرێنەوە، بەڵام زۆر حەز دەکەن بزانن ئێمە چۆن

84 Sorry My friend. Welcome

هاتووین بۆ ئێرە. هەر ئەوەندەی کە هۆکارەکەیان پێ دەڵێین زۆر بۆیان سەیرتر دەبێت. زیاد لە پێشتر گفتوگۆمـان لەگـەڵ دەکـەن. دەیانـەوێت بڵـێن کـە هـەموو شـتەکان لێـرە بێوێنەیە. دەیانـەوێت پـەیامی خۆیـان بگەیـەنن. چاییفرۆشـێك چاییەکمان پـێ تـەعارف دەکات، چاییەکی زۆر شیرین، بەڵام زۆر خۆش.

کاتێك دەگەینە شوێنی مانەوەمان، ئیتر کۆتایی ئەو ڕۆژەیە. کۆلیتـە هەرزانباییەکـەی ئێمـە لـەنێوان کۆمەڵگەیـەکی گەشـتیاری دایـە کـە چـەکدارەکانی داعشـیش سـوودی لـێ دەبینن. ئێرە لـە گونـدێکی بچووك دەچێت و ئێمـەش وەك ئـەوە دێینـە پـێش چاو کـە سەرگەرمی خۆشی و گەشتی هاوینەی خۆمانبین لەگەڵ داعش! هەڵبەت لەنێو کـۆلیتێکی فەقیرانەی شەقوشڕدا. دوو ژووری خەوتنی تێدایە، ژوورێکـی دانیشـتن، لەگـەڵ حـەمام و ئەم جارە ئاودەستێکی غەربیشی تێدایە.

پێش ئەوەی بچین بخەوین، ئەبوقـەتادە دەیـەوێت سـوپرایزێکمان پـێ بڵێـت. دەڵێـت ڕۆژئاواییەکان لەگەڵ داعش گفتوگۆ دەکەن. تەنانەت ئەگەری هەیـە ڕۆژئـاوا پێشـنیار بـۆ داعش بکات بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دەست لە پێشڕەویکردن هەڵبگرێت. ئەم ڕووداوە، بە قسـەی ئـەو لـە حەدیسـێکی پێغەمبـەرەوە پێشـبینیی کـراوە، تـا ئێسـتا هـەموو پێشـبینیەکانی تـری ئـەم حەدیسـە ڕوویـداوە. ئێمـە لەگـەڵ ڕۆژئـاوا دژی دوژمنـە هاوبەشـەکەمان یەکدەگرین و بـەم هۆیـەوە ڕێککەوتنامـەی ئاشـتی ئیمـزا دەکـەین. ئـەو دەڵێت هەڵبەتە ڕێککەوتنامەکەش لە ڕووی کاتەوە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دەبێت، بـەڵام ئـەو دوژمنـە هاوبەشـە چ کەسـێکە؟ ڕووسـیا؟ ئێـران؟ ئـەوەیان نـازانم، کـات هـەموو ڕاسـتییەکان یـەکلایی دەکاتـەوە. مـن پێـی دەڵـێم پێشـنیاریی گفتوگـۆ لەلایـەن ڕۆژئاواییەکانەوە پێکەنیناوییە، هـیچ یـەکێك لـە دەوڵەتـە ڕۆژئاواییـەکان لەگـەڵ داعشـدا گفتوگـۆ ناکـەن، هـیچ یـەك. ئەبوقـەتادە بەئاگایانـە بزەیـەك دەیگرێـت و دەڵێـت: "ئـەم پێشنیارە بە داعش دەدرێت. ئەوکات دەیبینیت".

## ڕۆژی پێنجەم

## چوارشەممە، ١٠ـی دیسامبەری ٢٠١٤

دەوروبەری کاتژمێر ٩ـی بەیانی، ئەبوقەتادە لە خەو بێدارمان دەکاتەوە. هەوا زۆر ساردە، بە تایبەت لە حەمام، ئاوی گەرممان نییە. بە ئاوی زۆر سارد خۆمان دەشۆین. خۆشۆردنێکی خۆش نییە، بەڵام یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی خەوەکەمان بزڕێت. قاوەڵتییەکەمان نانی بەربەری، پەنیری کیبی و چاییە. تەنها ئەبولوت لەگەڵ ئێمە قاوەڵتی دەکات. ئەبوقەتادە چووەتە کابینەیەکی تر، ئەو کابینەیەش چەکدارانی داعشی تێدایە. وادیارە لە گفتوگۆکەمان نارەحەت بووە.

لە دەرەوە نەك تەنها ساردە، بەڵکوو نمەنمە بارانیش دەبارێت. لە تەنیشتی زەوییەکەی ئێمەوە پارکێکی یاریی بۆ منداڵان هەیە. دوێنێشەو بەهۆی تاریکییەوە ئەم شوێنەمان نەبینیبوو. پێ دەچێت لە هاویندا ئێرە قەرەباڵغ بێت. بە سێ ترۆمبێل و شەش پاسەوانی چەکدارەوە، هاوڕێ لەگەڵ ئەبوقەتادە و ئەبولوت بەرەو نەخۆشخانەیەك دەکەوینە ڕێ، کە بڕیارە سەردانی بکەین. فریدریك لە کەناری شۆفێرەکە دادەنیشێت تا بە جوانی بتوانێت فیلم بگرێت. نازانرێت ڕێگە دەدەن بەوەی کە دەرگای سەرەوەی ترۆمبێلەکە لابدات و لەوێوە کامێرامانی بکات یاخود نا؟ وا دیارە ڕێگەمان پێ دەدەن. فریدریك لەسەر کورسییەکەی تەنیشتی شۆفێرەکە بە پێوە ڕادەوەستێت، جارجارە لەسەر سەقفی ترۆمبێلەکەش دادەنیشێت. جادەکان زۆر قەرەباڵغن. بە چەند شوێنێکدا تێدەپەڕین پڕە لە هاتووچۆکردنی خەڵکی و ئەو جادانە زۆر قەرەباڵغن. زۆرێك لە خەڵکی بە سەرسامییەوە تەماشامان دەکەن. پۆلیسێکی هاتووچۆی داعشیش لە پەسا بە توڕەییەوە بانگی فریدریك دەکات.

لە پێش دەرگای نەخۆشخانەکە چەکدارانی داعش پێشوازیمان لێ دەکەن. لەسەر دیواری باڵەخانەکە ژمارەیەکی زۆر وێنەی ئاڵای داعشیان کێشاوە. لە بەردەم دەرگای چوونەژوورەوەی نەخۆشخانەکە، ئاڵایەکی گەورەی داعش شۆڕبووەتەوە. هۆڵەکانی چاوەڕوانی لە نەخۆشخانەکە پڕن لە خەڵك. تەلەفزیۆنەکان خەریکن ڤیدیۆی چالاکی و کارە خێرخوازییەکانی داعش پیشان دەدەن. لەو گرتەڤیدیۆییانەدا، چەکدارانی داعش

خەریکی دابەشکردنی بووکەڵە و پێداویستی قوتابخانەن بەسەر کیژۆڵەکان و خەریکی دابەشکردنی خۆراکن بەسەر هەژار و دەسکورتەکاندا. پێشتر ئەم جۆرە ڤیدیۆییانەی داعشمان نەبینی بوو، باوەڕمان نەدەکرد کاری لەم جۆرەش ئەنجام بدەن، بەڵام وادیارە لێرەدا نایانەوێت ترس و وەحشەت لە دڵی خەڵکیدا دروست بکەن.

یەکەمین پزیشک، کە قسەی لەگەڵ دەکەین زۆر نیگەرانە لە کەمی دەرمان لە نەخۆشخانەکە، بەڵام بەداخەوە ڕازیی نابێت لەسەر ئەوەی وێنەی بگرین. کێشەی سەرەکی کەمی و نەبوونی دەرمان دەگەڕێتەوە بۆ ڕێگرییەکانی بەغدا. بە تایبەت لەو کاتەوەی کە حکومەتی بەغدا چیتر ڕێگە بە ناردنی دەرمان بۆ موسڵ نادات. هەڵبەت پێش ئەوەی داعشیش لێرە دەسەڵاتدار بێت دەستکەوتنی دەرمان لە موسڵ زۆر سەخت و دژوار بووە، بەڵام لە ئێستادا مەترسی بارودۆخەکە هاوشێوەی ئەو ڕۆژگارەیە، کە ڕۆژئاواییەکان ئابلۆقەیان خستبووە سەر سەدام حسێن. جگە لەمە، دابینکردنی ئاوی خواردنەوەش قەیرانێکی تری شارەکەیە. ئاوی بۆڕی ماڵان بۆ خواردنەوە ناشێت. وەك بڵێی ئەو لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیدا هیچ کێشەیەکی نیە، هاوکاریکردنیشیان بە کارێکی باش دەزانێت. جگە لەمە مەگەر دەتوانێ شتێکی تر بڵێت.

بەدوای پزیشکێکدا دەگەڕێین، کە ئامادە بێت لەبەردەم کامێرادا قسەمان لەگەڵ بکات، لە ناکاو چاومان بە چەکدارێکی بریندار داعش دەکەوێت. ئەو فیشەکێك بەر دەستی کەوتووە، فیشەکەکە دەستی بریندار کردووە و برینەکەشی تازەیە. پزیشکێکی لاو بە پرچێکی درێژەوە خەریکی چارەسەرکردنێتی، بەوپەڕی سەرسامییەوە ئەم پزیشکە بە ئەڵمانی قسە دەکات. ئەویش نایەوێت لەبەردەم کامێرادا چاوپێکەوتنمان لەگەڵدا بکات. ئەو لە ئەورووپاوە هاتووە و لەمە زیاتر ناتوانێت شتێکی ترمان پێ بڵێت. داوای لێ دەکەین ڕوونکردنەوەیەکی کورت لەسەر بارودۆخەکە بدات. کەمێك بیر دەکاتەوە و لە ناکاوێکدا بە بزەیەکەوە ماسکی یەکێك لە پاسەوانەکانی ئێمە لەسەر دەکات و ئامادە دەبێت بۆ ئەوەی گفتوگۆمان لەگەڵ بکات. چەکدارێکی برینداریتر لەسەر تەختەکەیەوە بەرەو لای ئێمە ڕووی وەردەگێڕێت و هەر چۆنێك بووە دەیەوێت تەوقەمان

لەگەڵ بکات. منداڵێکی بچووک لە تەنیشتییەوە وەستاوە. منداڵەکە درێسێکی یانەی ئەی، سی، میلانی پۆشیوە و کڵاوێکی داعشی لەسەر کردووە. بەلای ئێمەوە دیمەنێکی پێکەنیناوییە.

پزیشکەکە ئێمە بۆ بینینی تەواوی بەشە جیاوازەکانی نەخۆشخانەکە دەبات و نەخۆشێکی زۆرمان پێ دەناسێنێت. یەکێك لە نەخۆشەکان ناوی ئەحمەدە و خەڵکی شاری ڕومادییە. ئەو بەهۆی گوللەتۆپی دەبابەی هێزە ئێراقییەکانەوە بریندار بووە. پێی چەپی تەنها ڕانی ماوەتەوە، پێی ڕاستیشی چەندین جار شکاوە و هێندە درزی بردووە چیتر لەکار کەوتووە، بەڵام وادیارە هیچ کام لەمانە ڕێگر نین لە بەردەم ئەو. ئەو وەکوو چەکدارێك بریندار بووە و دەیەوێت دووبارە وەکوو چەکدارێك بۆ مەیدانی شەڕ بگەڕێتەوە. بۆ ئەم کارەش پێویستی بە قاچی دەستکرد هەیە و بۆ ئەو مەبەستەش چاوەڕێیە بۆ ئەوەی نۆرەی بێت. پرۆتێزەکان[85] لە دار دروستدەکرێن. من حەپەساوم دەپرسم: "تۆ جارێکی دیکەش شەڕ دەکەیت؟ بەبێ قاچیش؟" لە وەڵامدا دەڵێت: "بەویستی خوای گەورە! هەروەخت باش ببمەوە و بکەومە سەر پێ دیسان تا کۆتاهەناسەم شەڕ دەکەم، ئەگەر بکەومە سەر پێم، ئینشائەڵڵا."

ئەبومەریەم چەکدارێکی تری داعشە، ئەویش پێیەکانی بریندار بوون. تەمەنی ٣٢ ساڵە و بەهۆی هێرشە ئاسمانییەکانی هێزە ئێراقیەکانەوە بریندار بووە. ئەو دەڵێت پێشتر لە بازاڕ فرۆشیار بووە، بەڵام ئێستا شەڕ بۆ داعش دەکات، بۆ ئەوەی بەرگریی لە دینەکەی بکات. ئەو کاتەی ئێمە لەگەڵ بریندارەکان سەرقاڵی قسەکردنین، نزیکەی دە نەفەرێك دەورەیان لێداوین. ئەم بارودۆخە هەمیشە ئەنجامدانی چاوپێکەوتنەکان سەختتر دەکات، بەڵام سەرکێشی کەسانێك کە حەز دەکەن تەماشا بکەن، وەك هەمیشە زۆر زۆرە. هەربۆیە وێنەی هەر سووچێك بگرین شتێکی سەرنجڕاکێش دەردەکەوێت، وێنە و ڤیدیۆکان جوانتر و سەیرتر دەبن. زۆر حەزم کرد بە تێروتەسەلیی لەگەڵ بریندارەکاندا گفتوگۆ بکەم، بەڵام دەرفەت نەبوو.

---

٨٦- لاقی دەستکرد

دوا برینداریك، كە قسەی لەگەڵ دەكەین پیاوێكی كەمێك بەتەمەنترە، ئەو شۆفێری تەنكەرە. شەممەی ڕابردوو موشەكی فڕۆكەیەكی بێ فڕۆكەوان بە سەختی برینداری كردووە. هەموو گیانی پڕە لە برین و زام، دەموچاویشی پڕ لە برینە و چاوەكانیشی هەڵاوساویی هەیە. پارچەیەكی زۆر لە بەشەكانی سەرەوەی جەستەی دایە، بە تایبەت لە سك و پێیەكانیدا. وەك دەڵێن نزیكەی ٢٠ كەس لەم هێرشەدا بوونەتە قوربانی. بە قسەی ئەو هەموویان خەڵكی مەدەنی و بێلایەن بوون. ئەو بە نارەحەتی و بە نیگەرانییەكەوە دەڵێت، كە بۆ خۆی هیچ پەیوەندییەكیشی بە داعشەوە نییە.

دەمانەوێت لەگەڵ چەكدارێكی برینداری تونسیدا قسە بكەین، بەڵام ئەو پێی خۆش نییە قسەمان لەگەڵ بكات. یەكێك لە چەكدارە هۆڵەندییەكانی داعش لە هێرشێكدا بریندار بووە، بەڵام دەرفەتی ئەوەمان نییە وێنەی لێ بگرین. جگە لەم هۆڵەندییە، بە ڕاستی هەموویان لێرە وەكوو یەك یەكسانن. هەروەها بە فریدریك دەڵێن دەبێت ئەو دوو وێنەیەی كە لە پێش دەرگای نەخۆشخانەكە لە پیرەژنێكی هەژارت گرتووە، بسڕیتەوە.

پێش ئەوەی نەخۆشخانەكە بەجێ بهێڵین پزیشكەكە ڕووداوێكمان بۆ دەگێڕێتەوە، ئەو ڕووداوە نزیكی دوو هەفتە لەمەوبەر لە شاری موسڵ ڕوویداوە. دەڵێت فڕۆكەیەكی بێ فڕۆكەوانی ئەمریكی لە ٢٧ نۆڤەمبەر دوو ئەمبوڵانسیان كردووەتە ئامانجی مووشەكەكانیان، دواتر وەختێك پزیشكەكانی فریاكەوتن دەیانەوێت هەڵبێن دەدرێنە بەر دەستڕێژی گوللە، هەر شەش كەسەكە دەكوژرێن. ئەوانە چەكدار نەبوون، بەڵكوو كارمەندی نەخۆشخانە بوون، كە لە ڕێگادا بوون بۆ ئەوەی بریندارەكان بۆ نەخۆشخانە بهێنن.

دووبارە دەمانەوێت سواری ترۆمبێلەكە ببین، لەناكاو مارسیدسێكی – ئی[٨٦] گەورە بە ڕەنگی خۆڵەمێشیی تۆخ لە بەردەم دەرگای نەخۆشخانەكە ڕادەوەستێت. لەسەر تابلۆ ڕەشەكەی سیمبوڵی داعش نەخشێنراوە و نووسراوە: "دەوڵەتی ئیسلامیی" ئیتر داعش تابلۆی ترۆمبیلی تایبەت بە خۆی هەیە. پیاوێكی چەكدار لەنێو ترۆمبێلەكە دادەبەزێتە

---

86 E.Klasec

خوارێ. به فریدریك دەڵێت زوومی کامێراکەی ڕوو بکاتە گۆشەیەکیتر، بۆ ئەوەی سێ ئافرەتی نێو مارسیدسەکە بتوانن دابەزن. دواتر لەگەڵ ئافرەتەکان دەچێتە نێو نەخۆشخانەکەوە، بەڵام کاتێك دەگەڕێنەوە، بەهۆی هاوکاریکردن و ڕێزگرتنیانەوە. سوپاسمان دەکات.

لەم کاتەدا باران دەوەستێت، کەم کەم خۆر لەنێوان هەورەکانەوە بە دیار دەکەوێت. لە نەخۆشخانەوە بەرەو شار بە ڕێ دەکەوین، بەرەو مزگەوتێك، ئەو مزگەوتەی کە پێش چەند مانگێك ئەبوبەکر بەغدادی وتاری تێدا خوێندبوو. مزگەوتەکە بە منارەیەکی لار کە بوورجەکەی سەری زۆر بەرز نییە، زۆر بچووك دەردەکەوێت. سەرەڕای جوانکاریکردنی بە ڕەنگی سەوز، هەرگیز جوانییەکەی وەکوو مزگەوتەکانی دیکەی دنیای ئیسلامیی نییە. بەڵام گرنگییەکی زۆری هەیە. لێرە مێژوو دەنووسرێتەوە، تەنانەت ئەگەر بە کام و بە دڵی زۆرێك لە خەڵکیش نەبێت. لەسەر منارەی مزگەوتەکە ئاڵای ڕەشی داعش بە مۆری پێغەمبەر و یەکەم وشەی موسڵمانان "لا الـه الا الله" دەشەکێتەوە. ئایا خوا چۆن تەماشای کردەوەکانی داعش دەکات؟

پێچەوانەی ئەوەی بیرمان لێ کردبوویەوە ماف ئەوەمان پێ نادەن بچینە نێو مزگەوتەکەوە. من بەبێ گۆرەوی چەند مەترێك دەچمە نێو مزگەوتەکەوە، بەڵام داوام لێ دەکەن بگەڕێمەوە. ئەوە بۆ ماوەی ٥٠ ساڵ دەبێت "کە سەفەرم بۆ خاك و سەرزەمینی موسڵمانان کردووە." تا ئێستا کەسێك بۆ چوونە نێو مزگەوت ڕێگریی لێ نەکردووم، تەنانەت ئەو کاتەش کە بۆ بینینی مزگەوتی ئەقسا سەردانی ئورشەلیمم کردبوو، بەڵام لێرە لەگەڵ ئەبوقەتادەی هەڵچوو و توڕەدا ناسازێین. ئەو دەڵێت: "ڕەنگە لە شوێنێکی تر کەسێکی مورتەد ڕێگای بە تۆ دابێت بچیتە نێو مزگەوتەوە، بەڵام موسڵمانی ڕاستەقینە هەرگیز ڕێگا بە تۆ نادات پێ بخەیتە نێو مزگەوتەوە." چ گەوجییەکە!

هەر بۆیە ناچار لە پێش دەرگای مزگەوتەکە ڕادەوەستین، وەکوو پیشاندانی نارەزاییەك بە چۆکا دێین، لەوێ دەست بە دوعا دەکەین. بۆ ماوەیەکی زۆر دوعا دەکەین، زۆر بە ئارامی. هەرکەس بۆ خۆی دوعا دەکات. لەم کاتەدا یەکێك لە

پاسەوانەکانمان بە دووربینەکەوە دەچێتە نێو مزگەوتەکەوە و کامێرامانیمان بۆ دەکات. بە درێژایی ماوەی سەردانیکردنی مزگەوتەکە ئێمە تەنها سێ نەفەر بووین عیبادەتمان کرد. ئەو پیاوە داعشانەی کە لەگەڵمان بوون تەنها لە کاتە دیاریکراوەکاندا عیبادەتیان دەکرد

دواتر تەماشایەکی دەوروبەرمان دەکەین، دەبینین هەموو خەڵك سەرقاڵی ژیانی رۆژانەی خۆیانن، هەموو شتێك ئاسایی دێتە پێش چاو. رەنگە ئەگەر ئاڵا و وێنەی سەر دیوارەکانی داعش نەبووایە، نەماندەتوانی باوەڕ بەوە بکەین کە لە شارێکی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی داعشداین. بەڵام ئایا لە تەواوی حکومەتە پاوانخوازەکانی دیکەشدا، بابەتەکە هەر بەم جۆرە نییە؟ ئایا لەوێش هەمان بارودۆخی سەخت و دژوار بەسەر خەڵکیدا زاڵ نییە؟

ئەبولوت بەم شێوەیە بەرچاوڕوونیمان پێ دەدات: "تا ئەو جێگەیەی خەڵك پابەندی یاساکانی خواوەندن دەتوانن هەر کارێك بکەن یا نەکەن. خەڵکی ئێرە بۆ خۆیان ژیانێکی سادە و ئاساییان هەیە." لەم نێوەندەدا و لە کاتێکدا کە ئەوانیتر کەمتر قسەمان لەگەڵ دەکەن، ئەبولوت، کە میهرەبانترە و زۆرجاریش نوقمی خەیاڵە، بووەتە لایەنی سەرەکی گفتوگۆکانی ئێمە.

زۆرێك لە خەڵکی بە سەرسامییەوە تەماشامان دەکەن. دەڵێی ئێمە گیانەوەری سەر هەسارەیەکی ترین، بە تایبەتی کاتێك فریدریك فیلم دەگرێت. ئەوان زۆرجار پەیامنێران سەردەبڕن، چۆن ئێمە مۆڵەتی فیلم گرتنمان هەیە؟ خۆشبەختانە فەرماندە داعشەکەمان لێ دوردەکەوێتەوە. دەبینین لە تەنیشتی شەقامەکەوە منداڵێکی کوڕی چکۆلە ڕاوەستاوە و بە سەرسامییەکەوە سەیری من دەکات. بەرەو لای دەچم و بە گاڵتە وا پیشان دەدەم کە دەمەوێت لوتی هەڵکێشم، وەختێك وا پیشان دەدەم لوتیم هەڵکێشاوە، خێرا پەنجە بۆ لوتی خۆی دەبات، دەبینێت خۆشبەختانە لە جێگای خۆیدایە. خەڵکی موسڵ لەوە ئاگاداربوونەتەوە کە ئێمە چیمان دەوێت و بە نیازی چین، هەر بۆیە بە بینینی ئێمە زۆر خۆشحاڵ دەبن.

ئەو شەقامە پڕ لە دوکانەی کە ئێمە پێیدا دەڕۆین، پڕە لە خەڵك. کوڕێکی لاو بە درێسی ئێف، سی، بایرن مونیخ دەبینین. ئەو نازانێت لەبەرچی ئێمە بە بینینی ئەو هێندە خۆشحاڵ بووینە، تا دواتر تێدەگات ئێمە لە مونیخەوە هاتووین. لە پشتی درێسەکەی ژمارەی ٧ و ناوی (ڕیبێری)[87] نووسراوە. ئەو یەکێکە لە هاندەرە سەرسەختەکانی بایرمونیخ لە ناو دەوڵەتی ئیسلامی!

لەگەڵ دوو لاوی دیکە، کە پۆلیسی هاتوچۆی داعشن، قسە دەکەین. یەکێکیان تەمەنی ٢٤ ساڵە و ئەوی تریان تازە پێی ناوەتە نێو ١٥ ساڵییەوە. گەورەکەیان باسی کارو چالاکییەکانیان دەکات. ئەو دەڵێت لێرە پۆلیسی هاتوچۆ زۆر بەڕێز و خۆشەویستە. چونکە هاوکاریی خەڵك دەکات. لێی دەپرسم مەگەر ئەرکی ئێوە چییە؟ تەنها ڕێکخستنی هاتووچۆ و پەڕینەوەیە بە باشترین شێوە؟ ئەو دەڵێت: "ئێمە بۆ هاوکاریکردنی خەڵك لێرەین".

چەند هەنگاوێك ئەولاتر لە دوکانێکی ماسیفرۆشیدا کۆمەڵێك ماسی زیندوو دەبینین کە بۆ ئەوەی بە زیندوویی بمێننەوە، بەردەوام ئاویان بەسەردا دەڕێژن. ئەم ڕووداوە خەڵکی ئێراقمان وەبیردێنێتەوە، کە لە سەردەمی هاتنی جۆرج دەبلیو بۆشەوە بۆ ئێراق تا ئەمڕۆ لە هەژاری و نارەحەتیدا ژیان بەسەر دەبەن. هەندێك خەڵك دێن و ماسی زیندوو دەکڕن و دەیبەنەوە، بەڵام هەندێکیش هەر لەو شوێنە ماسییەکەیان دەسپێرن تا بۆیان پاك بکەن و دواتر لەگەڵ خۆیان بۆ ماڵەوەی دەبەن.

مەسجوف ، بریتییە لە ماسی کەپوری برژاو لە نێو فڕندا، یەکێکە لە خواردنە تایبەت و بەناوبانگەکانی شاری بەغدا. من و فریدریك بۆ یەکەمین جار و لە کەناری ڕووباری دیجلە لە ساڵی ٢٠٠٢ لەزەت و تامی ئەم خواردنە خۆشەمان چەشتبوو. ئەو دەمە ئێراق بە دەستی ئابڵۆقە ئابوورییەکانەوە دەیناڵاند، بەڵام خاوەن ڕێستورانتەکە بە بینینی ئێمە هێندە خۆشحاڵ بوو پارەی لێ وەرنەگرتین و ماسییەکەی کردە شامی میوانداریمان. جگە لە ماسی کەپور هەندێکیتر لە ماسی بچووك لێرە دەفرۆشن کە من تا

---

87 Ribery

ئێستا شتی لەم جۆرەم نەبینیوە، لە مارماسی دەچن، قڵەو و خۆڵەمێشین. ئەبولوت بە پێکەنینەوە باس لەوە دەکات کە شیعەکان حەزیان لەم جۆرە ماسیە نییە، چونکە دەڵێن کاتێك ئیمامی عەلی لە کەناری ڕووبارێك خەریکی خواپەرستی بووە ئەم ماسییە عەزێتی ئیمامی داوە و عیبادەتەکەی لێ تێکداوە، بەڵام سوننەکان ئاشقی ئەم ماسییەن. لە ئێستادا کە شیعەکان لێرە نەماون، ئێستا ئەم ماسییە زۆر لە بازاڕەکان دەفرۆشرێت و کڕیاری هەیە. پێکەنین لە قوڕگما دەگیرێت، چونکە ئەو خەڵکە شیعەیەم دێتەوە یاد کە لەم شارەدا کوژران.

چونکە زۆرمان برسییە پێشنیار دەکەین بچینە یەکێك لە ڕێستورانتە بچووکەکانی تایبەت بە برژاندنی ماسی و مەسجوف بخۆین. ئەبوقەتادە باوەڕ ناکات دەپرسێت: "دڵنیان؟" منیش دەڵێم: "تامەکەی بێوێنەیە." ئەو پاسەوانانەی کە خەڵکی ناوچەکەن لەگەڵ ئەم پێشنیارەمان هاوڕان و پێمان پیشان دەدەن کە لە چ شوێنێك باشترین و تازەترین ماسی هەیە.

دەچینە نهۆمی یەکەمی ئەو ڕێستورانتەی کە بۆیان پێشنیار کردووین. ئەگەرچی پاکترین ڕێستورانتی شارەکە نییە، بەڵام ئەگەر تامی خواردنەکەی خۆش بێت، بۆ ئێمە هیچ فەرق ناکات. خواردنەوەکان وەك هەمیشە پیپسی و ئاون. ماسییەکە زۆر جوان برژاوە و ناوەکەشی زۆر ئاودارە. جگە لە ئەبوقەتادە، خواردنەکە لای هەموومان پەسەند و خۆشە. ئەو داوای ماسییەکیتر بۆ خۆی دەکات، بەڵام ئەوەشی پێ خۆش نییە، ئەو دیسان لەم ماسییە ناخۆشەش زۆر دەخوات. بەردەوام دەمی دەسڕێت و بە جۆرێکیش لە من دەڕوانێت، دەڵێت:"پێشنیارێکی زۆر باشتان هەبوو!" ئەبوقەتادە چاوەڕوان نەبوو سەفەر لەگەڵ ئێمە هێندە سەخت و دژوار بێت و پێویستی بە ئەم هەمووە فیداکارییە هەبێت .

بۆ چوونە تەوالێت دەبوو بچووبایەم بۆ ژوورەکەی تەنیشتمان، لەوێ دوو شۆفێرەکەمان کە لە شاری ڕەققەوە لەگەڵمان هاتبوون بەبێ ماسك دەبینم، هەروەها دوو پاسەوانی خەڵکی موسڵیش لەوێن. داوای لێبوردنیان لێ دەکەم و لەسەر ڕێکردنەکەم

بەردەوام دەبم. ئێستاش چاوە هەڵۆینەکانی شۆفێرە توندوتیژە بەریتانییەکەم لە یاد ماوە، هەروەها پرچە درێژە لولەکەشی، کە تا پشت سەری درێژ بوو .

بەسەر کۆنترین پردی شارەکەدا لەسەر ڕووباری دیجلە دەپەڕینەوە، کە بە تازەیی ئەمریکییەکان گوشەی ئەو دیوی پردەکەیان کردۆتە ئامانجی هێرشەکانیان و بۆردومانیان کردووە. بەشێك لە پاشماوە وێرانەکانی ئەو بۆردومانە تا ئێستاش ماوە. ترۆمبێلێکی پۆلیس، کە بە تەواویی سووتاوە، لەو جێگایەدا دەبینرێت .

لە بنکەیەکی پۆلیس نزیك دەبینەوە. یەك – دوو دەستە چەکداری ڕەشپۆشی داعش لە پێش بنکەکە وەستاون. چەکدارەکان ئێراقین، هەروەها چەند کەسێکی بیانیشیان تێدایە. زۆر ئارام و جدیی دیارن، هەروەکوو ئەو پیاوانەی کە کارەکانیان زۆر بە جدییەوە وەردەگرن و بە شانازیشەوە ئەنجامی دەدەن. ئایا ئەمە دەوڵەتێکی نوێیە ؟

ئێمە بۆ لای بەڕێوەبەری بنکەکە دەبەن، کە پێم وانییە تەمەنی لە ٤٠ ساڵ پتر بێت. ئەو هێلەکێکی سەوزی زەیتونیی لەبەردایە و قەڵغانێکی دژەگوللەی ئەمریکایی کردووەتە بەری، هەروەها پشتێنێکی لە پشتە کە چەك و تاقمی ئەمریکایی پێدا هەڵواسیوە. کڵاوێکی ڕەشی لەسەردایە. بە ڕیشەوە لە گەنجە جامایکییەکانی نێو سوپای ئەمریکا دەچێت. دەڵێت ئامادەم وەڵامی پرسیارەکانتان بدەمەوە. فریدریك کامێرامانی گفتوگۆکەمان دەکات، ئەبولوتیش وەرگێڕان دەکات. لە ماوەی گفتوگۆکەدا ١١ پیاوی داعشی لە پشت سەرمانەوە وەستاون. بارودۆخێکی کەمێك هەستیار و سەختە. بۆ پیاوە داعشەکان هەموو شتەکان تازە دێنە پێش چاو. بۆچی ئێمە ئازادیی کارکردنمان هەیە؟ ئاخر ئەوان پێشتر پەیامنێرە ڕۆژئاواییەکانیان تەنها بە مردوویی، یان لە جلی زیندانیدا بینیبوو. یەکێك لە پیاوە داعشییەکان بە تورەییەوە لە من دەڕوانێت، قیافەی لە شەخسییەتی عەلی بابا دەچێت، کە من دێتە پێش چاوم. لەو کەسایەتییە شکۆدارە، بازوویەکی گەورە و یەك دنیا ڕیش دەبینم، هەروەها دەوری چاوەکانیشی ڕەش و مۆر بوونەتەوە. لە بەشی سەرەوەی لەشی دوو قایشی ڕەشی بەستووە، کە چەکی سووك و

تەقەمەنیی پێدا هەڵواسیوە. جۆرێك لێم دەڕوانێت وەك بڵێی حەز بكات پارچەپارچەم بكات

بەڕێوەبەری بنكەی پۆلیس بە ئاوازێكی ئارام و دڵنشینەوە باس لەوە دەكات، كە ئێستا بارودۆخ لە پارێزگای نەینەوا و ناوەندەكەی كە شاری موسڵە، بە وجودی چەكدارانی داعش ئارام و مسۆگەر و جێگیرە. پارێزگای نەینەوا بە درێژایی مێژوو تا ئێستا ئارامی لەم جۆرەی بەخۆوە نەبینیوە. دوای ساڵەهای ساڵ ئاژاوە و پشێویی لەم شارە، سەرئەنجام دووبارە ئێستا خەڵكی ئەم شارە دەتوانن بە خەیاڵی ڕاحەت لە ماڵەكانیان بێنە دەرەوە، بێ ئەوەی ترسیان لە هێرش و مردن هەبێت.

ئەگەر چی جارجارە دیاردەی دزیكردن ڕوو دەدات، بەڵام ئەمە شتێكی ئاساییە و لە تەواوی دنیا ئەم دیاردەیە ڕوو دەدات. ژمارەی دیاردەكانی دزیكردن بەرەو كەمبوونەوە دەڕوات. هەندێك جار بە درێژایی هەفتەیەك یەك دیاردەی تاوان و دزیكردن ڕوو دەدات، ئەویش بە فەزڵی خوا و پۆلیسی دەوڵەتی ئیسلامییە.

من حەز دەكەم دەربارەی بابەتی دزییەكان زیاتر بزانم، بۆیە دەپرسم: "بۆ نموونە ئەگەر دزێك دەستگیر بكەن و نرخی ئەو شتەش كە دزیویەتی لە ٤٠ دۆلار زیاتر بێت. ئایا لە دادگایەكی ئیسلامیی داداگایی دەكرێت؟ چەند دەخایەنێت تا ئەوەی دەستی دەبڕن؟"

بەڕێوەبەری پۆلیس بە زمانە عەرەبییە ئیدارییەكەی بەم جۆرە وەڵامم دەداتەوە: "پاش ئەوەی بڕیاری دەستگیركردنی دەردەچێت، ئەو كەسە دەستگیر دەكرێت و بۆ یەكێك لە بنكە پۆلیسییەكانی دەوڵەتی ئیسلامی دەگوازرێتەوە. لەوێ یەك بۆ دوو ڕۆژ زیاتر نامێنێتەوە، لە پاش ئەوە ڕەوانەی دادگای ئیسلامی دەكرێت و لەوێ دۆسییەكەی تۆمار دەكرێت، تا دادگایی بكرێت. ئەگەر بەهای شتە دزراوەكە زیاتربێ لەو ئاستەی كە بۆ دەستبڕین دیاریكراوە، ئەوا دەستی تاوانبارەكە دەبڕدرێت. بەڕێوەبەری بنكەی پۆلیس دەڵێت: لە ماوەی ئەم چەند ڕۆژەی دواییدا هیچ حاڵەتێكی دەستبڕین ڕووی نەداوە. ئەو دەستبڕینانەی كە پێشتر جێبەجێكراون بوونەتە بەربەست لە پێش

دووبارەبوونەوەی دیاردەی دزیکردن، چونکە دزیی بەهای ئەوەی نییە مرۆڤ دەستی خۆی بۆ بکاتە قوربانی."

دەربارەی بۆچوونی خەڵك سەبارەت بە پۆلیس لە بەڕێوەبەری پۆلیس دەپرسم. بەڕێوەبەری پۆلیس بەم جۆرە وەڵام دەداتەوە: "دوای چەندین ساڵ لە شەڕ و ململانێکردن لە ئێستادا خەڵکی نەینەوا نەك تەنها پشتگیریی پۆلیس دەکەن، بەڵکوو خۆشیشیان دەوێن. ئەو ڕۆژانەی کە پۆلیس لەسەر شەقامەکان نین خەڵك دڵتەنگیان دەبن. خەڵکی ئێرە چی تر تاقەتی شەڕ و ململانێ دە ساڵ پێش ئێستای نەماوە." من وا خۆم پیشان دەدەم کەمێك بە گومانم لەم مەسەلەیە، بەڵام شەوق و زەوق و پیاهەڵدانی بەڕێوەبەری پۆلیس دەربارەی هێزەکانی لە بن نایەت.

وا دیارە کوڕی زۆرێك لە خێزانەکان لە بنکەی پۆلیس کار دەکەن، هەر بۆیە پۆلیس پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەدا هەیە. بەڕێوەبەری پۆلیس دەڵێت، لە ڕژێمەکەی ڕابردوودا زۆرێك لەم گەنجانە دەرفەتی کارکردنیان پێ نەدەدرا، هەروەها پۆلیسەکانی ئەو دەمە ئیسلامی نەبوون و لەگەڵ خەڵکدا بە خراپی ڕەفتاریان دەکرد و سەرزەنشتی خەڵکیان دەکرد و تۆمەتیان بۆ خەڵك هەڵدەواسی، تەنانەت جنێو و لێدانیشیان دژی خەڵك بەکار دەهێنا. بەڵام ئەمڕۆ ئەو ڕۆژگارە تێپەڕیوە و کۆتایی پێهاتووە.

لەکاتی هاتنەدەرەوەمان لە نووسینگەکەی بەڕێوەبەر، بە پێش دوو ژووری زیندانیدا تێپەڕ دەبین، بۆ ئەوەی کەمێك لەگەڵ زیندانییەکانیشدا قسە بکەین دەوەستین. بەڕێوەبەری پۆلیس بواری ئەم کارەی پێ دابووین. لە یەکێك لە ژوورە زیندانییەکان کوڕێکی لاو دانیشتووە، کە بیست و چەند ساڵێك تەمەنییەتی. زۆر نیگەران و بێتاقەتە. تاوانەکەی ئەوەیە، کە: ئەویان لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا بینیوە و دەستگیریان کردووە، ئێستا دەبێت بەو هۆیەوە ڕۆژێك لە زینداندا بمێنێتەوە. من لێی دەپرسم: "سا خۆشەویستەکەت هێندە شۆخ و شەنگیشە یان نا؟" کوڕە لاوەکە بە بزەیەکەوە سەرێك بە نیشانەی "بەڵێ" دەلەقێنێت.

فریدریك قسەکەم پێ دەبڕێت و دەڵێت: " باوکە، بەسە ئیتر، ئەگینا کێشە و سەرێشەی زیاتری بۆ ساز دەکەی." منیش بەگوێی کوڕە ژیرەکەم دەکەم. ئایا وەك ئەوەی کە بەڕێوەبەری پۆلیس باسی کرد ئەم کوڕە لاوەکە بە ڕاستی و لە ناخی دڵەوە پۆلیسی داعشی خۆش دەوێت؟

لە ژوورێکی دیکەی زیندان پیرەپیاوێك دانیشتووە، تاوانەکەی بریتییە لەوەی کە بڕێکی زۆر لە حەبی خەو و حەبی دژەخەمۆکییان پێوە گرتووە، نزیکەی پاکەتێکی پلاستیکی بووە. ئەوان بۆ ئەوەی باوەڕیان پێ بکەین پاکەتەکەمان پێ پیشان دەدەن. یەکێك لە پاسەوانەکان بە من دەڵێت: "جگەرەشی پێ بووە! دەبێت چەند ڕۆژێك لێرە لە زیندان بمێنێتەوە پاشان ئازاد دەکرێت." من و فریدریك بە ڕاستی بۆی نیگەران دەبین، چونکە بە قیافەیدا دیارە، کە زۆر پێویستی بە حەبەکانییەتی و زۆر بە خەمباریی دێتە پێش چاو.

مەخابن ناتوانین هیچ کەسێکی مەسیحیی لە شارەکە ببینین، چونکە هەموویان لە موسڵ هەڵاتوون. بە قسەی داعشەکان مەسیحییەکان بە بەستنی ڕێککەوتننامەیەك لەگەڵ خەلیفەی داعش و بە دانی سەرانەکانیان، دەیانتوانی ئاسایشی ژیانیان مسۆگەر بکەن و لێرە بمێننەوە. بەڵام سێ پێشەوای مەسیحییەکان بڕیارێکی دیکەیان داوە. ئەوان دەڵێن ئەو سێ کەسە لەلایەن خەلیفەی دەوڵەتی ئیسلامییەوە بانگهێشت کراون، بەڵام ئەوان لەسەری وادەکەیان ئامادە نابن و لە ماوەی ٣ ڕۆژدا لەگەڵ تەواوی مەسیحییەکانی موسڵدا هەڵدێن. وەك ئاشکرایە ١٢٠٠٠٠ کەسی مەسیحی موسڵیان بە جێ هێشتووە، چونکە ئەوان حەزیان نەکردووە لەژێر سێبەری دەوڵەتی ئیسلامیدا بژین. ئێمەش لە میانەی سەفەرەکەمان لە مانگی ئۆگۆستی ئەمساڵدا لە ئۆردوگاکانی هەولێر چاومان بە چەند کەسێکیان کەوت و لەوێ سەردانمان کردن .

وەختێك لە بینای پۆلیس دێینە دەرێ ئەبولوت فریدریك دەباتە گۆشەیەکەوە و کەمێك بە شپرزەییەوە بە فریدریك دەڵێت، دەتوانی ڕێگە بە باوکت نەدەیت هێندە سەرکێشیی و فزوڵی نەکات؟، چونکە زۆرێك لە کەسایەتییە باڵاکانی نێو داعش بەم کارە

ڕانەهاتوون. ئەوان پرسیار و وەڵامە بەڕێزانەکەی ئێمە ناودەنێن فزوڵی. فریدریک پەرچەکردارێکی ساردی دەبێت و بە ئەبولوت دەڵێت: ئێوە دەبێ لەگەڵ ئەم جۆرە کارانەدا ڕابێن، ئێمە نەهاتووین بۆ ئێرە تا یەکتر بناسین و چا بخۆینەوە، ئێمە سەفەرمان کردووە بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوە بکەین و وەڵامی پرسیارەکانمان بدۆزینەوە. فریدریک لەوە زیاتر باسی جیاوازیی بۆچوونەکانمان ناکات.

گەشتێکیتر دەست پێ دەکەین، بەڵام ئەم جارە بەرەو جادەیەکی گەورە، کە چەند کیلۆمەترێك لە بنکەی پۆلیسەوە دوورە. لەوێ هێزێکی گەورەتری پۆلیس سەرقاڵی کاروچالاکی خۆیانن. لەوێ دوو دەستە پۆلیسی هاتوچۆ بە کڵاشینکۆفەوە ترۆمبێلەکان و موسافیرەکان دەپشکنن. زۆر جار بە پەنجە ئاماژە بە ڕێبوارەکان دەدەن بۆ پەڕینەوە. ئەبولوت دەڵێت لێرە بابەتەکە بە جۆرێکە، دەبێت ئێمە زیاد لە پێویست خۆمان دەربخەین، چونکە دەمانەوێت خەڵك بە چاوی خۆی ببینێت، کە ئەمڕۆ لێرە نەزم و یاسا بەرقەرارە. بەڕێوەبەری پۆلیس دووپاتی دەکاتەوە کە هێزەکانی لەم بارودۆخەشدا دەبێت بە ڕێزەوە لەگەڵ خەڵك ڕەفتار بکەن. وادیارە بەو جۆرەش ڕەفتار دەکەن.

لە بەشی گواستنەوە ترێلەیەکی بارهەڵگر و ترۆمبێلێکی ئێم، جی، (MG3)ی ئەڵمانی دەبینین. چادرێکی پاراستن وەکوو ڕووپۆشێك بەسەر بارەکەیدا دراوە. بە قسەی چەکدارێکی داعش، کە بەرپرسی ئەو ترۆمبێلەیە، ئێم، جی، ٣، لەو جۆرە تەقەمەنیانەیە کە ئەڵمانییەکان بۆ پێشمەرگەیان هەناردووە. ئەو بۆ خۆی لە شەڕدا ئەو ترۆمبێلەی بە غەنیمەت گرتووە. بەم جۆرە چەکە ئەڵمانییەکان دەکەونە دەستی ئەوکەسانەی کە پارەی زیاتر دەدەن. چەکدارەکان بە پێکەنینەوە لێمان دەپرسن، بە نیازنین چەکی زیاتر بۆ کوردەکان بنێرن، ئەو شتانەی کە بە غەنیمەت دەست ناکەون لە بازاڕی ڕەشەوە سەر دەردێنن و لەوێوە پەیدای دەکەین.

لە ڕێگای گەڕانەوەماندا بەرەو شوێنی مانەوەمان، دەبینین شۆفێرە سەروچاوداپۆشراوەکەمان زۆر کەیفی ساز نییە، دیارە لە شتێك ناڕەحەت بووە. دووبارە ڕەفتاری لەگەڵمان تێك چووە و شەڕەنگێز بووە، بێگومان شتێك بووەتە هۆی ئەم تووڕەبوونەی، وادیارە لەوە تووڕەیە لە کاتی نانخواردندا من لە تەوالێت بە ڕێککەوت بەبێ

ماسك و ڕووپۆش ئەوم بینیوە، بەڵام من چارەیەکم نەبوو، چونکە ئەو لەسەر ڕێگای من وەستابوو. جگە لەمەش من تەنها بۆ چەند ساتێك و بە نیگایەکی سەرپێیەوە ئەوم بینی بوو. بۆچی ئەم بابەتە بۆ ئەوان هێندە هەستیار و گرنگە؟ تۆ بڵێی گومانە نهێنییەکەی من و فریدریك ڕاست بێت؟

پاش گەیشتنمان ڕاوەستاین و شۆفێرەکەمان، کە ئیتر سەروچاوی داپۆشیوەتەوە، زۆر بە تووڕەییەکەوە بە سەری ئاماژە بە فریدریك دەدات کە دوای بکەوێت. هەردووکیان چەند هەنگاوێك دەچنە پێشەوە و دواتر ڕادەوەستن. شۆفێرەکە لە کاتێکدا کەمێك پشتی چەماندووەتەوە، بە چاوێکی نیوەکراوەوە، بە نیگایەکی هەڕەشەئاسا و توندەوە تەماشای فریدریك دەکات و بە ئاوازێکی هەڕەشەئاساوە بە فریدریك دەڵێت: "دەمەوێت ئێستا شتێکت پێ بڵێم، تۆش ئەو شتە دەکەیت کە من پێت دەڵێم بیکە، لێم تێدەگەیت؟

"فردریك: بەڵێ" زۆر باشە، نامەوێ سەبارەت بەمە مشتومڕت لەگەڵ بکەم. ئەو کارەی من دەیڵێم ئەنجامی دەدەیت... کامێراکەت و تەواوی هارد و میمۆرییەکانت دێنی و بە منی دەدەیت. منیش سەیری هەموویان دەکەم و کۆپییەکیان لێ دەگرم و بۆ سبەینێ بەیانی زوو پێتانی دەدەمەوە، تێگەیشتی؟"

فریدریك هەوڵ دەدات بۆی ڕوونبکاتەوە کە ڕازیی نییە لەسەر ئەم کارە و دیسانەوە پێویستیان بە یادگەی بنەڕەتیی کامێراکە هەیە. هەروەها دەڵێت پێشتر بڕیارمان بەم جۆرە نەبووە، کە داعش کۆپی کارەکانمان لێ وەربگرێت، بە هیچ جۆرێك کاری لەم جۆرە قابیلی قبوڵ نییە.

کەمێك پاش ئەوە شۆفێرەکەمان بە قسەی فریدریك زۆر نارەحەت دەبێت بە جۆرێك وەختە بتەقێتەوە. لە تووڕەییدا هەموو گیانی دەلەرزێت، نازانم بۆچی. فریدریك وەختێك دەبینێت کێشەکە خەریکە قوڵتر ببێ و خەریکە دەمەقاڵێ هەڵبگیرسێ، کامێراکەی دێنێت و بە شۆفێرە بەدرەفتارەکەمانی دەدات.

بە سەرسووڕمانەوە دەگەڕێنەوە بۆ نێو کابینەکەمان. کەمێك پێش گەڕانەوەمان بۆ نێو کابینەکەمان دەمەقاڵێیەك لە نێوان من و ئەبوقەتادەدا هەڵدەگیرسێت، چونکە من

ڕەخنە لە ڕەفتاری شۆفێرەکەمان دەگرم و ناڕەزایی خۆم دەردەبڕم. لەناکاو ئەبوقەتادە دەنگی بەرز دەکاتەوە و دەڵێت: "بۆ ئێمە هیچ گرنگ نییە کە لە وڵاتە ئیسلامییەکانیتر چۆن هەڵسوکەوتت لەگەڵدا دەکەن و چۆن پێشوازیتان لێ دەکەن. بە گۆڕی بابی هەموویانەوە، ئەوان قونتان ماچ دەکەن و ک... دەلێسنەوە، ئێمە ئەو کارە ناکەین!" جوێنم پێدەدات و مشتی بەرەو ڕووی دەموچاوم درێژ دەکات و بە دەستەکەیتری بە سوکایەتیکردنێکەوە بە توندیی بە شانمدا دەکێشێت و دەڵێت: "تۆ قەت قایل نابیت. بەردەوام و لەپەسا پرسیار دەکەیت. لەسەر هەموو ئەو شتانەی کە ئێمە دەیکەین پرسیار دەکەیت، دەتەوێ توێکڵی هەموو شتەکان بگریتەوە و ناوکی هەموو مەسەلەکان دەربێنی. تۆ لێرە بووی بە مووی لووتی هەندێك کەس، دەتەوێ زانیارییان لەبارەوە بزانیت، ئێمە شتی لەم جۆرە قبوڵ ناکەین." دەڵێت: "مێشك و ئەعسابی فەرماندەکانی داعشمانت تێکوپێك داوە، هەروەها هی ئێمەشت تێکداوە."

ئەبوقەتادە لەجێی ئەوەی بێتە نێو کابینەکەی ئێمەوە، بە تووڕەییەوە دەچێتە لای چەکدارەکانی داعش لەنێو کابینەیەکی تر و من و فریدریك و مالکولم بۆ چەند کاتژمێرێك بە تەنها بەجێ دەهێڵێت، کابینەکەی تر لە فەرماندە و پاسەوانەکانی ئێمە و چەکدارانی داعش پڕ دەبێت. ئێستا ئەوان سەبارەت بە چی قسە دەکەن؟ سەبارەت بە بەڵێننامەکەمان؟ ئەم هەموو توندڕەوییە لە کوێوە سەرچاوە دەگرێ؟ هەستێکی زۆر خراپم هەیە.

پاش چەند کاتژمێرێك ئەبولوت دێتە لای ئێمە و پێی دەڵێم کە شۆفێرەکەمان چارەی زۆر گرژە و قسەی لەگەڵ ناکرێت، لەبەر ئەوەی لە کاتی نانخواردن بە ڕێککەوت و بەبێ ماسك و ڕووپۆش بۆ ساتێك چاوم پێی کەوتووە، بەڵام بۆچی بابەتەکە تا ئەم ڕادەیە هەستیارە؟ خۆ من وێنەم لێ نەگرتووە. من هەرگیز ڕەفتار و پەرچەکرداری لەم جۆرەم نەبینیوە و هەرگیز شتی وام ئەزموون نەکردووە.

ئەبولوت دەڵێت: "هەندێك لە کەسایەتییەکانی ئێرە حەز ناکەن بناسرێنەوە، تۆ دەبێت ڕێز لەم بابەتە بگریت." دیسان دەڵێت: "جگە لەمەش، ڕەنگە ئێستا تۆ دیدێکی ڕەخنەگرانەترت بۆ داعش هەبێت، ئەگەری هەیە کە بەڵێننامەکەی ئێمە، کە لەبەر

ڕۆشنایی قورئان بە ئێوەمان داوە، بخەیتە ژێر پرسیارەوە. زۆرێك لە مرۆڤەكانی ئێرە لەگەڵ ئەم شتە كێشەیان هەیە و بەم شتە ڕازیی نابن. لە دەوڵەتی ئیسلامیدا هیچ كەسێك مافی ئەوەی نییە بەم جۆرە قسەتان لەگەڵ بكات".

ئێستا دیسان فەزاكە گرژ و ئاڵۆزە و زۆر جێگەی نیگەرانییە. دووبارە ئەوان ئارام دەبنەوە و بڕیارە سبەینێ ڕۆژێكی نوێ دەست پێ بكەین. لە ڕاستیدا زۆرجار من بەو جۆرە بیر دەكەمەوە. هەڵبەتە بەگوێرەی ئەو گومانەی فریدریك گوتی، ئەگەر سەری خۆمان بە بڕین نەبەین، بە ڕاستی هونەرمان كردووە. ئەسڵەن بۆچی ئەم هەموو شڵەژانە دروست بوو؟ تەنها لەبەر ئەوەی من چەند چركەیەك شۆفێرەكەم بەبێ ماسك بینیبوو؟ مەسەلەكە چییە؟ ئەگەر فریدریك ڕاست بكات ئەو شۆفێرە خودی جۆن جیهادیی سەربڕ بێت، كەواتە ئێمە ڕووبەڕووی كێشەیەكی گەورە بووینەتەوە .

**ڕۆژی شەشەم**

**پێنجشەممە، ١١ـی دیسامبەری ٢٠١٤**

هاوشێوەی دوێنێ، دیسان ئەبولوت لەگەڵمان قاوەڵتی دەخوات. خوانەكەمان نانی بەربەری و پەنیری كیبییە. لەو پەڕی جوانیدا خۆر پرشنگی داوەتەوە و دەدرەوشێتەوە. ئەبوقەتادە بە قیافەیەكی دیاریكراوی نارێكوپێكەوە دێتە ژوورەوە و دەڵێت: "ئەگەری هەیە ڕووبەڕووی كێشە ببینەوە، فڕۆكەكان بە ئاسماندا دەسووڕێنەوە، ئەمڕۆ دەبێت زۆرتر ئاگاداری خۆمان بین. دەبێت چاوەڕوان بین بزانم دەتوانین بەرنامەكەمان دەست پێ بكەین یاخود نا، من زۆر دڵنیا نیم." بێ دەربڕینی بچووكترین هەست دەڵێت: "دە خولەك مۆڵەتتان هەیە!" پاشان بە جێمان دەهێڵێت.

یەكێك لە شۆفێرەكانمان كوڕە نۆ ساڵەكەی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، كەواتە بارودۆخەكە هێندە مەترسیداریش نییە. یەكەمین جێگا كە دەبێت بەسەری بكەینەوە بریتییە لە دادگای موسڵ. دەمەوێت بزانم دەسەڵاتی دادوەریی تا چەند لێرە سەروەرە و تا چەند دادگا هەژمونی بەسەر خەڵكەوە هەیە. لەبەردەم باڵەخانەیەكی شووشەیی شیندا پێچ دەكەینەوە و پێش ئەوەی لە پاركینگێك ڕاوەستین، بە دوو خاڵی پشكنیندا تێپەڕ دەبین.

لەنێو باڵەخانەی دادگادا خەڵکێکی زۆر وەستاوە، لەپێش هۆڵی چوونەژوورەوەوە هێندە قەرەباڵغە دەرزی هەڵبدەیت بەر زەوی ناکەوێت. لە سەرەوەی بەشی پرسگە ئاڵایەکی گەورەی داعش شۆڕ کراوەتەوە. زیاد لە ٥٠ کەس دانیشتوون و ڕاوەستاون، چاوەڕێن تا سرەیان بێت.

بەسەر قاڵدرمەیەکی مارپێچیی گەورەدا، کە ڕەنگیان ئاڵتونییە، تێدەپەڕین و دەچینە نهۆمی یەکەمی دادگاکە و لەوێ لەگەڵ دادوەرێك، کە بەرپرسە لە کاروباری یاسایی، گفتوگۆ دەکەین. ئەویش جلێکی ڕەشی پۆشیوە و ڕیشێکی ڕەش و درێژی داناوە. لەبەر ئەوەی دواتر شۆفێرەکەمان ئەم گفتوگۆ و چاوپێکەوتنە لەنێو کامێراکەی فریدریك دەسڕێتەوە، لێرەدا بەشێك لەو گفتوگۆیە لە ڕێگەی دەستنووسەکانی مالکولمەوە دەگێڕمەوە:

o یورگن تۆدنهۆفەر: دادوەرییەکانی ئێوە زیاتر لە چی بوارێکدایە؟

• یاسای سزاکان، یاسا خێزانییەکان، کاروباری ئایینی و میراتگریی.

o ئایا ژمارەی ئەو کەسانەی سەردانتان دەکەن زۆرن؟

• بەڵێ لە ئێستادا ٣٠ بۆ ٤٠ دۆسییەم بۆ لێکۆڵینەوە لەبەردەست دایە. ئەگەر پێویست بکات دادگای دووەمیش هاوکارییمان دەکات.

o تۆ لەکوێ بەشی یاسات خوێندووە؟

• لەنێو مزگەوتە جیاجیاکاندا.

o لە مزگەوت؟

• بەڵێ، من پێش ئەوەی داعش بێتە ئەم شارە وتاربێژی مزگەوت بووم.

o ئایا ئەو دادوەرانەی کە پێش فەرمانڕەوایی داعش لێرەبوونە، ئێستاش لێرە ماون؟

• نەخێر، هەموویان کوژراون. ئەو دادوەرانە یاسای مرۆڤەکانیان لە پێش یاسای خواوە دانابوو، هەروەها زۆرێکیشیان گەندەڵ و بەرتیلخۆر بوون. لە ئێستادا خەڵکی ئێرە زۆر لە ئێمە و لە یاسا نوێییەکانی دەوڵەتی ئیسلامی ڕازین. ئێمە لێرە تەنها یاسا

ئیسلامییەکان جێبەجێ دەکەین. ئێمە بەپێی ڕاوبۆچوون شیکردنەوە بۆ کێشەکان ناکەین، بەڵکوو تەنها لەسەر بنەمای ئەو شتانەی لە شەریعەتی ئیسلامیدا نووسراوە دادوەریی دەکەین. هەر بۆیە دۆسییەکان بە خێرایی یەکلایی دەکرێنەوە و تەواو دەبن.

- o ئایا لە ڕۆژانی داهاتوودا حوکمی سەربڕین یا شەلاق لێدان یاخود دەستبڕین لە لیستی کارەکانتاندا هەیە؟

- • نەخێر.

- o کام دەستە دەبڕدرێت؟ ئایا لەم بارەیەوە یاسایەك هەیە؟

- • ئەو دەستەی دزییەکەی پێ ئەنجام دراوە.

- o ئەم شتە ڕوودەدات؟

- • من بۆ خۆم تەنها دوو جار فەرمانی دەستبڕینم دەرکردووە. لە ماوەی چوار مانگی ڕابردوودا لە هەموو پارێزگاکەدا هیچ حاڵەتێکی دەستبڕین ڕووی نەداوە. هەروەها تەنها یەك دیاردەی داوێنپیسیی ڕوویداوە، ئەویش تاوانبارەکە بەردباران کراوە. باوەڕ بکەن ئەم جۆرە سزادانانە چاوی خەڵکی دەترسێنن. جگە لەمە چیتر بەرتیلخۆریی دادوەرەکانیش نەماوە، بۆیە ئێستا خەڵك زیاتر بیر لەوە دەکەنەوە، کە تاوان بکەن یاخود نا. پێشتر تاوانبار بە ئەندازەی تاوانەکەی پارەی دەدا و ڕزگاری دەبوو، بەڵام ئێستا ناتوانن ئەو کارە بکەن. یاسا بۆ هەموو کەسێك یەکسانە.

ئەبوقەتادە پێمان دەڵێت ئەگەر حەز بکەن لە ڕێوڕەسمی سەربڕینی تاوانبارێکدا ئامادەبن، ئەوە بۆ خۆم هەموو شتەکان ڕێك دەخەم. تا حەز بکەن لە نێو زیندانەکانماندا زیندانی لەم جۆرەمان هەیە. ئەو دەڵێت: "بەس پێویستە ئێوە پێمان بڵێن ڕازین و کێشەمان نییە. ئەوکات بۆ خۆم ئەو کارەتان بۆ دەکەم. کێتان بوێت سەری دەبڕم؟ کوردێك یاخود شیعەیەك؟" ئەبوقەتادە لەگەڵ ئەوەی خەریکە پێشنیاریی سەربڕین بە ئێمە دەدات، پێدەکەنێت. ئێمە بە توندی پێشنیارەکەی ڕەت دەکەینەوە. فریدریك، کە تەواو حەپەساوە، دەڵێت، چ ڕێبازێکی بێڕەحمانەیە! پاشان دەچینە دەرەوە.

دەچینە سەربازگەیەکی کۆنی سوپای ئێراقییەکان، ئەم سەربازگەیە لە ئێستادا لەژێر کۆنترۆڵی داعش دایە. وەك خۆیان دەڵێن موسڵ لە ڕێگەی ئەم سەربازگەیەوە کۆنترۆڵ کراوە. لەم سەربازگەیە بە هەزاران چەکداری سوپای ئێراقییەکان لە ترسی داعش هەڵاتوون. هەموو شتەکانیان بەجێ هێشتوە و ڕایان کردووە. شۆفێرە مەحەلییەکەمان دڵی بۆیان ناسووتێ، چونکە ئەویان ئازار و شکەنجە داوە. یەك هەفتەی تەواو کارەبایان لێ داوە و لە ئێستادا بەهۆی ئەو شکەنجەیەوە برینێکی زۆر لەسەر پێیەکانی دروست بووە. پاشان چەند مانگێکی زۆر لە زیندانی فرۆکەخانەدا زیندانی بووە، تا ئەو کاتەی توانیویەتی بە پێدانی بڕی ٥ هەزار دۆلاری ئەمریکی خۆی ئازاد بکات.

لە پێش دەرگای هاتنەژوورەوەی سەربازگە کۆنەکە چاوەڕوانی ترۆمبێلێکی دیکە دەکەین. لەوێ فڕۆکەیەك، کە بە ئاسماندا دەسووڕێتەوە، دەبینین. شۆفێرەکەمان دەڵێت: "ئەمریکییەکانە!"، بەڵام بە ڕای ئەو ئەم فڕینە بە مەبەستی کۆکردنەوەی زانیارییە لەسەر ناوچەکە. بە چی ئارامییەك! لە گۆڕەپانەکە هەڵدێین، لە ئێستادا ئەم سەربازگەیە بووەتە گۆڕەپانی مەشقی هێزەکانی داعش، بووەتە زیندان، کۆگای هەڵگرتنی چەك و تەقەمەنییەکانی داعش. گۆڕەپانێکی زۆر بەرفراوان و گەورەیە. لە گۆڕستانی تانکەکان دەوەستین، لە گۆڕستانی تانك دەچێت. نزیکەی ٥٠ بۆ ١٠٠ تانکی تێدایە، تانکی کۆن و تانکی نوێی ڕووسی و ئەمریکی. کەمێك خەیاڵم لای خۆم نامێنێت، دیمەنێکی زۆر کارەساتاوییە. لەسەر یەکێك لە تانکەکان نووسرابوو: بمبوورە !

وەك ئاشکرایە بڕیارە تەماشای سەربازەکانی داعش لە کاتی مەشق و ڕاهێناندا بکەین. هەروەها ئەگەری هەیە زیندانییەکانیش ببینین.

بەڵام لەناکاو گوێمان لە دەنگی فڕۆکەکانی سەر سەرمان دەبێت. دەڵێی تیمە ڕەوانەکراوەکەی ئێمە بۆ ئەمریکییەکان زۆر گرنگ بووە. بارودۆخ کەمێك ئاڵۆز دەبێ، دەبێت بەرنامەکەمان بە ناتەواویی بەجێ بهێڵین. بۆ ئەوەی فڕۆکەکان نەتوانن هێرش بکەنە سەرمان، بە ڕێگای جیاجیادا تێپەڕ دەبین. بارودۆخێکی زۆر ترسناك و ئاڵۆزە. چەکدارەکان بەردەوام بە دەزگای بێسیم بروسکە بەیەکتر دەدەن. شۆفێرەکەمان بە

توندیی پێ بە بەنزیندا دەنێت. لە کاتی تێپەڕبوون دەرگای زیندانە شارەوەکانمان پێ پیشان دەدەن. بە تەنیشتی گۆڕەپانێکی فوتبۆڵ و دواتر بەلای چەند کەلاەیەکدا تێپەڕ دەبین. لەم شوێنە شتێکی وا نەماوەتەوە، هەمووی وێران بووە.

دووبارە دەگەینە بەر دەرگای هاتنەژوورەوەی سەربازگەکە. یەک دەستە پیاوی ڕەشپۆش و چەند منداڵێکی کڵاوسوور لەوێ وەستاون، هەموو چەکدارن و چەکی جۆراوجۆریشیان پێیە، ئێم جی، ١٦ـی ئەمریکی و کڵاشینکۆڤ ڕووسی. هەموویان ئەندامی یەکەیەکی تایبەتین لە پۆلیس. ئەو کاتەی لەگەڵیان خەریکی قسەکردن بووین پیاوێك کە جلێکی جیاوازی لەبەردابوو چەند جارێك شان لە فریدریك دەدات، فریدریکیش پاڵێکی پێوە دەنێت. ئەبولوت بە زەحمەت دەتوانێت ناوبژیی بکات. وا دیارە زۆرینەی چەکدارەکان لەژێر فشارێکی زۆردان، بە ئاشکرا کاریگەریی پڕوپاگەندەکانی داعش لە دژی ڕۆژئاوا لێرە دەبینرێ و تێبینیی دەکرێت. سێ ئەندامی دیکەی یەکە پۆلیسییەکە کە تەمەنیان لەنێوان دوازدە بۆ سیانزە ساڵاندایە، باس لەوە دەکەن کە لە شەڕەکاندا بەشدارییان کردووە، بەڵام لە بەرانبەر بەشداریکردن و کاری ڕۆژانەیان هیچ پاداشت و مووچەیەکیشیان وەرنەگرتووە. بە بۆچوونی ئەوان ئەم کارە مایەی سەرفرازیی ئەوانە. دوو کەسیان جگە لەم ئیشە خەریکن دەخوێنن و بۆ قوتابخانەش دەچن. ناتوانین لەمە زیاتر درێژە بە گفتوگۆکەمان بدەین، چونکە فڕۆکەکان هێشتانێك بە ئاسماندا دەسووڕێنەوە. پۆلیسەکان لەپەسا بە ئێمە دەڵێن ئەوان ترسیان لە فڕۆکەکان نییە، ئەوان تەنها لە خوا دەترسن و بە وتنی ئەم ڕستەیە: "ئێمە ئۆباما لەماڵەکەی خۆیدا دەبینینەوە." خوا حافیزیمان لێ دەکەن.

بەرەو لای سەربازگەیەکیتر بەڕێ دەکەوین. لە پێش ئەم سەربازگەیە هویتزەرەرێکی[88] ئەمریکی کە ڕەنگێکی ئاڵتونی لێ دراوە، ڕاوەستاوە. لەسەرەوەی ئاڵایەکی گەورەی داعش هەڵکراوە. ئێمە پیادە دەبین و ئەوانیش بە گەرمیی پێشوازیمان لێ دەکەن. یەکێك لە چەکدارەکان هاوشێوەی جۆرج کیلینییە. لەسەر پۆشاکەکەی

---

٨٩ – جۆرێك کەرەستەی سەربازییە تۆپ و هاوەنیش دەهاوێژێت.

هێلەکێکی سەوزی پۆشیوە، کە لەسەر شانەکانی بە گەورەیی نووسراوە یو، ئێس . ئەم چەکدارە بەوپەڕی سەرسامییەوە ئەم پۆشاکەی (کە بە نیشانەی فەرمیی وڵاتی ئەمریکا ڕازاوەتەوە)[89] بە شانازییەوە پۆشیوە. وەك دیارە زۆرینەی سەربازەکانی ئێرە چەکدارن و چەکی ئێم، جی، ١٦یان پێیە.

لە پێش هویتزەرەکە گفتوگۆیەکی کورت لەگەل یەکێك لە چەکدارەکان ئەنجام دەدەم:

- o یورگن تۆدنهۆفەر: خەڵکی کوێیت؟
- • خەڵکی میسرم.
- o لە سەردەمی ڕاپەڕینی میسردا لەکوێ بوویت؟
- • لە مەککە سەرقاڵی کارکردن بووم.
- o ڕاتان لەسەر دەوڵەتی ئیسلامی چییە؟
- • پێغەمبەر بە دینی خوا ڕەوانە کرا. ئەو ئەم دینەی لە ڕێگەی جیهادەوە پەرەپێدا، نەوەك لە ڕێگای هەڵبژاردن و ڕاوێژەوە، کە تێیدا خەڵکانێك بۆچوون و دەنگی خۆیان ڕابگەیەنن لەسەر ئەوەی هاوڕای ئایینی ئیسلامن یا خود نا. هەڵبژاردن بە مانای بێئیمانی و شەڕکردن دێت لەگەڵ خوا و پێغەمبەردا.
- o هەر لەم پێناوەدایە شەڕ بۆ دەوڵەتی ئیسلامی دەکەیت؟
- • بەڵێ، لەبەر ئەوەی چەکدارانی داعش باوەڕیان وایە، کە پەروەردگاریان تەنها(الله)یە. ئەوان بەرین لە هەر کەسێك، کە دژی خوا و پێغەمبەرەکەی بجەنگێت.

یەکێك لە چەکدارەکان کە بە سەرنجەوە تەماشای گفتوگۆکەمان دەکات، بە لوتبەرزییەکەوە تفەنگە قەناسەکەی، کە قەناسێکی ئەمریکییە، دەیهێنێت و بە منی پیشان دەدات. لەنێو دووربینی قەناسەکەیەوە ٥٠٠ مەتری ئەولاتر دەبینم، کە یەك پارچە

---

89 US (United State)

وێرانەیە! بە ڕاستی قەناسەکەی دید و نیشانێکی نایابی هەیە. لێرەوە دەتوانیت کەوچکی دەستی کەسێك بە فیشەك بپێکیت.

دەچینە ڕێستورانت. خەریکی خواردنی کەباب و برنج و نانین، ئەبولوت قسە لەسەر ئەوە دەکات، کە پێی وانییە داعش شکست بهێنێت. ئەو بۆ خۆی هەموو پارە و سامانی خۆی بەجێ هێشتووە و خێزانەکەشی وێڵ کردووە، لە پێناو ئەوەی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بمرێت. پاڵنەر و ئەنگێزەی بەم ڕادەیە بەهێزە. هەموویان لێرە ئامادەی ئەوەن گیانی خۆیان بەخت بکەن. "ئێمە بە پشتوێنی خۆکوژیی و هێلەکی پڕ لە تەقینەوەوە دەچینە مەیدانەکانی جەنگ. ئێوە ئەو کارە ناکەن". هیواداره بەمزووانە ڕووبەڕووی دوژمنی ڕەسەنی خۆیان ببوەستێتەوە، ڕووبەڕووی ئەمریکییەکان. ئەو دەڵێت: "ئێمە لەسەر زۆرێك لە نەهامەتییەکانی ئەوان ئارامان گرتووە. لە زیندانەکانی ئەبوغرێب، ئەفغانستان، گوانتانامۆ و ئێرە."

ئاشکرایە ئۆباماش داماوە. ئەو تەنها خوازیاری ئەوەیە میللەتەکەی ئارام بکاتەوە. ئەو هێرشە ئاسمانیانەی کە ئەمریکییەکان ئەنجامی دەدەن و بە زۆریش خەڵکی بێلایەن دەکەنە قوربانی، ڕەنگە هەر لەو پێناوەدابێت کە دەنگە نارازییەکانی ناوخۆی ئەمریکا ڕازیی بکات. هەموو جارێك خەڵکی بێتاوان نامەردانە دەبنە قوربانی، بەڵام ئەم هێرشانە دەبنە مایەی ئەوەی ڕێکخراوی داعش لای خەڵکی زۆرتر خۆشەویست بێت، هەروەها ئەو بۆردومانانە لە ئاییندەیەکی نزیکدا دەبێتە پاڵنەرێکی نوێ بۆ ڕووبەڕووبونەوەی بەهێزتری داعش لەگەڵ ئەمریکییەکان.

دیسان دەربارەی جۆن کانتلی پەیامنێری بەریتانی پرسیار لە ئەبولوت دەکەم. ئەبولوت دەڵێت بیستومە ئەو ئیتر لەبەر قاپی پەروەردگاردا دەپاڕێتەوە. هەروەك چۆن خوا بڕیاری داوە لە ڕۆژێکدا پێنج جار بپاڕێنەوە. ئەگەر ئەم قسەیە ڕاستبێت، ئەوە ئیتر ئەو بە بەندەیەك هەژمار دەکرێت و بە زیندانی لەقەڵەم نادرێت. چۆن دەکرێت هاوکاریی ئەم پیاوە بکرێت؟

فریدریك ڕۆژ لە دوای ڕۆژ نیگەرانتر دەبێت، چونکە ناتوانین چیتر پەیوەندی بە خێزانی خۆمان و خێزانی مالکولمەوە بکەین. فریدریك پێشتر بەڵێنی بەوان دابوو، کە دواتر بەگوێرەی پێویست هەواڵیان پێ دەدات و ئاگاداریان دەکاتەوە، بەڵام ئەوە هەفتەیەکیش بەسەر دوا ئیمەیڵی فریدریکدا تێپەڕ دەبێت. فیردی دەزانێت تا دێت خێزانەکەمان نیگەرانتر دەبن. لە چەند ڕۆژی ڕابردوودا بەردەوام پاسەوانەکانمان بۆ چوونە کافی نێت بەهانەیان دەهێنایەوە، بەڵام ئێستا ئەبوقەتادە دەڵێت موسڵ ئینتەرنێتی تێدا نییە.

پرسیار لە خاوەن ڕێستورانتەکە دەکەم، تێدەگەم لە شاری موسڵ ئینتەرنێت هەیە. تەنانەت خاوەنی ڕێستورانتەکە بۆ خۆی ئینتەرنێتی هەیە، ئەگەریش حەز بکەین دەتوانین بەکاری بهێنین. ئەبوقەتادە بۆ ئەم بابەتە زۆر خۆشحاڵ نییە، ناڕەحەتە لەوەی کە بەهانەکەیم پەسەند نەکردووە و خەریکم فشار لەسەر قسەکانی دروست دەکەم. خۆشبەختانە ئەم جارە گفتوگۆکەمان بە هەڕەشە کۆتایی پێ نایەت. ئەبوقەتادە بەڵێنمان پێ دەدات کە ئەمشەو دەتوانین ئیمەیل بۆ خێزانەکەمان بنێرین.

کاتی نوێژکردنە. ئەبوقەتادە پەردە دەرابەییەکە دادەدات و دەرگاکەی دادەخات. ئەم کارە لە دەوڵەتی ئیسلامی لە کاتی نوێژکردندا شتێکی واجبە .

لە پاش نوێژ بە چەند شوێنێکدا تێپەڕ دەبین، کە لە کاتی گرتنی موسڵدا دوو چەکداری داعش لەو شوێنانە بە ترۆمبێلەکانیانەوە چەند بازگەیەکی زۆریان تێکوپێك داوە. دواجار خۆیانیان گەیاندووەتە بەردەم ئەو هوتێلەی کە فەرماندە ئێراقییەکانی تێدا بووە و سەرقاڵی داڕشتنی ستراتیژیی ڕووبەڕووبونەوەی داعش بوون، لەوێدا بووە کە خۆیان تەقاندووەتەوە. لەو هێرشەدا شەش جەنەڕاڵی سوپاکەی مالکی بووەنەتە قوربانی و ئەوانی ریش لەگەڵ سوپاکانیان هەڵاتوون.

لە مەیدانێك ڕادەوەستین، بێ ئەوەی بزانین لەبەر چی. لەناکاو سەروکەللەی دە پیاوی چەکداری ڕەشپۆشی دەمامکدار پەیدا دەبێت. پیاوێکی زلە و زەبەلاح زیندانییەکی سەرتاشراو و ڕیش خنەیی بەدەستەوەیە و بەرەو لای ئێمە دەیهێنێت. پیاوە زیندانییەکە جلێکی زەردی تایبەت بە زیندانی لەبەر کراوە، تەنها بە یەك پەنجەی بەرەو لای ئێمە ڕایدەکێشن. وا دیارە هەموو گیانی شکێنراوە. لە شەقامێکدا تووشی یەك دەبین، باجی سەرکێشییە! بە گومانەوە دەچینە ناوەڕاستی مەیدانەکە. کابرای زەبەلاح دەڵێت: "ئەمە پێشمەرگەیەکی دیلە، ئێستا دەتوانی گفتوگۆی لەگەڵ بکەیت." لە کاتی گفتۆکردنمان هێزەکانی پۆلیس گەمارۆمان دەدەن، ئەوانیتر ئاسایشی مەیدانەکە دەپارێزن. تەواوی ترۆمبێلەکان ڕادەوەستن. گیاندارێك چییە ناجوولێتەوە .

پیاوە زیندانییەکە لەگەڵ ئەوەی دەنگی بە ئەستەم دەبیسترێت، پێم دەڵێت: "سوپاست دەکەم کە کاتی خۆت بە من بەخشیوە." ڕەنج و نائومێدیی لە چاوەکانیدا شەپۆل دەدات.

- o یورگن تۆدنهۆفەر: تۆ کەی دەستگیرکراویت؟
- • زیندانی (پێشمەرگە زیندانییەکە): لە هاوینەوە، ئێمە ١٣ نەفەر بووین. گرووپێك بووین لە نزیکی ژنەکان جێگیر کرابووین. گرووپی دووەم لە نزیکی مەیدانی تەبادول[٩٠] بوو. گرووپی سێیەم پێشڕەویی کرد. ئێمە نزیکی سیتمەرخو[٩١] بووین، هەر لەوێ دەستگیر کراین.
- o لە چ کاتێکەوە زیندانی کراویت؟
- • لە ١٥ی جونی ٢٠١٤ـەوە. کە ماوەی شەش مانگ دەکات.
- o ڕەفتاری داعش لەگەڵ ئێوەدا چۆنە؟

---

90 Tabadul-platz
91 Sitmarkho

• ڕەفتاری داعش زۆر خراپ نییە، ئێمە تەنها نیگەرانی کەسوکارەکانی خۆمانین سەرەتا شەو و ڕۆژمان لەیەك جودا نەدەکردەوە. نەماندەزانی بڕیارە چیمان بەسەر بێت ئازاد دەبین یاخود نا. تەنها دەمانزانی بە سەلامەت ڕزگارمان بووە.

ئەبولوت: دەربارەی چۆنێتی هەڵسوکەوتی داعش پرسیاری کرد! وەڵام بدەوە!

• ڕەفتار(یان) باشە، کێشەیەك نییە.

o تۆ ئیشت چییە؟

• سەرباز، سەربازێکی سادە.

o موسڵمانیت؟

• بەڵێ.

o پێیان گوتون بڕیارە چیتان لێ بکەن؟

• پێیان گوتوین، کە ئێمە بۆ ئەوان زیندانی ئاڵوگۆڕکراوین. ئێمە داوامان لە حکومەتی هەرێمی کوردستان و لە سەرۆك بارزانی کردووە، کە لەم ئاڵوگۆڕەدا هاوکاریمان بکات. بەڵام ئەوان هیچ وەڵامێکیان نەبووە و هیچ نیازێکیان بۆ ئەم کارە دەرنەبڕیوە.

ئەبولوت: دەپرسێت دەوڵەتی ئیسلامی چۆن لەگەڵتا مامەڵەی کردووە؟ خواردن و خواردنەوەت باش بووە؟

• ڕەفتاریان لەگەڵمان باش بووە، زۆر باش، کێشەیەك نییە.

o هاوسەرگیریت کردووە؟ منداڵت هەیە؟

• نەخێر، هاوسەرگیریم نەکردووە. بەڵام خوشك و برای هەتیوم هەیە کە من دەبێت یارمەتیان بدەم.

o خێزانەکەتان دەزانێت تۆ لە لای داعش زیندانیت؟

• بەڵێ، شەش مانگ دەبێ کە ئاگادارن. لە تەلەفزیۆن چاوپێکەوتنیان لەگەڵمان کرد. ئێمە داوای هاوکاریمان لە دەوڵەت، لە بارزانی تەنانەت لە خێزانەکانیشمان کرد.

بەڵام تا ئێستا بێوەڵامین. ئێستا ئەوان نازانن ئێمە ماوین یان مردووین! چیتر زانیارییان لەسەر ئێمە نییە.

- o ناوت چییە؟
- • حەسەن محەمەد هاشم.
- o خەڵکی کام شاریت؟
- • خەڵکی قەزای خەباتم لە نزیك هەولێر.
- o دژی داعش شەڕتکرد؟
- • ئێمە ١٣ کەس بووین کە شەڕمان نەکردووە.

دەنگی دەپچڕێت. خەڵکی بۆ تەماشاکردن لە مەیدانەکە خڕ دەبنەوە. ئەم پیاوە و پیشاندانی لە ئاپۆڕای جەماوەردا بێڕادە دڵم ئازار دەدات و خەمبارم دەکات. هەمیشە بێچارەیی دیلە جەنگییەکان دەمانخاتە ژێر کاریگەرییەوە. دەمەوێت گفتوگۆکە کۆتایی پێ بهێنم. لە ناکاو سەروکەڵلەی فڕۆکەیەك پەیدا دەبێت. بۆ یەکەمین جار بەم هەڕەشەی مەرگە خۆشحاڵ دەبم. لەگەڵ پێشمەرگەکە بە گەرموگوڕیی بۆ ماوەیەکی زۆر تەوقە دەکەم. دواتر ئەو دەبەن. لە ڕێگادا دەمامکێکیشی لەسەر دەکەن .

بە ئێمە دەڵێن هەرچی زووترە سواری ترۆمبێلەکان بین. فەرمان دەدەن بۆ ئەوەی ترۆمبێلەکان بجوولێن. جێگای خۆمان لەنێوان کۆمەڵە ترۆمبێلێکدا دەکەینەوە و لە ترافیکێکی قەرەباڵغدا نوقم دەبین. ئەبولوت دەڵێت ژمارەیەکی زۆر دیلمان لەگەڵ تورکەکاندا گۆڕیوەتەوە. ٤٩ تورك، کە لە کونسوڵخانەی موسڵ دەستگیر کرابوون، ئازاد کران. نایەوێت ڕوونکردنەوەی ورد لەسەر مەسەلەکە بدات. تورکەکان ئەم کارە بە چالاکی ئازادکردن ناو دەبەن .

لەگەڵ کوردەکاندا تا ئێستا هیچ حاڵەتێکی ئاڵوگۆڕکردنەوەی دیل ڕووی نەداوە، بەڵام داعش هیوادارە، کە ئەم کارە لەگەڵ کوردەکانیشدا بکات، چونکە دوازدە پێشمەرگەی دیکەشیان لایە، کە دەبێت بگۆڕدرێنەوە. پێشنیاری ئەبوقەتادە ئەوەیە، کە لە بەرانبەر

ئازادکردنی هەر پێشمەرگەیەك پێویستە کوردەکان ١٠٠ چەکداری داعش ئازاد بکەن. هاوشێوەی ئەوەی کە لەنێوان ئیسرائیل و فەلەستینییەکاندا ڕوو دەدات .

بەرەو لای دەروازە ڕەشەکە دەڕۆین. بە تەنیشت چەند لاوێکدا تێپەڕ دەبین، کە سەرقاڵی یاریی فوتبۆڵن. لەبەردەم دەروازەکە لەگەڵ ئەو چەکدارانە چاوپێکەوتن دەکەین، کە لە گرتنی موسڵدا بەشدار بوونە. تەمەنی چەکدارەکان لە نێوان ٢٥ بۆ ٣٠ ساڵێك دایە، زۆریش باڵابەرز و بەهێز نین. لە بەردەم دەروازەی ڕەش لەگەڵ یەکێك لە چەکدارەکان گفتوگۆ دەکەین:

- یورگن تودنهوفەر: ئێوە یەکەم کەسانێك بوون کە موسڵتان داگیرکرد، دروستە؟
- چەکداری داعش: بەڵێ.
- چەند ڕۆژی پێچوو بۆ ئەوەی موسڵ کۆنترۆڵ بکەن؟
- زیاد لە چوار ڕۆژ.
- چەند کەس بوون کاتێك هێرشتان کرد؟
- ژمارەی ئەو چەکدارانەی کە توانیان موسڵ کۆنترۆڵ بکەن بە هەموویانەوە نزیکەی ٣٠٠ کەسێك بوون.
- چەند؟
- 300کەس، وابزانم کەمتریش بوو.
- ئەی هێزە ئێراقییەکان ژمارەیان چەند بوو؟ ١٠٠٠٠؟ ٢٠٠٠٠؟ ٣٠٠٠٠؟
- نزیکەی ٢٤٠٠٠ کەس بوون.
- بۆچوونتان چییە؟ بۆچی ئەوانە هەڵاتن؟ بۆچی ٢٤٠٠٠ کەس لە بەرانبەر ٣٠٠ کەس پەنایان بۆ ڕاکردن برد؟
- بۆچی ئەوان هەڵاتنیان لە جێی شەڕکردن هەڵبژارد؟ دەی ئەمە بەهۆی توانا و گروتینی باوەڕەکەمانەوە بوو. ئێمە بە توانای چەکەکانمان پێشڕەوی ناکەین، بەڵکو خوای باڵادەست سەرکەوتن بە ئێمە دەبەخشێت. پەندێکی پێشینان هەیە دەڵێت "ترسی دوژمن سەرکەوتنی خێرا دەرەخسێنێت".

o چەکەکانتان چ بوون؟ کڵاشینکوف؟

• شلیکا! بەهێزترین چەکێك کە ئێمە هەمانبوو بریتی بوو لە چەکی دژەفڕۆکەی شلیکا[92].

o هێزە ئێراقییەکان چ جۆرە چەکێکیان هەبوو؟

• لە ئاسمانی بان سەرمان فڕۆکەکان لە فڕیندا بوون، بەڵام بە لوتفی خوا نەیانتوانی هیچ زیانێکمان پێ بگەیەنن. ئەوان تۆپ و هاوەنیشیان هەبوو. چەکی بەهێزی جۆراوجۆریان لەبەر دەستدا بوو، بەڵام بە لوتفی خواوەند ئەم چەکانە هیچ ترسێکیان لە دڵی ئێمەدا دروست نەکرد و نەبوونە بەربەست لە پێشڕەویکردنی ئێمە، ئەویش تەنها بە یارمەتی و لوتفی خواوەند بوو، ئەو زاتە هاوکاریی کردین.

o هێزە ئێراقییەکان کۆپتەریشیان پێ بوو؟

• بەڵێ، کۆپتەرێکیش بەسەر سەرمانەوە بوو بۆ ئەوەی بۆردومانی ئێمە بکات.

o باشە ئەو کۆپتەرە نەیتوانی کارێك بکات؟ نەیانتوانی دەرەقەتی ٣٠٠ کەس بێن و بەسەرتاندا سەرکەون؟

• کۆپتەرەکە تەقەی لە ئێمە کرد، بە لوتفی خواوەند سەرکەوتوو نەبوون. هێزە ئێراقییەکان لە پێشەوە و لە پێشەوە و لە تەنیشتیشەوە هێرشیان دەکردە سەر ئێمە، کۆپتەرەکانیشیان ناچار بوون لە ئاستە بەرزەکانی ئاسماندا بسووڕێنەوە و نەیاندەوێرا بۆ ئاستە نزمەکان دابەزن.

o تۆ دەڵێی لە پاش چوار ڕۆژ سوپا ئێراقییەکان هەڵاتن.

• بەڵێ، ئێمە بۆ ماوەی چوار ڕۆژ لە سەنگەری ڕاستی موسڵەوە شەڕمان کرد، بەڵام کاتێك برایەکی شەهیدمان پردەکەی تەقاندەوە، ئێراقییەکان ترس دایگرتن و هەموویان هەڵاتن، بە یارمەتی خوا موسڵ لە ماوەی ٢٤ کاتژمێردا کۆنترۆڵکرا و کەوتە دەستی دەوڵەتی ئیسلامی.

o ئەوان هەروا بە ئاسانی هەڵاتن؟

---

92 Mm-flak-23

• بەڵێ، ئەوان لە سەربازگەکانیان هەڵاتن. تەنانەت چەك و تەقەمەنییە قورسەکانی وەك تانك و جبەخانەکانیان بەجێ هێشت. سوپاس بۆ خوا ئێمە زۆر سوودمان لە چەك و تەقەمەنییەکانیان وەرگرت. تەنانەت تۆپ و فرۆکەکانیشیان بە جێ هێڵا.

o ئێوە چۆن دەتوانن بە کەمتر لە ۳۰۰ کەس ۲٤۰۰۰ کەس ڕاوبنێین؟ چۆن ئەمە دەسەلمێنێت؟

• ئێمە ۲٤۰۰۰ کەسەکەمان نەکوشت، بەڵکوو ئێمە چەند کەسێکمان لێ کوشتن. ئیتر ئەوانیتر ترس دایگرتن و ڕایان کرد، بەڵام ئێمە سەنگەرمان چۆڵ نەکرد. خوای باڵادەست بەڵێنی سەرکەوتنی بە ئێمە داوە، کە ئەگەر شەڕ بکەین، سەرکەوتنمان پێدەبەخشێت، هەر واش بوو، سەرکەوتنی کردە نسیبمان. دوژمنەکانی ئێمە هیچ بنەمایەکی باوەڕییان نەبوو تا لە پێناویدا بجەنگن. ئەوان لە بۆ پارە شەڕیان دەکرد و بەرگرییان لە حکومەتێکی دیکتاتۆری دەکرد.

o ئایا پاداشتێکتان وەرگرت؟ واتە دوای سەرکەوتن هیچ پارەیەکتان پێ بەخشرا؟

• بەشێك لە غەنیمەتەکانی ئەو شەڕە کەوتە دەست موسڵمانان، چونکە مورتەدەکان دەستکەوت و پارەیەکی زۆریان بۆمان بەجێ هێشتبوو. بەشێك لەو دەستکەوتانە بە ئێمە دران. کەمێکیش پارەیان پێداین، بە ئەندازەی مووچەی یەکێك لە مورتەدەکان. هێندەی مووچەی مانگێکی مورتەدێك، ڕەنگە تۆزێك زیاتر.

o ئێوە پێتان وایە لە شەڕەکانی ئێراق و سووریادا براوە دەبن؟

• لە ئێستادا دڵنیاین لەوەی کە پەروەردگار هاوکاریمان دەکات، بۆ ئەوەی بەسەر تەواوی وڵاتەکاندا سەربکەوین و هەموویان کۆنترۆڵ بکەین. ڕۆم و قوستەنتینییە و ئەمریکا هەموویان کۆنترۆڵ دەکەین. زۆر دڵنیاین لەم کارە.

o ناوی تۆ چییە؟

• ئەحمەد.

o زۆر سوپاستان دەکەم.

دواتر دەستی بۆ درێژ دەکەم بۆ ئەوەی تەوقەی لەگەڵ بکەم، بەڵام ئەو خۆی دەکێشێتەوە و تەوقەم لەگەڵ ناکات و بە سووکێکەوە تەماشام دەکات. ئەو و هاوڕێکەی، کە لە ڕامبۆ دەچێت، حەز دەکەن چەند یادداشتێکم پێ بڵێن. دەیانەوێت هەندێك شت بە من بڵێن کە بە قسەی خۆیان بەلایانەوە زۆر گرنگە. دەڵێن ئەگەر ڕۆژێك بێینە ئەڵمانیا ئێوە یەکەمین کەسێك دەبن کە دەکوژرێن. ئێوە دەدۆزینەوە و هاوکات بە پەنجە هێڵ بەسەر لای ڕاست و چەپی گەردنیدا دێنێت و دەڵێت لێرەوە سەرتان دەبڕین. لە دیدی ئەوانەوە ئێمە بە دوژمن لەقەڵەم دەدرێین. زەمانەتنامەکەی خەلیفەش هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت.

بەرەو لای ترۆمبێلەکەمان دەڕۆین. وێنەگرەکەی من کە فریدریکی کوڕمە، داوا لە ئەبولوت دەکات، کە بۆ یادگاریی چەند وێنەیەك لەگەڵ مندا بگرێت. دواتر کاتێك فریدریك تەماشای وێنەکان دەکات دەبینێت لەکاتی گرتنی وێنەکە، ڕامبۆ لە پشتمانەوە وەستاوە و ئێم، ١٦ـەکەی ڕوو کردووەتە سەری من.

بەرنامەی دواترمان بریتییە لە گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەبوقەتادەدا، گفتوگۆیەکی گرنگ و کامڵ سەبارەت بە ئامانجەکانی داعش.

لەسەر تەپەیەك شوێنێك بۆ گفتوگۆکردن دەدۆزینەوە، لێرەوە بە جوانی سروشتی شاری موسڵ دەبینین. لە پشت سەری من و ئەبو قەتادەوە سێ کەس لە چەکدارانی موسڵ بە جلوبەرگی ڕەش و بە دەمامکەوە ڕادەوەستن. گفتوگۆکەمان کەمێك بە ترسولەرزەوە دەست پێدەکات، فەزایەکی زۆر ناخۆش و سەختە. ئەمانە ڕقەکانیان بە ئاشکرایی و بە ڕۆشنیی پیشان نادەن، وەك ئەوەی ڕزگارکەرانی موسڵ پیشانیاندا. بە بێباکی و گرژییەکەوە لوولەی چەکەکانیان ڕوو کردۆتە ئێمە. ئەم چاوپێکەوتنە لەگەڵ ئەبوقەتادەدا دواتر لە لایەن دەوڵەتی ئیسلامییەوە بە ڕێگەپێدراو دانرا و هیچ هاك و مۆنتاژێکی لەسەر دانەنرا:

o یـورگن تۆدنهۆفــەر: ئەبوقــەتادە، چـی پاڵنــەرێك وای لــێ کـردی کـە ئــەڵمانیا بەجێبهێڵیت و ئێستا وەکوو چەکدارێك بۆ دەوڵەتی ئیسلامی شەڕ بکەیت؟

• ئەبوقەتادە: یەکەمین پاڵنەر و هۆکاری ئامادەبوونی من و زۆربەی هاورێکـانم لـە ئێرە، جیهادە لە پێناو خـوای گـەورە و پایەبـەرز، لـە پێنـاو گوێڕایـەڵیکردنی ئـەو زاتـە، چونکە ئەمە فەرمانی خوای گەورەیە و لەم بارەیەوە زانایانیش کۆدەنگن لەسەر ئـەوەی، کـە کۆچـکردن بـۆ دەوڵـەتی ئیسـلامی، ئـەرکی هـەموو لایەکـە و هـەموان بەرپرسـن لـە کۆچکردن بۆ ئێرە و بەرپرسن لە پاراستنی ئەم دەوڵەتە ئیسلامییە. سا هـەر بۆیـە ئێمـە وەڵامی ئەم بانگەشەیەمان دایەوە و کۆچمان بۆ ئێرە کرد و ئێستاش لێرەین.

o ئایـا تـۆ لـە ئـەڵمانیا وەکـوو تـاکێکی موسـڵمان ڕووبـەڕووی ڕەگەزپەرسـتی و سووکایەتیپێکردن بوویتەتەوە؟

• پێم وایە هەموو کەسێك لـەم بارەیـەوە دەتوانێـت شـتێك بڵێـت یـان هەرکەسـێك چیرۆکێکی لەم بارەیەوە هەیە، من ناتوانم چیتر لە ئەڵمانیا لەگەڵ بێباوەڕاندا بژیم. بۆیـە تاکی ئیسلامی تەنها شتێك کە لە وڵاتانی کـافردا دەتوانێـت بیکـات ئەوەیـە، کـە فـەریزە دینییـەکانی خـۆی ئازادانـە جێبـەجێ دەکـات، بـەڵام تـەنها پێـنج فـەرزە نوێـژکردن و ڕۆژووگرتن بەس نییە، بەڵکوو مرۆڤ دەبێـت قوربـانیی بکـات و هاوسـەرگیریی ئیسـلامی و چەند ئەرکێکیتر لە ئیسلامدا بەجێ بهێنێت. بەڵام تەواوی ئەم شتانە لە ئەڵمانیا پەسـەند نـین، دەی کەواتـە نـەك تـەنها مـن، بـەڵکوو هـەموو موسـڵمانێك لـە ئـەڵمانیا ڕووبـەڕووی ڕەگەزپەرسـتی و سـووکایەتیپێکردن دەبێتـەوە، سـەرەڕای ئەمـە ئێمـە بـە پێسـت و گوێچکەی خۆمان ئەم سووکایەتیپێکردنەمان لە لایەن پۆلیس و گـەورە بەرپرسـەکانەوە تاقی کردووەتەوە.

o ئەگەر دەوڵەتی ئیسلامی دەست بەسەر هەردوو وڵاتی ئێراق و سـووریادا بگرێـت داعش چیتر چ ئامانجێکی دیکەی هەیە؟ ئایا ئەمە کۆتاییە یـاخود سـەرەتا و بـەردەوامی کارەکانتانە؟

• ئامانجی دەوڵەتی ئیسلامی لە هەنگاوی یەکەمدا بریتییە لەوەی، کە لە ئێراق و سووریادا شەریعەتی خوا جێبەجێ بکات. هەنووکە لە لیبیا، بیابانی سینا، میسر، یەمەن و لە نیمچەدوورگەی عەرەبیش چەند پێشڕەویەکمان هەیە. هەڵبەت ئێمە دەڵێین مەرز و سنورمان نییە، تەنها سەنگەر، یاخود هێڵی پێشەوەمان هەیە، واتە پێشڕەویکردنی ئێمە ڕاناوەستێت.

o ئەم قسەیە بە مانای ئەوە دێت کە ئێوە ڕۆژێك دەست بەسەر ئەورووپاشدا دەگرن؟

• بەڵێ بەڵێ، ئێمە ڕۆژێك ئەورووپاش کۆنترۆڵ دەکەین. ئێمە نەك تەنها خوازیاری ئەم کارەین، بەڵکوو ئەم کارەش دەکەین، دڵنیاین لەوە.

o ڕۆڵی ئایینەکانی دیکەی وەکوو مەسیحیی و یەهودییەت لە دەوڵەتی ئیسلامیدا چییە؟ مەسیحیی و جوولەکەکان چ مافێکیان هەیە؟

• مەسیحییەکان و جوولەکەکان، بەپێی وتەی زانایان ئاگرپەرستانیش، دەتوانن سەرانە بە دەوڵەتی ئیسلامی بدەن. ئەگەر ئەو سەرانەیە بە ئێمە بدەن، ئەوە ئاشکرایە کە ئێمە پارێزگارییان لێ دەکەین و ئەوانیش دەتوانن لەسەر ئایینەکانی خۆیان بمێننەوە. دەتوانن هەموو ئەو شتانەی کە لەنێو دینەکەیاندا هەیە ئەنجامی بدەن، بەڵام ڕێگەیان پێ نادرێت بانگەشەی خەڵکیتر بۆ نێو دینەکەیان بکەن، بەڵام بە دڵنیاییەوە لەژێر چاودێری ئێمەدا دەبن و دەتوانن لە ئاسایش و ئارامیدا بژین. ئەگەریش سەرانە نەدەن، ئەوا هەموویان دەکوژرێن.

o کوشتن؟

• بەڵێ، یاخود لە دەوڵەتی ئیسلامی دەریان دەکەین. هەروەکوو ئەو بارودۆخەی کە لە موسڵ ڕوویدا، ئەوان سێ ڕۆژ مۆڵەتیان هەبوو بۆ ئەوەی جەزیە بە دەوڵەتی ئیسلامی بدەن. بەڵام ئەوان بڕیارێکی دیکەیان هەڵبژارد و هەموویان لە موسڵ هەڵاتن.

- o سەبارەت بە شیعەکان چی؟ بەلای کەمەوە نزیکەی ١٥٠ ملیۆن شیعەمان لە جیهاندا هەیە، لە وڵاتەکانی ئێراق و ئێران و شوێنەکانیتری جیهان، ئایا چارەنووسی ئەوانە چی دەبێت؟
- • ئێمە شیعەکان بە ڕافزیی یاخود بە مورتەد دادەنێین.
- o موشریك؟
- • موشریك، بەڵێ دروستە. ئەوان یەك ڕێگەیان هەیە. ئەبوبەکر بەغدادی ئەم ڕێگەیەی بۆ تەواوی ئەو کەسانە پێشنیار کردووە، کە کەوتوونەتە گێژاوی کوفر و موشریك بوونەوە. ئەگەر کەسێکی شیعە تۆبە بکات و پەشیمان بێتەوە، ئەوە ئێمە تۆبەکەی لێ قبوڵ دەکەین، ئەوەش نابێتە کێشە کە پێشتر چەند کەسی لە ئێمە کوشتبێت. تەنانەت ئەگەریش سەدان کەسی لە ئێمەش کوشتبێت، ئێمە تۆبەکەی پەسەند دەکەین و ئەو وەکوو موسڵمانێك بە برای خۆمان دادەنێین، بەڵام ئەگەر ئەم کارە نەکات، ئەوە دەیکوژین. یاسای جەزیە شیعەکان ناگرێتەوە، بەڵکوو دوو ڕێگەیان، هەیە یان ئیسلام یان شمشێر.
- o واتە ئەگەر تەواوی شیعەکانی ئێراق و ئێران، ١٥٠ ملیۆن شیعەی جیهان، لە مەزهەبەکەی خۆیان پاشگەزنەبنەوە، ئەوە هەموویان دەکوژن؟
- • بەڵێ، هەروەکوو چۆن ئێمە...
- o 150ملیۆن؟
- • 150ملیۆن، ٢٠٠ملیۆن، ٥٠٠ ملیۆن، ژمارەکەی بۆ ئێمە گرنگ نییە.
- o کەواتە ئەگەر تەواوی موسڵمانانی ئەورووپاش بە مەزهەبەکەی ئێوە ڕازیی نەبن، ئەوە هەموویان دەکوژن؟
- • هەرکەس مەزهەبەکەی ئێمە هەڵنەبژێرێت ئەوە موسڵمان نییە، ئەگەریش لەسەر گومڕابوونەکەی بەردەوام بێت، ئەوە ڕێگایەك نامێنێتەوە جگە لە شمشێر.
- o کوشتن؟
- • بێگومان.

o ئەم شتەی تۆ دەیڵێیت زۆر توندوتیژە؟

• ئەمە قسەی من نییە، ئەمە بۆچوونی ئیسلامە لەسەر ئەو جۆرە کەسانە، حوکمی ئەوانە هەڵگەڕانەوەیە لە دین، حوکمی کەسی هەڵگەڕاوەش کوشتنە.

o لە ئەڵمانیا، ئەمریکا بەریتانیا خەڵکی زۆر لە چالاکی تیرۆریستیی پەیڕەوانی ئێوە دەترسن؟ ئایا لە ئاییندەدا کاروچالاکی لەدژی مەسیحییەکان و موسڵمانەکانی ئەڵمانیا ئەنجام دەدەن؟

• هەڵبەتە من ناتوانم بڵێم ئەگەری ئەنجامدانی کاروچالاکی لەو وڵاتانە هەیە یاخود نا. وڵاتانی ئەڵمانیا، ئەمریکا، ئەورووپا، بەریتانیا و وڵاتەکانی تریش لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیدا ململانێ دەکەن. بێگومان تۆش ئاگات لەو هاوپەیمانێتییە هەیە. هەموو ئەم وڵاتانە وەکوو خانەی جەنگ ڕیزبەندیی کراون، ئەو وڵاتانەی کە ئێمە لەگەڵیان شەڕ دەکەین. ئەو وڵاتانە دەبێت ئەگەری ئەوە دابنێن، کە ڕەنگە ڕۆژێك لەنێو وڵاتەکانی خۆیاندا لەگەڵیان بەشەڕ بێین. لە ڕابردوودا هیتلەر هێرشی کردە سەر ڕووسیا و لەگەڵ ڕووسیا بەشەڕ هات، پاش ئەوە بە پێچەوانەوە ڕووسیا هێرشی کردە سەر ئەڵمانیا، ئەمە شتێکی سادەیە و دەکرێ ڕووبدات .

o ئێمە ئەمە بە ئاسایی نابینین. ئایا لە ئاییندەیەکی نزیکدا ئەگەری هێرشکردنە سەر ئەڵمانیا هەیە؟

• مەسەلەکە ئەوەیە کە بۆ ئێمە هیچ گرنگ نییە کە ئێوە چۆن لەم مەسەلەیە دەڕوانن، پێتان ئاساییە یاخود نا. چونکە ئێوە لەدژی ئێمە شەڕ دەکەن، بە تایبەتی دەوڵەتی ئەڵمانیا لەگەڵ ئێمە شەڕ دەکات. ئەو چەکی بۆ پێشمەرگە هەناردووە و تەواوی مورتەدەکانی دنیای پڕچەك کردووە، هەروەها لەبەر هەندێ مەسەلەی تریش. ململانێی ڕۆژئاواییەکان لە دژی ئیسلام زۆر لە مێژە دەستی پێکردووە، بە تایبەتی لە سەردەمی نورەدین زەنگی یاخود لە سەردەمی سەلاحەدینی ئەیوبی و ئەوانیترەوە، هەر بۆیە دەبێت بە دڵنیاییەوە چاوەڕوانی پەرچەکردار بن.

o ئایا ئەگەری ڕوودانی کردەوەی تیرۆریستی هەیە؟ کردەوە تیرۆریستییەکان بە شێوەیەکی فراوان یاخود لە دژی کەسایەتییەکان دەبێت؟

• بەهەمان شێوەی ئەوەی کە ئەبومحەمەد عەدنانی وتەبێژی ڕەسمی ئێمە لە دەوڵەتی ئیسلامی بانگەشەی بۆ کرد، ئەو داوای لە موسڵمانەکانی ڕۆژئاوا کرد کە پەیمانی وەلاو و بەرائی خۆیان نوێ بکەنەوە، بەشێوەیەك وەلائیان بۆ موسڵمانان هەبێت و پشت لە کافرەکان بکەن. ئێوە چۆن دەتوانن بە ئاسوودەیی بنوون لە کاتێکدا ئێمە لێرە لەژێر بۆردومانی ئەمریکییەکان داین؟ بۆچی و چۆن ئەم وڵاتانە پشتگیریی لە بەرهەڵستکاریی ئێمە دەکەن. هەر لەبەر ئەمەیە کە عەدنانی دەڵێت، بۆردومانیان بکەن. تەقینەوەیان تێدا بکەن، سەریان بە چەقۆ ببڕن و ئەگەر ناتوانن ئەوە بکەن بەلای کەمەوە تف لە چارەیان بکەن.

o ئایا ئەو کاروچالاکییانە لەلایەن ئەو کەسانەوە ئەنجام دەدرێت کە لە دەوڵەتی ئیسلامییەوە بۆ ئەڵمانیا دەگەڕێنەوە .

• نازانم ئەو کەسانە ئەوانە دەبن کە لێرە دەگەڕێنەوە یاخود نا، بەڵام ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە ئەوانەی لە دەوڵەتی ئیسلامی دەگەڕێنەوە، دەبێت پەشیمانی خۆیان پیشان بدەن.

o دەی کەوایە ئەو کەسانەی دەگەڕێنەوە بۆ ئەڵمانیا چیتر لەگەڵ ئێوە کۆك نین؟

• ئەوەی کە لەگەڵ ئێمەدا کۆکن یاخود نا... هۆکاری گەڕانەوەکەیان چییە، من نازانم. من ئومێدەوارم ئەو کەسانەی گەڕاونەتەوە پشتیان لە دەوڵەتی ئیسلامی نەکردبێت و پەیمانی خۆیان نوێ بکەنەوە. هەروەك گوتم دەبێت حەسرەتی ئەوە بخۆن کە دەوڵەتی ئیسلامییان بەجێ هێشتووە و گەڕاونەتەوە. ئێمە تەنها ئومێدەوارین ئەو کەسانە بیرێك لە خۆیان بکەنەوە و لەسەر تێکۆشان لە پێناوی ئیسلامدا بەردەوام بن، لە هەرشوێنێك بن فەرق ناکات.

o بە چواردەوری ئێوەدا چەندین سەرباز وەستاون، ئەوان لە مانگی ئۆگۆستدا بەشداریی داگیرکردنی موسڵیان کردووە. هێزە ئێراقییەکان نزیکەی ۳۰۰۰۰ سەرباز بوونە. چەند چەکداری داعش توانیان بەسەر ئەم ۳۰۰۰۰ چەکدارەدا سەربکەون .

• ژمارەی چەکدارەکانمان کە بەشداریی داگیرکردنی موسڵیان کرد، هیچ کەسێك ناتوانێت بە دڵنیاییەوە ئەوەتان پێ بڵێت کە ئەوان چەند کەس بوون .

- چەند بوون؟

• ئێمە چەند ئامارێکمان هەیە ١٨٣ تا ٢٠٠، تا ٣٠٠، تا ٥٠٠، ئەو پەڕی ١٠٠٠ یان ٢٠٠٠ بوونە. ژمارەی چەکدارەکانی ئێمە لە بەرانبەر ژمارەی سەربازە ئێراقییەکان زۆر کەم بوو. ئێمە بە چەك و تەقەمەنی و ژمارەی سەربازەکانمان بەسەر دوژمنەکانماندا سەر ناکەوین، بەڵکوو بە یارمەتی الله سبحانە تعالی سەرکەوتن بە دەست دێنین، هەروەها بە دروستکردنی ترس لە دڵی دوژمنەکانماندا بەسەریاندا سەر دەکەوین.

- ئایا لە بەرەکانی جەنگ خەلیفە لەگەڵ ئێوە بەشداریی شەڕکردن دەکات؟

• هەڵبەت بەشداریی دەکات. چەند سەنگەرێك هەیە تێیدا ئەبوبەکر بەغدادی شان بەشانی ئێمە شەڕ دەکات، چونکە ئێمە کۆمەڵەڕابەرێکمان هەیە هەرگیز خەڵکی خۆیان فریو نادەن، بەڵکوو لەسەر بەڵێنەکانی خۆیان سوورن. هەڵبەت عەدنانی و بەغدادی و ڕابەرەکانیتر لە شەڕەکاندا بەشدارن و لە سەنگەرەکانی پێشەوەش شەڕ دەکەن. چونکە ئەوانیش وەکوو چەکدارەکانیتری دەوڵەتی ئیسلامی دەیانەوێت شەهید بن و پلەی شەهادەت بە دەست بێنن و بۆ لای خوای گەورە بگەڕێنەوە.

- ئێوە، واتە دەوڵەتی ئیسلامی، بە شێوەیەکی کێشەدار مرۆڤەکانتان سەربڕیوە و گرتەی ڤیدیۆیشتان لەو سەربڕینانە گرتووە، ئێوە سەردەمی کەنیزەك و کۆیلایەتیتان گەڕاندووەتەوە، ئێزیدییەکانتان بۆ خۆتان بە بەندە و کەنیزەك داناوە. پێتان وایە سەربڕینی مرۆڤەکان و کەنیزەکداریی بە جۆرێك لە پێشکەوتن بۆ مرۆڤایەتی هەژمار دەکرێت؟

• ناوی لێ دەنێی پێشکەوتن یان هەر شتێك، من پێم وایە ئەگەر ئەم شتانە نەبێت ئەوا مرۆڤایەتیش بوونی نابێت. ئەمە بەشێکە لە ستراتیژی ڕێبازەکەی ئێمە، بۆ ئەوەی ترس لە دڵی کافراندا دروست بکەین. ئێمە لە سەربڕینی مرۆڤەکان بەردەوام دەبین. فەرقیش ناکات ئەو مرۆڤانە شیعە، مەسیحی یان جوولەکە و پەیڕەوانی هەر ڕێبازێکیتر بن. ئێمە لەسەر ئەم کارە بەردەوام دەبین و دەبێ خەڵکیش لەم بارەیەوە بیر بکاتەوە،

چونکە جیمز فولی و ئەوانیتر کە هەر ناوێکیان هەبوو لەبەر ئەوە نەکوژران کە ئێمە دەستمان بە شەڕ کردووە، بەڵکوو لەبەر ئەوە کوژران کە وڵاتە نەزانەکانیان بۆ ئازادبوونیان هاوکاریانیان نەکرد.

- o بە بۆچوونی ئێوە کۆیلەداری بە جۆرێك لە پێشکەوتن لەقەڵەم دەدرێت؟
- • (بە پێکەنینێکەوە) بێگومان. پێشکەوتنە، یان هاوکاری یان هەرشتێکیتر. کۆیلە و کۆیلەدار شتێکی تازە نییە، لە هەموو سەردەمێکدا هەبووە. لە نێوان مەسیحیی و جوولەکەکانیشدا ڕەواجی هەبووە.
- o بەڵام زۆردەمێکە هەڵوەشێنراوەتەوە[٩٣].
- • تەنها هەندێك مرۆڤی نەزان وادەزانن هەڵوەشێنراوەتەوە. خەڵکی بۆ خۆیان دەزانن کە لە ڕۆژئاوادا تا ئێستاش کۆیلەداری هەیە، بۆ نموونە داوێنپیسیی ئەو ژنانەی کە بە شێوەیەکی خراپ بۆ ئەم کارە ناچار دەکرێن. کۆیلەداری لە ئیسلامدا چەند یاسایەکی هەیە، بۆ نموونە ئەگەرکۆیلەکان ببنە موسڵمان، زۆرێکیان ئازاد دەکرێن. ئێمە کۆیلەکان فێری ئیسلام دەکەین، فێری شتی باشیان دەکەین، ئێمە ئەخلاق و ویژدانمان هەیە ئێمە... هەیە. (زمانی دەگیرێت.)
- o ...باوەڕ؟
- • نەك تەنها باوەڕ، بێگومان کە ئێمە باوەڕمان هەیە، بەڵکوو زۆر شتیتر هەیە کە ئێمە لە ڕووی یاساییەوە پێیەوە پابەندین. ژنێکی کافر لای موسڵمانان کەنیزەك بێت باشترە لەوەی لە دەرەوە بسووڕێتەوە و هەرکارێك کە بیەوێت، بیکات. کاری داوێنپیسیی بێت یاخود هەر شتێکیتر.

---

٩٤- هەڵگیراوە- منسوخ.

o تۆ پێشتر ئەڵمانییەکی پرۆتستانتی بوویت و ئێستا بوویتەتە موسڵمان، هەنووکە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا دەژیت. ئێمە ئێستا لە شاری موسڵین، ئەو شارەی کە ئێوە کۆنترۆڵتان کردووە. پرسیارەکەم ئەمەیە ئایا ڕۆژێك تۆ دەگەڕێیتەوە بۆ ئەڵمانیا؟

• سوپاس بۆ خوا. خوا منی بۆ سەر ڕێگای ڕاست ڕێنوێنیی کرد و نیعمەتی کۆچکردنیشی بە من بەخشی، کۆچکردن و دەرچوون لە ئەڵمانیا. لە پاش چەندین جار هەوڵدان، دواجار توانیم کۆچ بۆ شام و دەوڵەتی ئیسلامی بکەم. ئێمە پارچەیەکین لە دەوڵەتی ئیسلامی بۆ ئەوەی دروستی بکەین. نازانم دەگەڕێمەوە بۆ ئەڵمانیا یاخود نا، ئەوەیان تەنها خوا دەزانێت، بەڵام بە دڵنیاییەوە ڕۆژێك دەگەڕێینەوە بۆ ئەڵمانیا، نەك بە ئاشتی و نێتپاکی و شتی لەم جۆرەوە، بەڵکوو بە چەك و سەربازەکانمانەوە دەگەڕێینەوە، هەروەها هەرکەسێك ئیسلام قبوڵ نەکات و باج و سەرانە نەدات ئەوە دەیکوژین.

****

ئەمە بوو چاوپێکەوتنی ئێمە لەگەڵ ئەبوقەتادەدا. ئەبوقەتادە سەیرێکی هاوڕێ چەکدارەکانی دەکات، کە پیرۆزبایی لێ دەکەن. لە هەموویان زیاتر ئەو دوو گەنجە زۆر خۆشحاڵن، کە پێشتر گوتمان لە کۆنترۆڵکردنی موسڵ بەشداربوونە و هەڕەشەی سەربڕینیان لێ کردین، ئەوان بە خۆشحاڵییەوە تەماشای ئەبوقەتادە دەکەن و پەنجە گەورەکەیان بە نیشانەی سەرکەوتن بۆ ئەبوقەتادە بەرزدەکەنەوە. ئەبوقەتادە بۆ ئەوان ئەڵمانییەکی زیرەکە، بەڵام بە بۆچوونی ئەوان ئێمە بە دوژمن لەقەڵەم دەدرێین.

من و فریدریك و مالکولم زۆر کفت و ماندووین. لە ماوەی ئەم چەند ڕۆژەدا سەبارەت بە داعش بەگوێرەی پێویست شتمان بیستوە و بینیوە. پێمان باشە سبەینێ بەرەو سنووری تورکیا بە ڕێ بکەوین، بەڵام بەداخەوە میواندارەکانمان بۆچوونێکی دیکەیان هەیە. ئەوان باس لەوە دەکەن کە بۆ گەڕانەوە بۆ شاری ڕەققە پێویستمان بە شۆفێرێکیتر هەیە، کە پەیداکردنی تا سبەینێ کارێکی سەخت و دژوارە و نادۆزرێتەوە.

فریدریك به بۆڵەبۆڵێکەوە دەڵێت: "ئێوە دەتوانن بە ٣٠٠ پیاو موسڵ کۆنترۆڵ بکەن، بەڵام ناتوانن تاکوو سبەینێ یەك شۆفێر پەیدا بکەن؟" ئەبولوت، کە هەمیشە بە ئارامی وەڵام دەداتەوە دەڵێت: ئەمە مانای بێڕێزیکردن نییە. دەبێت بە سادەیی وەری بگرین.

دەگەڕێینەوە بۆ نێو کابینەکەمان. هیچ یەکێکمان چاوەڕێ نەبووین گەشتەکەمان هێندە درێژە بکێشێت، هەر بۆیە چیتر جلوبەرگی پاکمان بۆ لەبەرکردن پێ نەماوە. جلوبەرگەکانمان لە تەوالێت دەشۆین و بۆ ماوەی کاتژمێرێك لەسەر سۆپا دایدەنێین تا وشك دەبێتەوە، دواتر لەبەری دەکەین.

ئەبوقەتادە و ئەبولوت دیسان بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك ئێمە بە تەنهایی بەجێ دەهێڵن. هەڵبەتە بۆ کڕینی خواردن ئێمە لەگەڵ خۆیان دەبەن. دەچینە نێو مارکێتێکەوە ئەو شتانەی کە پێویستمان پێیەتی دەیکڕین. ئێمە لە بیری شتێکیتر داین، بەڵام ئەبوقەتادە بە بەڵێی ئێمە پیتزایەك دەکڕێت، کە زۆر تامی ناخۆشە، تەنانەت بە سۆسی تەماتەکەشییەوە قابیلی خواردن نییە.

دوای ئەوەی من و مالکولم دەچین بۆ خەوتن، فریدریك هۆشمەندانە لەگەڵ ئەبوقەتادە دادەنیشێت. پەیوەندیی نێوان ئێمە و داعش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بە شێوەیەکی ترسناك خراپتر دەبێت. فریدریك هەوڵ دەدات کەمێك پەیوەندییەکە ئاسایی بکاتەوە. کێ دەزانێت ڕەنگە بە دەردمان بخوات.

ئەبوقەتادە و فریدریك سەبارەت بە بەرتیلخۆرییەکانی بەرەی نوسرە و گروپە شۆڕشگێڕە بەهێزەکانی سووریا قسە دەکەن. هەروەها دەربارەی ئەوەی کە تا چەندێك ئەو چیرۆکە ڕاستە، کە گوایە ئەمریکییەکان لە ئەبوەت ئاباد لە دژی ئوسامە بن لادن سوودیان لە هێزی دەریایی وەرگرتووە. هەر هێندەی کە باسوخواسی تیۆری پیلانگێڕیی دێتە پێشەوە، فریدریکیش دێت بۆ ئەوەی بخەوێت.

## ڕۆژی حەوتەم

**هەینی، ١٢ـی دیسامبەری ٢٠١٤**

بەیانی ڕۆژی دواتر لە شوێنێکی زۆر نزیک لە ئێمەوە دەنگی تەقینەوەی بۆمبی گەورە دێت. ئێمە لەنێو کیسە خەوەکانماندا ڕاکشاوین. بەدوای یەکدا دەنگی پێنج تەقینەوەی گەورە دەبیستین. تەواوی خانووەکەمان دەلەرزێ. دەبوو ئەمەمان بەسەر بێت! لە جێی ئەوەی بۆ ماڵەوە بچین تازەبەتازە شوێنمان لێ خۆشکردووە و لە جێگەی خۆمان دانشتووین و ئەمریکییەکانیش شارەکە بۆردومان دەکەن.

ئەمڕۆ هەینییە، ئەو ڕۆژەی کە لە ئیسلامدا پشووە. دەمانەوێت بۆ نوێژی هەینی بچین، بەڵام پێش ئەوە جارێکیتر دەچینە بازاڕێ. خۆشبەختانە ئەمریکییەکان بۆردومانی بازاڕ ناکەن، هەمیشە لەنێوان کاتژمێر ٩ بۆ یازدەی بەیانی ئەم بازاڕە قەرەباڵغ دەبێت. ئێمە بۆ خۆمان چەرەس، قاوە و کشمیش دەکڕین. لەگەڵ کوڕێکی لاودا دەربارەی فوتبۆڵ قسە دەکەم. چەند کەسێك لە دەوروبەرمان کۆدەبنەوە، بەڵام پێش ئەوەی ژمارەیان زیاد بکات ئێمە بەجێیان دەهێڵین. هەموویان بە ڕووخۆشییەکەوە بەدوای یەکدا دەستمان بۆ ڕادەوەشێنن.

کەمێك پێش ئەوەی نوێژی هەینیی دەست پێ بکات تەواوی دوکانەکان دەڕابە و دەرگاکانیان دێننە خوارێ و هەموویان بەرەو مزگەوتی گەورە بە ڕێ دەکەون. مزگەوت هێندە پڕ بووە زۆرێك لە دەرەوە چاکەت و جامانەکەیان لەسەر زەوی ڕادەخەن بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بکەن. زۆر نابات ژمارەیان دەبێتە چەند سەد نەفەرێك. دیسان لەنێوان ئەو خەڵکەدا چاوم بە کوڕێك دەکەوێت بە دریسی ئێف، سی، بایرن مونیخەوە، ژمارە ١٠ی "ئاریانی ڕۆبنی"[٩٤] "بێ دین"ـی لەبەر کردووە. ئای لەم دنیایە چەندە بچووکە!

94 Arjen Robben

وادیـاره کامێرامـانی فریـدریك هەنـدێك لـە نوێـژخوێنان نارەحـەت دەکـات، بـە سەرسوورمانەوە تەماشای فریدریك دەکەن. ئەبولوت پێیـان دەڵێـت دەبێـت بیریـان لای نوێژەکەیان بێت. فریـدریك دەچێتە سـەر دۆڵمشـەکە بـۆ ئـەوەی باشـتر بتـوانێ گرتـەی ڤیدیۆیی تۆمار بکات.

نوێـژخوێنان دەبێـت گـوێ لـە وتـارێکی شـەڕخوازانە بگـرن، کـە لـە لایـەن هێزەکـانی داعشەوە پێشکەش دەکرێت، لێرە بەشێك لەو وتارە دەنووسمەوە:

ئێمە دەست بەسەر "دیمەشق"دا دەگرین. ئێمـە لـە مەککـە و مەدینـەش نیشـتەجێ دەبین. ئێمە قوستەنتینییەش کۆنترۆڵ دەکەین. ئـەمڕۆ ڕیاکـاران تـەواوی هـەوڵی خۆیـان خستە گەڕ بۆ ئەوەی دەوڵەتی ئیسلامی نابووت بکەن. چونکە ئەمڕۆ هەموو جیهان باش ئەوە دەزانێ، کە دەوڵەتێکی ئیسلامی دامەزراوە. هەربۆیـە ئـەوان بـۆ بەریـەرەکانی ئـەم دەوڵەتە و سەربازەکانی هیچ درێغییان نەکردوە، بـەڵام لـە بڵاوکردنـەوەی پروپاگەنـدەی خراپ زیاتر نەیانتوانیوە هیچ کارێك بکەن.

خوایە، کافران، مولحیدەکان، ڕیاکاران تێك بشکێنی.

خوایە، ئەمریکا سەرەوژوور بکەی، بەو شتەی کە لە ئاسمان و زەوییەوە دەیبارێنی.

خوایە، فڕۆکەکانی ئەمریکا سەرنوقم بکەی.

خوایە، کەشتییە جەنگییەکانی ئەمریکا نوقم بکەی.

خوایە، یارمەتی چەکدارە خزمەتکارەکانی خۆت بدە بۆ ئـەوەی بتـوانن ئـەمریکا تێـك بشکێنن.

خوایە، دیکتاتۆرەکان و مولحیدەکان تەفروتونا بکەی.

خوای بەرز، تەواوی کـافران نـابووت بکـە و مەهێڵـە کەسـیان بـە سـەلامەت ڕزگاریـان بێت."

دوای تەواوبوونی نوێژی هەینی هەمووان بەرەو سەر کارەکانیان بە ڕێ دەکەون، ڕیزی نوێژخوێنان تێکەڵ بەیەك دەبن. بەدوای دوکانێکی ئاومیوەدا دەگـەڕێین. کـوڕێکی لاو لـە تەنیشتمان دادەنیشێت. جلێکـی سـەربازیی قـاوەیی ڕۆشـنی لەبەردایـە و بـە جلەکانیـدا

دەردەکەوێت کە پۆلیسی "ئەمر بە چاکە"[95]یە. ئەو هاوڕێی ئەبولوتە و زۆر بە چاکیش ئەڵمانیی قسە دەکات. هێندە جوان بە ئەڵمانی قسە دەکات گومانم نییە لەوەی کە ئەڵمانی بێت، بەڵام ئەو نایەوێت سەبارەت بەم مەسەلەیە هیچ قسەیەك بکات، پێش ئەوەی پرسیاری زیاتری لێ بکەین بەجێمان دەهێڵێت و دەڕوات.

دواتر پاسەوانەکانمان ئێمە دەبەنە ڤێلایەکی زۆر خنجیلانە و جوان، کە بۆردومان کراوە. لەو کاتەوەی کە ئەمریکییەکان بۆردومانیان کردووە بیناکە ڕەوخاوە و تەنها خەڵکی بێلایەن تێیدا نیشتەجێ دەبن. هەڵبەتە لە نزیکی ڤێلاکە سەربازگەیەکی داعشیش هەیە. پێم وابێت بە هەڵە هێرش کرابووبە سەر ئەو شوێنە. خانووەکەی تەنیشتی ڤێلاکەش دەبینین، کە ئەمریکییەکان بۆردومانیان کردووە. لەم شوێنە خەڵکانێکی زۆری بێلایەن کوژراون. جا ئەمریکییەکان چیتر ستراتیژی خۆیان دەگۆڕن و تەنها بەرەکانی پێشەوەی جەنگ بۆردومان دەکەن.

لە ڕێگا باسی پیر ڤۆگیل[96] دێتە پێشەوە. ئەبولوت دەڵێت: "پیاوێکی گاڵتەچییە. ڤۆگیل لاسایی سەلەفی و لاسایی موسڵمانی ڕاستەقینە دەکاتەوە، بەڵام ڕاستییەکەی بەو شێوەیە نییە. ئەو هەوڵ دەدات دیموکراسی و ئیسلام پێکەوە گرێ بدات. بەڵام لە ڕاستیدا شتی لەم جۆرە نییە. ئەو دەبێت سەرقاڵی کاری خۆی بێت و کۆچ بکات. هیچ میانڕەوییەك نەماوەتەوە. ئیسلام بە ئاشتیی ڕاست نابێتەوە! ڤۆگیل یان لەمە حاڵی نەبووە یان دەیەوێت وەك سەلەفییەکی بەناوبانگی ئەڵمانی، لە ئەڵمانیا بە گەرم و نەرم بمێنێتەوە." ئەبولوت پێی وایە بۆچوونی دووەمیان ڕاستە.

ئەبولوت و ئەبوقەتادە و ئەوانیتریش زۆر برسین. چیزبەرگریان دەوێت. ئێمە حەزمان لە چیزبەرگر نییە، بەڵام لەگەڵیان دەڕۆین. هەرچەندە دەبێت لە ڕۆژانی هەینیدا دوای نوێژ زۆرێك لە دوکانەکان دابخرێن، بەڵام چەکدارەکانی داعش جیاوازن و دوکانی تایبەت

---

٩٦- امر بالمعروف، داعش گروپێکی پۆلیسی بەناوی (ئەمر بەچاکە) دروستکردووە.

96 Pierre Vogel

بۆ چەکداران تەرخان دەکرێت. ئەو چەند دوکانەی، کە چیزبەرگر و فینگەر و کۆکاکۆلا دەفرۆشن کراونەتەوە .

من دەڵێم نازانم خواردەمەنیی فاست فودی[97] دەبێت چ پەیوەندییەکی بە ژیاننامەی چوار خەلیفەکەوە هەبێت. ئەبولوت بە بێدەنگی پێ دەکەنێت. ویستم ئەم پەندە بڵێمەوە: "تۆ هەر ئەو شتەی وا دەیخۆیت"[98] ، بەڵام دواتر خۆم دەگرم و نایڵێم. چونکە داعشەکان زۆر حەز بە رەخنەکانی ئێمە ناکەن. من و فریدریك و مالکولم لە پێش دوکانەکە رادەوەستین. چونکە بۆ ئێمە چیزبەرگر شتێکی زۆر خۆش و بە لەزەت نییە.

ئاشکرایە بەرنامەی ئەمڕۆی ئێمە کۆتایی پێهات. بۆ شوێنی مانەوەمان دەگەڕێینەوە. من وەسفی شۆفێرە موسڵییەکەمان دەکەم و دەڵێم بە درێژایی گەشتەکەمان رەفتاریان لەگەڵمان زۆر دۆستانە بووە. لەبەرانبەردا ئەو پێمان دەڵێت من تەنها وەزیفەی خۆم ئەنجام داوە. من پرسیاری لێ دەکەم، ئەگەر دەوڵەتی ئێراق دیسانەوە ئەم ناوچانە رزگار بکات ئەوکات چی دەکات. ئەو وەڵام دەداتەوە و دەڵێت لەگەڵ براکانمان دەچمە بیابان و لەوێ دیسان خۆمان پڕچەك دەکەین و چاوەڕێ دەبین تا دەرفەتێك دەگونجێ. ئەوکات دیسانەوە دەگەڕێینەوە. پێشتر و بەر لە داعش چەند گروپێکیتر ئەم کارەیان کردبوو" لەوانە دەوڵەتی ئیسلامی ئێراق[99]. ئەوان بە هێز و توانایەکی زۆرترەوە گەڕابوونەوە. ئەوان هەرگیز گۆڕەپانەکە چۆڵ ناکەن.

کاتێك دێینەوە شوێنی حەوانەوەمان، هاوڕێ پاسەوانەکانمان زۆر نیگەرانن. دوو فڕۆکەی بۆمبڕێژی ئەمریکی رێك بەسەر ناوچە گەشتیارییەکەدا دەسوورێنەوە. کەموکوت لە ئاستەکانی خوارەوەشدا دەفڕن. وەك بڵێی بەدوای ئەو ئامانجەدا دەگەڕێن، کە بە نیازن بۆردومانی بکەن. چەکدارەکان بە پەلەپەل بە دەوروبەری خۆیاندا دەسوورێنەوە و لە دوی پەناگایەك دەگەڕێن، بەڵام هیچ پەنایەك پەیدا نابێت. ناکرێ پەنا بۆ کابینە

---

97 Fast food

98 You are what you eat!

99 ISI

دارزاوەکانیش ببڕێت. ئەبوقەتادە بە دەوری دیواری کابینەکاندا دەسووڕێتەوە و لەپەسا چاو لە ئاسمان دەکات و دواتر لە بەرچاومان ون دەبێت.

فڕۆکەوانەکان زۆر دەمێکە ئێمەیان بینیوە. من بۆ خۆم پێشتر فڕۆکەوانی فڕۆکەی وەرزشی بووم، دەزانم لەو سەربانەوە بێ دووربینیش هەموو شتەکان دەبینرێت ئاشکرایە، ئەمانە دووربینی پێشکەوتووشیان پێیە. ترس دامان دەگرێت. خەریکم بیر لەم ڕستەیە دەکەمەوە: ئەگەر گوێت لە دەنگی مووشەك بوو ئەوە بزانە تۆ مردووی. تا دێت فڕۆکەوانەکان بازنەکانیان بچووکتر دەکەنەوە و دادەبەزنە خوارێ. من و فریدریك و مالکولم ڕەنگمان پەڕیوە و بێقەرارین. بێگومان سەرنشینی فڕۆکەکان چاویان لێ بووە، کە لە ترۆمبێلەکەی ئێمەوە چەکیان هێناوەتە خوارێ. باشە ئێستا چی بکەین؟

لە گۆڕەپانێکی فوتبۆڵ، کە زۆر لە ئێمەوە دوور نییە، گەنج و پیاوە بەتەمەنەکان سەرقاڵی یارییکردنن. ئەوان گوێ بە فڕۆکە بۆمبڕێژەکان نادەن. ئەمە شوێنێکی باشە ڕەنگە بتوانێ ئێمە ڕزگار بکات، چونکە ئەمریکییەکان گۆڕەپانی فوتبۆڵ بۆردومان ناکەن. بە شڵەژاوییەوە بەرەو لای گۆڕەپانی فوتبۆڵەکە ڕادەکەین. بە ئاسوودەیی لە کەناری گۆڕەپانی یارییەکە دادەنیشین.

یەکێك لە فڕۆکە بۆمبڕێژەکان دێتە خوارەوە و بەرزییەکەی کەمتر دەکاتەوە. ڕێك لە ئاسمانی بان سەرمان ڕادەوەستێت. بەردەوام بە شڵەژاویی چاو لە ئاسمان دەکەم. لەگەڵ ئەوەی کە دنیا تاریکی دەکات یەکڕاست دەچینەوە نێو کابینەکەمان. گوێمان لە دەنگی فڕۆکەکانە کە بە ئاسماندا دەسووڕێنەوە، پاشان دەنگی ناخۆشی چەند مووشەکهاوێژێك دەبیستین. ئەم فڕۆکە تۆقێنەرانە کەی گوڕیان ون دەکەن و لێمان دووردەکەونەوە؟

بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك پەیوەندیمان لەگەڵ هاوکارە داعشییەکانمان دەپچڕێت. مالکولم دەچێتە کابینەکەی تەنیشتمان، بۆ ئەوەی بپرسێت ئێمە چی بکەین. ئەو تەنها ئەبولوت و یەکێك لە شۆفێرەکان دەبینێت. ئەوانیتر بەرەو ناوەندی شار هەڵاتوون، ڕاکردن بۆ ناوەندی شار بیرۆکەیەکی خراپ نییە، بۆ ئەوەی مرۆڤ لە مەترسی

بۆمبڕێژەکان دوو ربێت. وا دیارە هاوکارەکانمان خەریکی بەرنامەڕێژین بۆ ئەوەی سبەینێ بگەڕێینەوە. ئەبولوت ئامۆژگاریمان دەکات، دەڵێت بۆ ئەوەی لە مەترسیی فڕۆکەکان دوور بن، باشتر وایە لە نێو کابینەکەتاندا بمێننەوە .

دەنگی فڕۆکەکان هێندە بەرزە تەنانەت دەزگا گەرمکەرەوەکانیش دەخاتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە، ئەو دەزگایانەی لەبەر ئەوە دامانگیرساندوون تا گوێمان لە دەنگی فڕۆکەکان نەبێت. بەردەوام بە خۆمان دەڵێین هەر چرکەیەك ئەگەری ئەوە هەیە هەموو شتێك کۆتایی پێ بێت. زۆر هەست بە بێچارەیی و بێپەنایی دەکەین. ژیانی ئێمە لەژێر دەستی مرۆڤێکی ترسنۆك دایە، ئەو مرۆڤەش لە ژوورێکی کۆمپیوتەریی وڵاتێکی دوورەدەست دایە.

پاشان ئەبولوت دێت و ئامۆژگاریی ئێمە دەکات، کە لە کاتی هێرشکردندا لەنێو خانووەکانماندا بمێنینەوە و نەچینە دەرێ. بەم نزیکانە شەش ئافرەت کوژراون، چونکە لە ترسان بەسەر شەقامەکاندا ڕایان کردووە. لە ڕێگەی فڕۆکە ئەلیکترۆنییەکانەوە و بە بەکارهێنانی دووربینی تیشکی ژێر سوور توانراوە ئەو ئافرەتانە بناسرێنەوە و بکرێنە ئامانجی مووشەکەکان. ئایا بە ڕاستی دنیای ڕۆژئاوا ئاگای لەوەیە چی لێرە دەگوزەرێت؟

پرسیار لە ئەبولوت دەکەم بۆچی لەم چەند ڕۆژانەی دواییدا مەودایەکی زۆر کەوتووەتە نێوانمانەوە. لە سەرەتاشدا ڕوون و ئاشکرابوو، کە من هاوڕای کردەوەکانی داعش نیم. ئەبولوت هەوڵ دەدات بۆچوونی داعشمان بۆ ڕوون بکاتەوە: "دەی دواجار ئێوە کافرن. تۆ باوەڕت بە ئیسلامی ڕاستەقینە نییە، بەڵام هەڵە و بێڕێزیشت پێ نەکراوە." وادیارە چەند شتێکیتر هەیە، کە لە ڕەخنەکانی من زیاتر ڕێگرن لە دین. ئەم فاکتەرە بێزارکەرانە هەمیشە هەیە. ئەبولوت دەڵێت تەنانەت بێزارە لە ئەندامانی خێزانەکەشی، لەبەر ئەوەی ئەوانیش خاوەنی ئیمانێکی ڕاستەقینە نین. "خۆشەویستی خوا لە هەموو شتێك گرنگتر و باشترە." باوکی پێی وایە موسڵمانە، بەڵام هاوکات باوەڕی بە دیموکراسیش هەیە. "شتی وا نییە، تۆ ناکرێت پابەندی دەستوور بیت و

لەهەمان کاتدا باوەڕت بە خواش هەبێت، لە کاتێکدا یاساکانی خوا جیاوازە لە دەستوور، کە مرۆڤ دایڕشتووە."

جگە لەمە بێمتمانەیی لەنێو داعشدا زۆرە. ئەم بابەتەش لەوێوە سەرچاوە دەگرێت کە دەزگای هەواڵگریی شاراوە لەنێو داعشدا هەیە و ئەوانە بە شێوەیەکی بەرنامەبۆدارێژراو و ڕێکخراو بۆ نێو ڕیزەکانی داعش نێردراون. زۆرێك لەو دەزگایانەش سووریین. هەربۆیە پەیداکردنی کۆمەڵێکی یەك دڵ و هاوپەیمان سەخت و دژوارە. تەنها بە ناوبژیی و نێوانگیریی تەواوی کارەکان پێش دەڕوات. خەڵکیش هەندێك جار خیانەت لە داعش دەکەن. خەڵکی ناوچەکانی دەورووبەری حەلەب لەگەڵ بەرەی ئازادی سووریا دەستیان تێکەڵ کردبوو و بە دەستی خاڵی لەگەڵ داعش شەڕیان دەکرد. ژمارەیەکی زۆر لە چەکدارانی داعش لەوێ دەستگیر کران. ئێمە دوژمنمان گەلێك زۆرە .

لە دیدی ئەوانەوە من دوژمنم. ئەوان جارێکیتر دەتوانن بۆچوونەکانی ئێمە لەسەر داعش بە شێوەی نووسین بخوێننەوە. هەموو ڕۆژێك لەگەڵ دوژمن، لەگەڵ دوژمن گەشتکردن، لەگەڵ دوژمن نانخواردن و لەسەر زەوییەك خەوتن، بە ڕاستی هەرسکردنی شتی لەم جۆرە کارێکی ئاسان نییە.

ئەگەر ئەبولوت کۆمەڵە هاوڕێیەکیتری دۆزیبایەتەوە، مرۆڤێکی نازەنین دەبوو. ئەوکات هەرگیز لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای داعش ئاشنا نەدەبوو، بەڵام ئەو لەم باروردۆخەدا خەریکە بەرگری لە هەڵیتوپەڵیتەکانی داعش دەکات، ئەو هەڵیتوپەڵیتانەی، کە هاوڕێکانی دەرخواردیان داوە. بۆ نموونە کۆمەڵێك شتی بێمانا سەبارەت بە ژنان. هەرچەندە ژنەکان توانای زۆرباشیان تێدایە، بەڵام لەڕووی جەستەیی و ڕۆحییەوە کەموکورتییان هەیە. هەر بۆیە لە دەوڵەتی ئیسلامییدا گەواهی دوو ژن یەکسانە بە شایەتیدانی پیاوێك. وا باشترە ژنەکان لە ماڵەکانی خۆیاندا بمێننەوە و نەیەنە دەرێ. بەو جۆرە زۆر پارێزراون و هیچ کەسێك ناتوانێت ئازاریان پێ بگەیەنێت. ئەم دیدگایە چەند سەدەیەك پێشتر لە ڕۆژئاواش باوبووە.

دەوروبـەری کاتـژمێر دەی شـەو، ئـەبولوت بـێ ئـەوەی یـەك وشـە بڵێـت چێشـتی ئێوارەمان بۆ دەهێنێت، بریتییە لە مریشکی سوورەوەکراو. بە هـەر جۆرێك بـووە هـەوڵ دەدات تـا چـرکەکانی کۆتـایی ڕۆڵـی میوانـدارێکی بـاش بگێڕێـت و خزمـەتمان بکـات. ئەگەریش بە لایەوە سەخت بێت. کـاتی ڕۆشـتن بـە فریـدریك دەڵێت ئـەو ئیمەیڵـەی کە لەسەر کاغەزێك بۆت نووسیم، مـن بـۆ ڤـالری خوشـکتم هـەنارد، دواتـر زانیمـان کـە ئـەم ئیمەیڵە نەگەشتووەتە دەستی ڤالری و ماڵەوەمان، هەربۆیە ماوەیەك خەریکی شـینگێڕان بوون بۆ ئێمە .

## ڕۆژی هەشتەم

**شەمە، ١٣ـی دیسامبەری ٢٠١٤**

کاتژمێر هەشتی بەیانی خۆمان بۆ گەڕانەوە ئامادە دەکەین و لـە کابینەکـەمان دێینـە دەرێ. ئەگەر هەموو شتەکان بە باشـی پـێش بـڕوات بـە پێـنج کاتـژمێر دەگەینـە شـاری ڕەققە. بڕیارە لەوێ مۆبایل و ئایپادەکانمان وەربگرینەوە و بەرەو سنووری تورکیا بە ڕێ بکەوین. هیوادارم پێش ئەوەی شەومان بەسەردا بێـت بگەینە ئەوێ. ئەو حسـابەی ئێمـە کردمان کەمێك گەشبینانەیە، بەڵام هیوادارم ڕاست دەربچێت. لە ڕاستیدا ئێمە ویسـتمان دوو ڕۆژ پێشتر بە ڕێ بکەوین.

تاکەکەوشـی پێـی چـەپم ون بـووە و هەرچـییەکەم پەیـدا نابێـت، لەبـەر ئەمـە سەفەرەکەمان نیو کاتژمێر دوا دەکەوێت. دوێنێشەو کەوشـەکەم وەك هەمیشـە لـە پـێش دەرگای کابینەکـەمان دانـابوو، بـەڵام ئێسـتا تـاکێکی ون بـووە. مـن و فریـدریك تـەواوی حەوشەی دەوروبەرمان دەگەڕێین، بەڵام تاکەکـەوش پەیـدا نـابێ و نـابێ. ڕەنگـە گـورگ کەوشەکەی بردبێت، یان نا دەکرێ کەسێك بەم جۆرە گاڵتـەمان لەگـەڵ بکـات؟ مـن ئـەم کەوشانەی خۆم زۆر خۆش دەوێن و زۆریش حەزم لێیانە، چونکە ژێـر پێیـەکانی تایبـەتن بە ڕێکردن و بۆ پیـادەڕۆیی زۆر خۆشـن. ئەگـەر ئـەم پێڵاوانـە نەبووایـە مـن سـاڵی ٢٠١١ نەمدەتوانی لـە لیبیـا حـەوت کاتـژمێر بـە شـەوان بـەناو بیابانـدا پیـادەڕۆیی بکـەم. ئـەو

پیادەڕۆییەی، کە ئێمەی لە دەستی چەتەکانی قەزاق ڕزگارکرد. خۆشبەختانە جووتێك پێڵاوی ترم پێیە.

گروپەکەمان بەسەر دوو ترۆمبێلدا دابەش دەبن. من، فریدریك، مالکولم، ئەبولوت و دوو شۆفێری سەروچاوداپۆشراو، کە خەڵکی ڕەققەن بە دۆڵمش دەچین، ئەبوقەتادە و چەکدارێکی ئێراقی داعش بە جێبێکی خۆڵەمێشی بە ڕێ دەکەون. ترۆمبێلی سێیەم لۆرییەکی زەردی بچووکە، بۆ گومڕاکردنی فڕۆکەکان، کە ئەمڕۆش بە ئاسماندا دەسووڕێنەوە، لەگەڵمان بە ڕێ دەکەوێت. ترۆمبێلەکان لەپەسا پاش و پێش دەکەن و جێگۆڕکێ دەکەن. بە زۆریی چەند سەد مەترێکمان لەنێواندایە. دەبێت زۆر وریابین. شۆفێرەکە و ئەوەی تەنیشتی چەند جارێك جامی ترۆمبێلەکە دێننە خوارێ و تەماشای ئاسمان دەکەن. باران دەبارێت، بەڵام بارانیش لە بەردەم فڕینی ئەم فڕۆکانەدا نابێتە بەربەست.

هەموومان بێدەنگیمان هەڵبژاردووە. بەس جار جارە لەگەڵ ئەبولوتدا قسەوباسێك دەکەین. ئەبولوت پێی سەیرە لە ئەڵمانیا خودی سەرکۆمار پشتگیریی لە ئۆپەراسیۆنی فراوانتر لە دژی داعش دەکات. پەیامی ئەبولوت بۆ یوئاخیم گوك[100] ئەمەیە: "ئەگەر بیرۆکەی هێرشکردنە سەر داعشت لە سەردایە، ئەوە گۆڕ بۆ سەربازەکانت هەڵدەکەنیت!"

ئەو بە ئارامییەکەوە بە من دەڵێت: "حەق بە ئێوەیە، ئێمە بێبەزەیین، چونکە ئەم کارانە بە ئاشکرا دەکەین، بەڵام ئێوە بە نهێنیی و ژێربەژێر ئەو کارانە دەکەن. ڕەنگە داعش ٣٠٠٠٠ ئێراقی کوشتبێ، بەڵام خۆ جۆرج بۆش ٥٠٠٠٠٠ کەسی ئێراقی کوشتووە."

داعش لە ئێراق لەلایەن خەڵکی ئێراقەوە باش پێشوازیان لێ کراوە و دانیان پێدا نراوە، بەڵام وەك دیارە لە ڕەققە بەو جۆرە نەبووە. لەو شارە تا ئێستاش ئەسەد هەواداری لە داعش زیاترە، ئەگەر هەر ئێستا لەو شارە هەڵبژاردن بکرێت، ئەوە ئەسەد دەیباتەوە و زۆرترینی دەنگەکان بەدەست دەهێنێت. ئەو بە هۆشیارییەوە تا ئێستاش

---

100 Joachim Gauk

مووچەی خانەنشینکراوەکانی شاری ڕەققە دەدات. جگە لەمە ئەو یاسا و داواکارییانەی کە ئەسەد لە خەڵکی دەیەوێت سووك و ئاسانترە لەو شتانەی کە داعش لە خەڵکی داوا دەکات، بەم هۆیەوە شتێکی ئاساییە ئەگەر ئەوان ئەسەد بە باشتر دابنێن و هەڵی بژێرن. بەوپەڕی سەرسامییەوە گوێ دەگرم. زۆر باشە کە فریدریك و مالکولم وەکوو شایەت لە تەنیشتم دانیشتوون و ئەم قسانە دەبیستن.

کۆنترۆڵکردنی موسڵ ئۆپەراسیۆنێك بوو، کە ماوەیەك لەوەوپێش بەرنامەڕێژیی بۆ کرابوو. "ساڵەهای ساڵ بوو ئێمە لە موسڵ کردەوەی خۆکوژی و تەقینەوەیەکی زۆرمان ئەنجام دابوو، بۆ ئەوەی کەس لە موسڵ هەست بە ئاسایش نەکات" لەپەسا لەو شارە چالاکی، هێرش و پەلاماردانمان ئەنجام دەدا. "تەنانەت تێکۆشەرەکانمان بۆ خۆتەقاندنەوە دەنارد بۆ ڕێوڕەسمی پرسە و سەرەخۆشییەکانیشیان. سەرئەنجام شیعەکان ترسیان لێ نیشت و بەم جۆرە توانیمان بە ئاسانی شاری موسڵ کۆنترۆڵ بکەین."

دواتر ئەبولوت جدیی دەبێتەوە و دەڵێت: "بانگهێشتکردنی ئێوە لەلایەن بەرپرسە باڵاکانەوە بووە، ئێمە دەمانەوێت لە ڕێگەی ئێوەوە ڕێگایەك بۆ ڕۆژئاوا بکەینەوە. بەمزووانە لە مەبەستمان تێدەگەیت لەبەر چی." من دەڵێم شەرمەزارم، کە بژاردەیەکی زۆر پەسەند نیم بۆ ناوبژیی و نێوانگیریتان. بۆچوونەکانمان زۆر لە یەکترەوە دوورن. ئەبولوت دەڵێت هیچ زیانێکی نییە، تەنها ئێمە زیاتر دەکات. لە وەڵامیدا دەڵێم: "لای ئێوە ڕەنگە، بەڵام لای ڕۆژئاواییەکان نەخێر"، چونکە پێشتر لە ڕێگەی ئەو هەوڵانەی کە بۆ نێوانگیریی خستومەتە گەڕ، ئەمەم ئەزموون کردووە. ئەو کەسەی لەگەڵ دوژمندا دەکەوێتە گفتوگۆکردن، هەر زوو لە ڕۆژئاوا بە خیانەتکار یاخود بە (دوژمنناس) ناودەبرێت، لە ڕۆژئاوا ئەم دەستەواژەیە بۆ خۆی دەستەواژەیەکی تازەباوە، دوژمنناس بە مانای کەسێك دێت، کە باشتر لە دوژمن تێدەگات. ئەبولوت دەڵێت: "بەو جۆرەی کە من تۆ دەناسم، بۆ تۆ هیچ گرنگ نییە."

دوای ئەوە هاوکاریی شۆفێرەکەمان دێتە قسە و دەیەوێت بزانێت بۆچی من موسڵمان نابم. من لە هەموو مەسیحییەکانی تر خراپترم. چونکە ئەوان بە ئیسلام ئاشنا نین، بەڵام من لەوان باشتر ئیسلام دەناسم و لە ئیسلام تێگەیشتووم، کەچی بۆ موسڵمانبوون کەمتەرخەمی دەکەم و بڕیاری موسڵمانبوون نادەم.

شۆفێرە دەموچاوداپۆشراوەکەمان بۆ گرفتارنەبوون لە ڕێبەندان مەسیرەکەی دەگۆڕێت و دەچێتە سەر جادەیەکی لاوەکی و ترۆمبێلەکەمان لە قوڕولیتەدا گیر دەکات. دوای کاتژمێرێك تازەبەتازە دەتوانین دۆلمشەکە دەربێنین.

کاتی چوونە سەر جادە گشتییەکە دووبارە ترۆمبێلەکەمان لە قوڕولیتەدا گیر دەخوات. هەوڵ دەدەین سوود لە هاوکاریی چەند کەسێك وەربگرین، بۆ ئەوەی دۆلمشەکە دەربهێنین. پیاوێکی بەتەمەن بە دەنگی بەرز هاوار دەکات: "ئێمە لێرە لە دەوڵەتی ئیسلامی داین. لێرە هەموومان یەککگرتووین. ئێمە پێکەوە بەهێزین. ئێمە دەتوانین." یەکێکیتر دەڵێت لە جێی ئەوەی لێرە هاتوهاوار بکەیت، بچۆ سیمی ڕاکێشانەکەت بێنە بۆ ئەوەی دەریبهێنین. کابراش ئەم کارە دەکات و ترۆمبێلەکەمان بە ڕێ دەکەوێت، بەڵام گەشتەکەمان زۆر دوادەکەوێت.

پەیوەندیی دەزگای بێسیمی شۆفێرەکەمان لەگەڵ ئەبوقەتادەدا دەپچڕێت. لە تەنیشت جادەکەوە چاوەڕوان دەبین، بەڵام سەروکەللەی ترۆمبێلی دووەم پەیدا نابێت. دەبێت بگەڕێینەوە، نەوەکوو شتێکیان بەسەر هاتبێت. پیاوە سەروچاوداپۆشراوەکە لە دەزگاکەوە لەپەسا دەڵێت: "ئەبو قەتادە! ئەبوقەتادە!"، بەڵام بێ وەڵامە. دەمانچەکەی هەڵدەگرێ و میلی دێنێتەوە. ئێستا چی ڕوو دەدات؟ لەناکاو ترۆمبێلەکەی ئەبوقەتادە لە کەنار جادەکە دەبینین، ترۆمبێلەکەیان پەنچەر بووە. دیسان چاوەڕوان دەبین.

ئەبولوت بەسەرهاتی هاوڕێیەکی دەگێڕێتەوە، کەوا کەنیزەکێکی کڕیوە. کەنیزەکەکەش ژنێکی ئێزیدی بووە و قەدوباڵای هێندە جوان نەبووە. هاوڕێکەی نمرەی

چواری پێ دەدات، واتە لێی ڕازییە، بەڵام نەك زۆرباش. بەهای ئەو ئافرەتە بۆ هاوڕێکەی زۆر گران بووە، ئەو ناچار کڵاشینکۆفەکەی بۆ دەفرۆشێت. نرخی ژنە ئێزیدییەکە ١٥٠ دۆلاری ئەمریکی بووە. ئەو دەڵێت هاوڕێکەم پارەیەکی زۆری لەسەر خەرج کردووە، ژنەی ناردووەتە لای دکتۆری ددان بۆ ئەوەی دەم و ددانی جوانکاریی بکات، بردوویەتی بۆ ئارایشتگە، بۆ ئەوەی دەستێك بە سەروسەکوتیدا بێنێت. بڕێکی باش پارەی لەسەر خەرج کردبوو. دوای ئەو هەموو جوانکارییە تازەبەتازە نمرەکەی گەشتبووە یەك و دوو. پێتان وایە ئێستا ئەو ژنە چی دەکات؟ خۆی شاردۆتەوە و لە دەستی هەڵاتووە. لەگەڵ ئەوەی داستانەکە بۆ ئێمە زۆر بێمانایە، وەلێ ئەبولوت بە دەنگی بەرز بە بەسەرهاتەکەی خۆی پێدەکەنێت .

فریدریك، کە کۆیلایەتی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بە کارێکی زۆر ناشرین دادەنێت، دەڵێت، چ بەسەرهاتێکی بێمانا بوو! بە ڕای ئەو تەنها کاری کەنیزەکەکە بەبایەخ و سەیر بووە، وانەیەکی باشی بە کابرا داوە .

هاوکاری شۆفێرەکەمان دەیەوێت لەگەڵ شۆفێری لۆرییە زەردەکەدا قسە بکات، بەڵام لەپەسا هەر پێ بە گازدا دەنێت و ئێمە ناتوانین بیگرینەوە. تەنها دەتوانین تا مەودای ١٠ مەتر لێی نزیك بینەوە. شۆفێرەکەمان ڕەماشی بۆ لێ دەدات، بەڵام ئەو ئاوڕ ناداتەوە. هەرکاتێك دەمانەوێت ئۆڤەری بکەین، ئەویش دێتە لای چەپی جادەکەوە. دیسان ڕەماش لێ دەدەین، بەڵام بێسوودە! تا ئەوەی کاسەی تووڕەیی شۆفێرەکەمان پڕ دەبێت، شووشەی ترۆمبێلەکە دێنێتە خوارێ و دەمانچەکەی دەردێنێ و چەند جارێك تەقە بە ئاسماندا دەکات. بەڵام ئەم جارەش بێسوودە و شۆفێری لۆرییە زەردەکە ئاوڕ ناداتەوە. دیمەنێکی زۆر پێکەنیناوییە.

هاوکاری شۆفێرەکەمان دیسان چەند فیشەکێك بە ئاسماندا دەتەقێنێت. هیچ فایدەی نییە، بەڵام ئەم جارەیان لە تێپەڕاندنی لۆرییەکە سەرکەوتوو دەبین. کاتێك دەچینە تەنیشتی دیسان هاوکاری شۆفێرەکەمان چەند جارێك تەقە بە ئاسماندا دەکات، تا ئەوەی دواجار شۆفێری لۆرییەکە ئاگادار دەبێتەوە کە ترۆمبێلەکەی تەنیشتی کێیە. لە

کاتێکدا بە خێرایی بە تەنیشتی لۆرییەکەدا تێپەڕ دەبین، بەڵام شۆفێری لۆرییەکە بە وردی گوێ لە هاوکاری شۆفێرەکەی ئێمە دەگرێت، بۆ ئەوەی بزانێت چی پێ دەڵێت.

کاتێك دەگەینە شاری ڕەققە کاتژمێر هەشتی شەوە. لەبەر دواکەوتنمان چیتر ئەمڕۆ ناتوانین بۆ تورکیا بچین. کابرای سەروچاوداپۆشراو دەڵێت، سبەینێ کاتژمێر شەشی بەیانی دەتوانین لەسەر گەشتەکەمان بەردەوام بین و بەرەو تورکیا بە ڕێ بکەوین.

لە باڵەخانەکەماندا هەموو شتومەکەکان تێکو پێك دراون. دەرگا و پەنجەرەکان شکێنراون. لە هەموو لایەکی خانووەکە وردەشووشە کەوتووە. لێرە چی ڕوویداوە؟ ئەبولوت بە هەردوو دەستی لە چارەی خۆی دەدات. پاشان بە خێرایی دەچێتە دەرەوە، بۆ ئەوەی ببینێت جێگایەکیتر هەیە، کە ئێمە بتوانین ئەمشەو تێیدا بخەوین.

یەکێك لە دراوسێکەمان لە باڵەخانەکە نانمان بۆ دەهێنێت. دوای کەمێك بیرکردنەوە لێ وەرناگرین. پاش چەند چرکەیەکیتر لەگەڵ خاوەنی خانووەکە تەشریف دێنێتەوە. خاوەن خانوو لێمان دەپرسێت ئێمە لێرە چی دەکەین. من دەڵێم: "ئێستا هاوڕێکەمان دێت، هەموو شتێکتان بۆ ڕوون دەکاتەوە"، بەڵام خاوەن خانوو قایل نابێت. بارودۆخێکی ناخۆش دێتە پێشێ. خاوەن خانوو دەپرسێت ئێوە موسڵمانن؟ مالکولم وەڵام دەداتەوە: "کێشەیەك نییە"، بەڵام ئەو بە شتێکیتر تێدەگات. دەڵێت: "ئەگەر موسڵمان نەبن، ئەوە کێشەیەکی گەورەیە..." دواتر بە پەنجەی شایەتمانی ئاماژە بۆ گەردنی دەکات و ئاماژە بۆ سەربڕین دەکات. ئیتر خاوەن خانوو زۆر تووڕە دەبێت.

من بەڵێننامەکەی داعش لە گیرفانم دەردێنم و لە پێش چاوی دایدەنێم. خاوەنخ انوو تا کۆتایی بە وردیی دەست بە خوێندنەوەی بەڵێننامەکە دەکات و ئاماژە بۆ مۆرەکەی داعش دەکات: "دیوانی خەلیفە!، ئۆوووو، کێشەیەك نییە." دواتر تەوقەمان لەگەڵ دەکات.

پاشان بارودۆخی چەند ڕۆژی پێشمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە لێرە چی ڕوویداوە. دوو ڕۆژ پێش هێزە ئاسمانییەکانی ئەمریکا باڵەخانەکەی تەنیشتمانی بۆردومان کردووە و بە تەواویی وێرانی کردووە. دوو کەسیش کوژراون. دەچینە باڵکۆنەکە بۆ ئەوەی چۆنێتیی هێرشەکەمان بە وردیی پێ پیشان بدات. باڵەخانەکە دووکەڵی ڕەشی لێ بەرز دەبێتەوە،

هەروەها نهۆمی سەرەوەی بە تەواویی خاپوور بووە. ئەگەر ئێمە بەپێی بەرنامەکەمان بچووباینە پێشێ، دوو ڕۆژ پێش دەبوو لەم شوێنە بووینایە، بە ڕاستیی ئێمە زیاتر لە دراوسێ سوورییەکەمان بەخت یاوەرمان بووە.

ئەبولوت دوای دوو کاتژمێر دەگەڕێتەوە لامان، شوێنی تری پەیدا نەکردووە. دەبێت شەو لێرە بەسەر ببەین و لێرە ڕۆژ بکەینەوە. بە نائومێدییەوە خۆمان دەچەپێنینە نێو کیسە خەوەکانمانەوە. لە درزی پەنجەرە شکاوەکانەوە سەرمایەکی تەڕ دەڕژێتە ژوورەکەمانەوە. پێش ئەوەی چاومان بچێتە خەو بە بۆچوونی ئەبولوت ڕووداوەکەی یانزەی سێپتەمبەر زیادەڕەویی زۆری تێدا کراوە و شێوێنراوە. ئەو هیوادارە لە ئاییندەیەکی نزیکدا ڕووداوێکی دیکەی لەم جۆرە بەسەر ئەمریکییەکاندا بێت. ئیتر ئەبولوتیشم لەبەر چاو دەکەوێت.

### ڕۆژی نۆیەم

### یەک شەممە، ١٤ـی دیسمبەری ٢٠١٤

کە بەخەبەر دێین کاتژمێر لە هەشت تێپەڕیووە. بڕیار بوو ئەمڕۆ کاتژمێر شەش بە ڕێ بکەوین، بەڵام تا ئێستا شۆفێرەکەمان دیاری نییە. پاش یەک کاتژمێر کە ئەبولوت قاوە و لۆبیا و هوموسمان(Hummus)بۆ دێنێت، تاقەتمان بەسەر دەچێت و دەپرسم: ئاخر کەی بە ڕێ دەکەوین ئەبولوت؟

سەبارەت بە بواری ئازادکردنی جۆن کانتلی پەیامنێری بەریتانیی چەند جارێک پرسیار لە ئەبولوت دەکەم. ئەبولوت بەڵێنم پێ دەدات کە سەبارەت بەم بابەتە لەگەڵ بەرپرسەکانی سەرەوەی خۆی قسە بکات. دواتر بە بیرم دێنێتەوە کە دەوڵەتی ئیسلامی لەبەرچی ڕەزامەندی لەسەر سەفەرەکەی من دەربڕیوە و ئێمەیان بۆ ئێرە بانگهێشت کردووە، ئەو دەڵێت، بۆ ئەوەی پیشانی هەموو دنیای بدەین کە چی لێرە دەگوزەرێت، چونکە دەوڵەتی ئیسلامی تەنها ناوێک نییە، بەڵکوو دەوڵەت و قەڵەمڕەوییەکی واقعییە. هەروەها بۆ ئەوەی خەڵکی بە چاوی خۆی ببینێت کە لێرە ژیان زۆر ئاساییە و خەڵکی

سەرقاڵی ژیانی ئاسایی خۆیانن. لێرە بریندار و نەخۆشەکان بە باشیی تیمار و چارەسەر دەکرێن، لێرە هاوکاریی هەژار و کەمدەرامەتەکان دەکرێت، خەڵکی ئێرە لە دادگا مافی خۆیان وەردەگرنەوە و هەست بە ئارامی دەکەن. تەنانەت ئەوانەشی کە ڕقیان لە ئێمەیە ئەم ئارامی و ئاسایشەیان خۆش دەوێت کە ئێمە بۆ خەڵکمان خوڵقاندووە. ئێمە دەمانەوێت پیشانی بدەین، کە لێرە بە چ شێوازێك دەژین و خەڵك دەتوانێت بەگوێرەی شەریعەتەکەی خوا بژێت، هەروەها ویستمان ئەوە پیشان بدەین کە دەکرێت شەریعەتەکەی خوا بکرێتە بەرنامەی ژیان. من پرسیاری لێ دەکەم: "بۆ خاتری خوا پێم بڵێ لە کام لاپەڕەی قورئاندا هاتووە کە بڵێت تۆ دەتوانی سەری مرۆڤێکی بێتاوان ببڕیت؟" ئیتر ئەبولوت تێدەگات کە من قانع نەبووم.

کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆیە، بەڵام هێشتاکە لەنێو خانووەکەی خۆمان، کە نزیکی مزگەوتی فیردەوسە دانیشتووین. ئەبولوت دەچێت بۆ ئەوەی هەواڵێك بزانێت، پێنج چرکە دوای ئەوە ئەبوقەتادەش دێتە ژوورەوە و بە ڕێ دەکەوین. ئەو شتومەکەکانی فریدریك وەکوو میمۆری و پێداویستییەکانی فۆتۆگرافی دێنێتەوە و پێی دەداتەوە، ئەوانەی کە پێشتر لێیان وەرگرتبوو. بە فریدریك دەڵێت: دە دانە لەو ٨٠٠ وێنەیەی کە گرتبووت، لە دوا کۆنترۆڵدا سڕاونەتەوە، هەروەها چاوپێکەوتنی قازییەکەی موسڵیش. دەڵێت لەبەر ئەوەی کە ئارامی ئەو کەسانە و خێزانەکانیان نەکەوێتە مەترسییەوە. جگە لەمانە فریدریك دەبێت لە چاوپێکەوتنەکەی خۆی ئەو پرسیار و وەڵامەی کە دەربارەی بابەتی"موسڵمانی میانڕەو"بووە بسڕێتەوە. وا دیارە وتەکانی ئەبوقەتادە لەسەر موسڵمانی میانڕەو لە دیدی سەرانی داعشەوە زۆر گشتی بووە. بەڵام سەرانی داعش لەسەر هەموو بۆچوونەکانیتری ڕەزامەندبوون. فریدریك خەیاڵی ڕاحەت دەبێت و داواکەی ئەبوقەتادە قبوڵ دەکات. خۆشبەختانە تەواوی وێنە و ڤیدیۆ گرنگەکان بە سەلامەتی لە دەست تیغی سانسۆر ڕزگاریان دەبێت .

ئەبولوتی ماندوو بە هەسکەهەسك دەگەڕێتەوە. لەگەڵ سەرانی خۆی قسەی کردووە و دوو هەواڵی گرنگی بۆ من هێناوە. ئەگەر سەرۆکوەزیرانی بەریتانیا دەیڤید کامیرۆن پێشنیارێك بخاتە پێش داعش، ئەوە جۆن کانتلی بە خێرایی ئازاد دەکرێت. داعش ئامادەی گفتوگۆکردنە لەسەر جۆن کانتلی. ئەوان چاوەڕێی پێشنیارێکی دادپەروەرانە و بە ئینسافانە دەکەن، نەوەك پێشنیاری بەرژەوەندیخوازانە .

ئەبولوت من دێنێتە تەنیشتێکەوە. وادیارە ڕابەری داعش دەتوانێت ڕەزامەندیی لەسەر ئاڵوگۆڕکردنی جۆن کانتلی بە عافیە سدیقی دەرببڕێت. دەکرێت ئەم ئاڵوگۆڕکردنە بێ دەستێوەردانی بەریتانیاش ئەنجام بدرێت. من دەبێ هەموو هەوڵەکانی خۆم بۆ ئەم مەبەستە بخەمە گەڕ. وا دەردەکەوێت ئەمە خۆنواندنێکە بۆ داعش. ئەبولوت زۆر تووڕەیە. هەرچییەك بێت ئەویش مرۆڤە .

بەڵام سەبارەت بە من دەڵێت هەموو دەرگاکانت بۆ کراوەیە، بە مەرجێك دەربارەی دەوڵەتی ئیسلامی ڕاستییەکان بخەیتە ڕوو، سا بەو جۆرە هەرکاتێك بتەوێت دەتوانی کات دیاریی بکەیت و سەردانی ئێرە بکەیت.

خواحافیزی لەیەکتر دەکەین. ئەبولوت و ئەبوقەتادە تەوقەمان لەگەڵ دەکەن. ئەبولوت دەڵێت ئاگاتان لە خۆتان بێت. ئەو کاتژمێرە دەستییەی کە لە موسڵ بۆی کڕیبووم دووبارە دەیگەڕێنمەوە بۆی، ئەبولوت بە سەرسوڕمانەوە چاو لە من دەکات. پێکەنین دەمگرێت. شۆفێرە سەروچاوداپۆشراوەکەشمان لەوێ وەستاوە. ئەو تا سنووری تورکیا ئێمە دەبات .

پاش چوار کاتژمێر، واتە ڕێك کاتژمێری شەش و نیوی ئێوارە، کاتێك دەگەینە سنووری تورکیا، دنیا تەواو تاریك بووە. پیاوێك لە ناوەڕاستی جادەکە و لەبەردەم بنکە سەربازییەکە ڕاوەستاوە. ئەو هەر ئەو چەکدارە زەبەلاح و زلەی یەکەم ڕۆژە کە بەدوامانادا هات. شۆفێرەکەمان پێمان ڕادەگەیەنێت کە هەر ئێستا لە ترۆمبێلەکە پیادە ببین و شتومەکەکانیشمان لەگەڵ خۆمان هەڵگرین، هەر ئێستا ترۆمبێلێکی تر دێت

بەدوامانـدا و تـا سـنووری تورکیـا دەمانگەیەنێـت. ئـەو سـواری ترۆمێلەکـەی دەبێـت و دەگەڕێتەوە. دواتر مۆبایلەکانمان بە کابرای زەبـەلاحی داعشـی دەسـپێرێت. یـەك چـرکە دوودڵ دەبێ، وەك بڵێی بیەوێ شتێکمان پێ بڵێت، بەڵام دواتر بێ خواحافیزیی دەڕوات.

دوای دوو چرکە سەروکەللەی ترۆمبێلێکیتر پەیدا دەبێـت. کـابرای داعشـی بـە کـورتی چەند قسەیەك لەگەڵ شۆفێرەکەیدا دەکات. دەرئەنجامەکەی ئەوە دەبێت کە ئێمە ئەمڕۆ ناتوانین لە سنوور تێپەڕین، چونکە ژمارەی سەربازە تورکەکان زۆر زۆرن. دەبێت بـەیانی زوو بۆ سنووری تورکیا بچین. چەمکی کات لە ڕۆژهەڵات لەگەڵ ئەڵمانیا جیـاوازیی هەیـە. لە دەوڵەتی ئیسلامیشدا ئەم بارودۆخە بەرقەرارە.

ئێمە بۆ ژوورێکی بچووکی هەژارانە دەبەن، کە تێیدا چـەند کەسـێك سـەرقاڵی نوێـژن. هاوڕێکەمان پێمان دەڵێت باشتر وایە پشـوو بـدەین. بەداخـەوە هـیچ شـتێك بـۆ خـواردن دەست ناکەوێـت، هەروەها جگە لـە پـەرداخێکی چـایی شـتێك بـۆ خواردنـەوەش دەسـت ناکەوێت. سەرەڕای ئەمە بۆ ماوەیەکی زۆر لەگـەڵ کـابرای داعـش دادەنیشـین و گفتوگـۆ دەکەین. ئەو سەبارەت بە ئیسلام قسەمان بۆ دەکات. ئێمە گوێ بۆ قسەکانی ڕادەگرین، تا ئەوەی لەنێو کیسە خەوەکانمان لەسەر زەوییـەکی ساردوسـڕ خـەومان لـێ دەکـەوێت. کۆتاچیرۆك کە گوێم لێی دەبێ دەربارەی شەقبوونی مانگە (شق القمر).

### ڕۆژی دەیەم

### دوو شەممە، ١٥ـی دیسمبەری ٢٠١٤

کاتـژمێر پێـنج و نیـوی بەیانییـە، ئێمـە لـەوێ دانشـتووین و چـاوەڕوانین. بەداخـەوە دیسان شتێك بۆ خواردن و خواردنـەوە دەسـت ناکـەوێت، تەنانـەت یـەك پـەرداخ ئـاویش چـییە دەسـت ناکـەوێت. وادەردەکـەوێت دیسـان سـەربازە تورکـەکان لەسـەر سـنوور کۆبوونەتەوە. هیچ کەس مافی تێپەڕبوونی نییە، بەڵام هەر ٢٠ خولەك جارێك دۆڵمشێك لەو دیوی سنوورەوە(تورکیا) بۆ نێو داعش دێت و چەکداری نوێ و تازەنەفەس بۆ ئەم دیـوی

سنوور دەهێنێت. لێرە ناویان تۆمار دەکەن، وێنەیان لێ دەگرن و دەیانپشکنن. کۆنتڕۆڵی هاتنەژوورەوە خاڵی گومرکی داعشە. لەنێوان تازەهاتووەکان لاوێکی ئەفریقی، ڕووسی، ژمارەیەکی زۆر تورک و هەروەها ئەڵمانییەکیشیان تێدایە.

گەنجێکی باڵابەرز و کەڵەگەت، کە خەڵکی ترینیداد تۆباگۆیە، زۆر سەرنجمان ڕادەکێشێت. پانتۆڵێکی خاکی بە خەتی ئوتو و کراسێکی چوارخانەی تازەئوتوی لەبەر کردووە، هەروەها عەینەکێکی ڕەشی لەسەر چاو داناوە. ئەو چەند هەفتەی پێش لە تاقیکردنەوە ڕەسمییەکانی بەشی یاسا و دواتر لە دادگا قبوڵ کراوە. بەڵام لە ئێستادا هاتووەتە ئێرە. بۆچی؟ دەڵێت: "بەهۆی بێ ڕێوشوێنیی و پەیوەندییە ناسەقامگیرەکان. هەرکەس لەگەڵ هەرکەسێکدا بیەوێت دەڕوات. پەیوەندیی یەکشەوە! ئەمە ناتوانێت ئامانجی مرۆڤ بێت لە ژیاندا." بە بۆچوونی ئەو بەهاکانی ڕۆژئاوا پوک و وەڕزکەرن. باشە ئێستا دەیەوێت لە دەوڵەتی ئیسلامی چی بکات؟ من ئەمەی لێ دەپرسم، ئەو بەم جۆرە وەڵام دەداتەوە: "من هەر ئەو کارە دەکەم کە ئەوان لە منیان دەوێت. ئەگەر قەراربێت شەڕ بکەم، ئەوە شەڕ دەکەم. ئەگەر قەرار بێت وەکوو مافناسێك کار بکەم، منیش هەر ئەو کارە دەکەم. ئەمیر بڕیار لەسەر هەموو شتەکان دەدات." ئەو خۆشحاڵە بە ژیانە نوێیەکەی لە دەوڵەتی ئیسلامی. دواجار ئەو دەستی لە "سەرزەمینی بەڵێندراو" گیر بووە.

نزیکی کاتژمێر سێ دەبێت، وەلێ هێشتا ئێمەیان لێرە نەگواستووەتەوە. کاسەی چاوەڕوانیمان پڕ دەبێت. دەچمە نێو حەوشە و لەگەڵ قاچاقچییەکان دەکەومە قسەکردنەوە، ئاخر نامەوێت چەند ڕۆژێك بێهودە لێرە دەستەوەستان دابنیشم. هەر دەبێت ڕێگایەك هەبێ بۆ چوونە ئەو دیوی سنوور، بەڵام زۆربەی قاچاقچییەکان لەبەر بوونی سەربازە تورکەکان بوێریی ئەم کارەیان نییە. پرسیار لە سەرۆکی قاچاقچییەکان دەکەم کە بۆ ئەم کارە چەندە پارەی دەوێت. ئەویش دەپرسێت چەندم پێ دەدەیت؟ دەڵێم ٥٠٠ یۆرۆ. پێ دەکەنێت: "نرخێکی باشە. من تۆ بە خۆڕایی دەبەم! تۆ میوانی

ئێمەیت." فریدریك بەگومانە و تورەیە. من کە هەرگیز کابرا ناناسم، بەڵام هێزەکانی داعش ئەو دەناسن و بەم کارە ڕازین.

مۆبایلەکانمان وەردەگرینەوە. مۆبایلەکانیان لە نێو فەنەرێکی ئەلەمنیۆم پێچاوەتەوە. دوای گەشتنمان بە تورکیا دەبێت دەریانبێنین دایانگیرسێنین. دواتر سواری پیکابێکی بچووکی بارهەڵگر، کە لە ترۆمبێلی زیارەتچییەکان دەچێت، دەبین. فریدریك و مالکولم لە جێگای بارەکە لەسەر دوو جلیکانەی بەنزین دادەنیشن. ترۆمبیلەکە بۆنێکی زۆر توندی دێت و جێگاکەشمان زۆر تەنگە. من بە جیا لە پێشەوەی ترۆمبێلەکە دادەنیشم. پاسپۆرت و کارتی پەیامنێرییەکەمان لەبەردەستمان دادەنێین و بە ڕێ دەکەوین.

زۆر بە سەرسامییەوە تەنها چەند سەد مەترێك بەناو ناوچەیەکی پڕ لە تاسەدا لێ دەخورین، دواتر بۆ لای ڕاست پێچ دەکەینەوە و لەنێوان درەختی زەیتونەکان ڕادەوەستین. لەم شوێنەوە بورجێکی پاسەوانی و چاودێریی سنووریی تورکەکان دەبینم. لەم کاتەدا مرۆڤ ناتوانێت هەست بە ئارامی بکات. سێ قاچاغچیی لە پشتی درەختێکەوە ئاماژە بۆ لایەك دەکەن، دەبێت بۆ ئەو لایە بڕۆین. دەبێت هەر ئێستا لە ترۆمبێلەکە پیادە بین و بە خێرایی بۆ ئەوێ بچین. دڵمان بە ترپەترپ وەختە لە سینەمان دێتە دەرێ.

دەرگاکان دەکەینەوە، کۆڵەپشتیی و جانتاکانمان هەڵدەگرین و بە خێرایی کارەبا ڕادەکەین. ڕاکردن بەنێو زەوییەکی کشتوکاڵی کێڵراودا، ئەویش بە جانتا و کۆڵەپشتی قورسەوە زۆر ئاسان نییە. لای ڕاستمان هەمووی قەڕەم و قامیشەڵانە. یەکێك لە قاچاغچییەکان هاوار دەکات:"ئەگەر تەقەیان لێ کردن خێرا بچنە نێو قەڕەم و قامیشەڵانەکەوە و لای ڕاستانەوە و بە خێرایی ڕابکەن." نزیکەی ٣٠٠ مەتر تا سنووری تورکیا ماوە .

ئەو قاچاغچییەی کە لە پێشی پێشەوە ڕادەکات تەلە دڕکاوییەکەمان بۆ بەرز دەکاتەوە و دەڵێت: "یەڵا، یەڵا!، بەرەو پێش!" دەستی ڕاستی فریدریك لە تەلە دڕکاوییەکە گیر دەبێت، بەڵام دواتر خۆی ڕزگار دەکات. بەم هۆیەوە چاکەتەکەی بەری دەدڕێت. بەردەوام دەبین. دوور لە ئێمە دۆڵمشێکی سپیی، کە پێشتر پێی هاتبووین بۆ ئێرە، ڕاوەستاوە. خێراتر! هیچ کەسێك حەز بەوە ناکات ببێتە قوربانیی گوللەی سەربازە تورکەکان. هێشتا ٥٠ مەتر ماوە. دەرگاکانی دۆڵمشەکە بە تەواویی کراونەتەوە. خۆمان فڕێ دەدەینە نێو دۆڵمشەکەوە. پێش ئەوەی دەرگاکان ببەستێن شۆفێرەکەمان پێی لە بەنزین توند دەکات و بە ڕێ دەکەوێت .

سەرکەوتوبووین! بە تەواویی هەناسەمان لێ بڕاوە و لە عەرەقدا تەڕ بووینە. دڵم وەختە لە جێگای خۆی هەڵدەکەنرێت. هەر دەڵێی بارێکی قورسم لەسەر شان لاچووە. بە سەلامەت لەم سەرکێشیی و دڕدۆنگییە شێتانەیە ڕزگارمان دەبێت.

دوای چەند چرکەیەك مۆبایلەکانمان لەنێو شتومەکەکان دەردێنین. یەکڕاست زەنگ بۆ ماڵەوە لێ دەدەین. ناتالی بە گشت هێزێکییەوە لە تورەییدا هاوار دەکات و دەڵێت بۆچی لە ماوەی ئەم چەند ڕۆژەدا خەبەرێکمان پێیان نەداوە! دواییش تەنها دەست بە نوکەنوك و گریان دەکات. فراکویزە، ڤالری و دایکی مالکولمیش، کە گوێیان لە دەنگمان دەبێت دەست بە گریان دەکەن. ئەوە بۆ هەفتەیەك زیاترە دەنگی ئێمەیان نەبیستووە. ئیتر هەموو شتێك ئاسایی دەبێتەوە. لە دەوڵەتی ئیسلامی هاتینە دەرەوە! حاڵمان باشە!

# بەشی نۆیەم

## نامەیەکی کراوە بۆ خەلیفەی دەوڵەتی ئیسلامی

نامەیەکی لەم شێوەیە نازانم تا چ سنوورێك دەبێت بەڕێزەوە بێت و سنوورەکان تێنەپەڕێنێت؟ ماهاتما گاندی لە ساڵی ١٩٣٩ یەك مانگ پێش دەستپێکردنی جەنگ لە لایەن مرۆڤایەتییەوە نامەیەکی بۆ ئەدۆڵف هیتلەر نووسی، نووسینەکە بە دۆستی ئازیز دەستی پێ کرد و بە دۆستی ڕاستگۆی تۆ م، ك، گاندی کۆتایی پێ هات. من لەم نامەیەدا ناتوانم هێندەی گاندی میهرەبان بم، بەڵام ناشتوانم ڕێز و حورمەت لەبەرچاو نەگرم. سا بەم جۆرە بۆ بەغدادی دەنووسم:

**جەنابی خەلیفە ئیبراهیم عەوواد، ئەبوبەکر بەغدادی!**

پێش هەموو شتێك بەهۆی پابەندبوونتان بە زەمانەتنامەکەوە لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەی کە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بووین، سوپاستان دەکەم. باشتر وایە لەجێی سەربڕینی ڕۆژنامەنووسان و پەیامنێران، دیسانەوە لەمە زیاتر ڕۆژنامەنووسانی سەربەخۆ بۆ دەوڵەتەکەت بانگهێشت بکەیت.

بەگوێرەی لێکۆڵینەوەکانی سێ زانکۆی ئەمریکی و زانکۆیەکی ئێراقی لە جەنگی ئێراقی دژ بە بنەماکانی ماف مرۆڤی جۆرج دەبلیو بۆشدا، دەستی کەم نیو ملیۆن مرۆڤی بێتاوان کوژراون. من دەتوانم درك بە ململانێی مێژوویی عەرەبەکان لە دژی دەستێوەردان و داگیرکارییەکانی ڕۆژئاوا بکەم، ئەو دەستێوەردان و داگیرکارییانەی کە چەند سەدەیەکە دەستیان پێ کردووە. من چاوەکانم لە بەرانبەر نادادپەروەریی ڕۆژئاواییەکان دانەخستووە.

تۆ کە لەشکرکێشیت بۆ سەر ئێراق و سووریا دەست پێ کردووە، هەندێجار سەرکەوتنەکانت هێندە گەورە و بەرفراوان بوون بە جۆرێك هیچ کەس لەوەوپێش پێشبینیی نەکردووە. سەرەڕای ئەمە جەنابیشت ڕۆژێك دەبینیت کە بەخت و ناوچاو لە شەڕدا ناجێگیرە و هەموو ڕۆژێك بەخت یاوەرت نابێت. هەڵبەتە ئەو ڕێبازەی، کە گروپ و چەکدارەکانی تۆ لە شەڕەکاندا بەکاری دەهێنن بە بەراورد بە ئەحکامەکانی قورئان، هەمووی نائیسلامی و زیانبەخشن. ئەم کارانەی ئێوە زیان بە تەواوی موسڵمانانی دنیا دەگەیەنێت و لە هەمووان زیاتر زیان بەو ئیسلامە دەگەیەنێت کە تۆ بانگەشەی بۆ دەکەیت و لە پێناویدا دەجەنگیت.

چۆن ئەشق و دەستدرێژیکردن دوو شتی لەیەکتر جودان، هەر هێندەش تیرۆر لەگەڵ ئیسلام پەیوەندییەکی نییە و شتێکی جودایە. هەر بۆیە تۆ و چەکدارەکانت "جند الله(سەربازی خوا)" نین. هەڵبەت ئەگەر لەڕاستیدا شتی لەو جۆرەش هەبێت. ڕەنگە ئێوە بۆ خۆتان هەر پێتان خۆش نەبێت کە سەربازی خواوەند بن. ئەم چەمکە چەمکێکی تایبەتە بە سەردەمی شەڕی خاچپەرستەکان و لە بنەڕەتدا ڕیشەیەکی مەسیحیی هەیە. من بۆ خۆم چەندین جار قورئانم خوێندۆتەوە و بەهرەم لێ بینیوە، بەڵام من لە نێو قورئاندا ئەو ڕۆحییەتە توندوتیژە نادۆزمەوە کە تۆ و سەربازەکانت بە ئاگایانەوە بڕەوی پێ دەدەن. ڕەنگە ئێوە بتانەوێت لاسایی هێرشە توندوتیژەکانی خەڵکی مەککە بۆ سەر سوپا شکستخواردوەکەی(حەزرەتی) محەمەد لە مەدینە لە ساڵەکانی ٦٢٣ تا ٦٣٠، بکەنەوە. دوژمنەکانی ئیسلام ئەم کارە بە خواستی خۆیان ئەنجام دەدەن.

جگە لەمە لەنێو ئەفسانە و بەشە مێژووییەکانی تەوراتدا کۆمەڵێك شەڕی خوێناوییتر لەو شەڕانەی کە قورئان دەیگێڕێتەوە، باس کراون. هەر بۆیەش لێکۆڵەری بە ڕەگەز جولەکە ستیڤن پینکەر[١٠١] کە دەربارەی گۆڕانکارییەکان لێکۆڵینەوە دەکات، تەورات بە

101 Steven Pinker

"پیامەڵدانێکی دووروودرێژی بێوێنەی توندوتیژیی" وەسف دەکات. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم سەربڕینانە لە تەوراتدا تەنها بۆ وەسفکردنی مرۆڤە نەزانەکان باسکراون. تەوراتیش هەر وەکوو قورئان کتێبێکی دادپەروەر و مرۆڤدۆستە.

جەوهەری فیکری ئیسلامی و ئەندێشە بونیادییەکانی، واتە بانگەشەی ئیسلام بۆ دادپەروەریی و یەکسانی و ڕەوشتبەرزیی چما لە ئاخر شەڕیدا بەلای ئێوەوە نامۆیە. جگە لەمە ئێوە لە ئاست نێوئاخنی پەیامەکانی قورئان هێڵی سوور دەبەزێنن و سەرپێچیی کرۆکی پەیامەکانی قورئان دەکەن.

لەنێو قورئاندا لە وەسفی خوای گەورەدا هیچ وشەیەك بە قەد وشەی(بەخشندەیی) دووبارە نەبووەتەوە. ١١٣ سوورەت لە ١١٤ سوورەتەکەی قورئان بەم فەرمایشتە دەست پێ دەکات: "بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان" شەڕخوازییەکەی ئێوە هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ بەخشندەییدا نییە. ئێوە بۆ فراوانکردنی سنووری دەوڵەتی ئیسلامیی هاوشێوەی ئەوانەی کە لە سەتەکانی ناوەڕاستدا تینووی دەسەڵات و فراوانخوازیی بوون پەلامار دەدەن و لەشکرکێشیی دەکەن، هاوشێوەی خێڵەکانی جەنگیزخان و پۆل پۆت. جگە لەمانە ئێوە بەشێوەیەکی ئاشکرا نەخشەی گەورەترین قەتڵوعام و پاکسازیی مەزهەبیی مێژووییتان لەسەردایە، کوشتنی سەدان ملیۆن کافر و مورتەد. بەردەوام لە خۆم دەپرسم لە کوێی ئیسلامدا شتی لەم جۆرە هاتووە.

لە قورئاندا هاتووە:

١. لە دووەم سوورەتی قورئاندا (بەقەرە) لە ئایەتی ٢٥٦دا هاتووە: (لا اکراه فی الدین)(واتا لەم دینەدا بەزۆر داسەپاندن نییە.)[١٠٢] بەڵام ئێوە زۆر بێڕەحمانە مرۆڤەکان دەکوژن، تەنها لەبەر ئەوەی شیعەن، عەلەوین، ئێزیدین یا سونییەکی دیموکراتخوازن. مەگەر ئەوەی کە بۆ خۆیان بێنە نێو ئایدۆلۆژییە بێڕەحمانەکەی ئێوەوە، ئەویش پێش ئەوەی کە ئێوە بەسەریاندا زاڵ بن. بە ڕەوادانانی مەزهەبیی لە چەندین سەدەی پێشتردا

---

١٠٢– بۆ ڕاڤەی ئەم ئایەتە و ئایەتەکانی تریش سودم لە تەفسیری قورئانی پیرۆزی مامۆستا هەژار موکریانی وەرگرتووە.

یەکێك بووە لە فەزیلەتە دیارەکانی حاکمە ئیسلامییەکان. جەنابی خەلیفە بێزەحمەت بەرەوادانانی مەزهەبی لە دەوڵەتەکەی ئێوە لە کوێیە؟

٢. لە ئیسلامدا بە ڕوونیی شەڕی هێرشبەرانە حەرام کراوە. (بۆ نموونە لە سوورەتی بیستودووەمی قورئان (حەج) ئایەتی ٣٩ هاتووە) پێغەمبەر هەرگیز دەستی بۆ شەڕی هێرشبەرانە نەبردوە. ئەو هەمیشە لەلایەن پەیڕەوکارانی دینەکانی تر و ئەوانەی کە لە ڕووی سەربازییەوە بەهێزتربوون، هێرش کراوەتە سەری، بەڵام جەنابی خەلیفە، تۆ بێپەروا بۆ سەر ئەو ناوچە و شار و گوندانەی کە کارێکیان بەسەرتانەوە نەبووە، هێرش دەبەیت و کوشتنوبڕین دەکەیت.

٣. لە ئیسلامدا کوشتنی خەڵکی مەدەنی و بێلایەن، ژنان، منداڵان و بەساڵاچوان قەدەغە کراوە. لە زۆر شوێنی قورئاندا بە ڕوونی ئاماژە بۆ ئەم مەسەلەیە کراوە، بەڵام چەکدارەکانی ڕێبازەکەی تۆ مرۆڤە بێتاوانەکان بە شێوەیەکی زۆر ناشیرین و وەڕزکەر سەردەبڕن. بەڵێ، ئێوە دەستدرێژیی بۆ سەر ژنان دەکەن، ئەو کردەوە نەفرەتییەی کە قورئان بە توندیی ئیدانەی دەکات (سورەتی ٢٤(نور) ئایەتی ٣٣). ئایا ئەم کارانەی ئێوە دەیکەن ئیسلامییە؟

٤. لە ئیسلامدا تێکدانی پەرستگە و شوێنی خواپەرستیی قەدەغە کراوە (سورەتی بیستودووەم(حەج) ئایەتی ٢٢)، بەڵام ئێوە کڵێسا و کەنیسە و مزگەوتی شیعەکان و تەنانەت مزگەوتی سوننییەکانیش خاپوور دەکەن و بێحورمەتییپێکردنیان بە ڕەوا دادەنێن. ئەم کارەی ئێوە تەواو پێچەوانەی ئایینی ئیسلامە.

لیستی ئەو سەرپێچییانەی کە بە شێوەیکی ئاشکرا پێچەوانەی ئایەتەکانی قورئانە و ئێوە ئەنجامتان داوە زۆر لەمە زیاترن، بە جۆرێکە بە حەلحەلەی ئاسمان گەیشتوون. لە ڕاستیدا دانەدانەی ئەو کارانەی کە ئێوە ئەنجامی دەدەن پێچەوانەی ئایینی ئیسلامە و بۆ خۆیشی بەرنامەیەکە لە دژی ئایینی ئیسلام .

من کەسێکی مەسیحیم. لە ئایینەکەی مندا تایبەتمەندیی ئەو کەسەی کە دژی ئایینی مەسیحیەتە(دەجالە) لەنێو (ئینجیلی یۆحەنا)دا باس کراوە. بەڵام لە ڕێگەی کاروکردەوەکانی ئێوەوە بەو دەرئەنجامە دەگەم، کە وادیارە لە ئایینی ئیسلامیشدا کەسانی(دژەئیسلامیش) هەن. تەنانەت بیرمەندە ئیسلامییە بەناوبانگەکانیش پێشبینیی ئەوەیان نەکردبوو، کە ئەم کەسایەتییە دژ بە ئیسلامییە کەسێك بێت ناوی "خەلیفەی دەوڵەتی ئیسلامی" لە خۆی بنێت. بە بیری هیچ یەکێك لە بیرمەندە ئیسلامییەکانیشدا نەهاتبوو کە کەسێك بتوانێت مێژووی ئیسلام و ئایینی ئیسلام تا ئەم ڕادەیە بە تەوس و گاڵتەجارییەوە بگرێت. ڕاستییەکەی تۆ دەبێت ناوی قەڵەمڕەوییەکەت بگۆڕیت و ناوی لێ بنێی "دژەدەوڵەتی ئیسلامی". ئەو شتانەی کە ئێوە دەیڵێن و ئەنجامی دەدەن نەك تەنها پێچەوانەی قورئانن، بەڵکوو دژی کەسایەتیی خودی پێغەمبەری ئیسلامیشە. محەمەد (درودی خوای بەسەردا برژێت) بەخشندە بوو، بەس ئێوە بێبەزەیین. محەمەد شۆڕشگێڕ و خەباتکارێکی پێشەنگ بوو. با وای دابنێین محەمەد کە یەکێك لە چاکەخوازە زرك و زنیوەکانی نێو مێژوو بووە، ١٤٠٠ ساڵ پاش مردنی خۆی دەیەوێت بەگوێرەی هەمان دابونەریتی ئایینی سەردەمی خۆی بژێت، ئەوکات ئەمە شتێکی زۆر مەحاڵ دەبێت. شۆڕشگێڕە گەورەکان تەنها بە سەرکەوتنەکانیان ڕازیی نابن، ئەوان لە خەباتی خۆیان بۆ خزمەتکردنی مرۆڤەیاتی وچان نادەن. تۆ، ئەی ئەبوبەکر بەغدادی تەنها دەتەوێت سەرنجی خەڵك بۆ فەرمانڕەوایی خۆت ڕابکێشیت. تۆ ئیسلاحخواز و پیاوێکی بۆخواسوڵحاو و میهرەبان نیت.

زۆرێك لە ڕێکخراوە تیرۆریستییەکانی پێش داعش پێچەوانەی ئایینی ئیسلام هەڵسوکەوتیان کردووە و ناوی ئیسلامیان خراپ بەکارهێناوە، ئەوان بۆ داپۆشینی کردەوە دژە ئیسلامییەکانیان خراپ سوودیان لە ناوی ئیسلام وەرگرتووە. هەر بەم جۆرە هەندێك لە دەسەڵاتدار و زانا ئاینییە بەگومانەکانیش، ئەم ئایینە گەورە و پیرۆزەیان گۆڕیوە. ئەم شتانە تەنها لە ئیسلامدا نییە، بەڵکوو لە مێژووی

مەسیحییەتیشدا کاری لەم جۆرە کراوە، زۆرێك لە کردەوە شەیتانییەکان بەناوی مەسیحییەتەوە ئەنجام دراون. تۆیش، کاکی بەغدادی، لە ڕاستیدا بۆ ئەوە نەهاتووی بڕەو بە دینی ئیسلام بدەی، بەڵکوو تۆ پەرە بە دینی تایبەتی و شەریعەتی تایبەتیی خۆت دەدەیت و ئایدیۆلۆژیاکەی خۆت بڵاو دەکەیتەوە.

دەروێشەکانی تۆ ئاماژە بۆ ئەو بابەتە دەکەن، کە جۆرج دەبلیو بۆش زۆر لە تۆ زیاتر مرۆڤی بە کوشتن داوە، ئەویش لە شەڕێکی پێچەوانە لەگەڵ مافەکانی مرۆڤدا، لە ئێستادا ئەم بابەتە بۆ تۆش ڕێك دێتەوە، بە تایبەتی ئەگەر پێشڕەوییەکانت ڕانەگریت. من چەندین جار داوام کردووە ئەو کەسانەی بوونە مایەی هەڵگیرساندنی جەنگی ئێراق لە بەردەم دادگای نێودەوڵەتیدا دادگایی بکرێن، بەتایبەت جۆرج دەبلیو بۆش و تۆنی بلێر. بەڵام تۆ لە چوار شتدا جیاوازیت لەگەڵ بۆش و بلێردا هەیە:

١. ئەگەرچی سەرۆکی پێشووی ئەمریکا تووشی خراپترین تاوانی جەنگیی بوو، بەڵام شانازیی بە شکەنجە و تاوانە نهێنییەکانی نێو زیندانەکانی ئەبوغرێب و گوانتانامۆ و باگرامەوە نەکرد، هەروەها شانازی بە تاوان و دەستدرێژییە ئابڕووبەرەکانیشییەوە نەدەکرد. ئەو ئەم کارە قێزەون و ئابڕووبەرانەی بە میحوەری بەرنامەکەی خۆی دیاریی نەکردبوو، هەروەها ئایینی مەسیحییەتی وەکوو ئامانج و کرۆکی بەرنامە و هێرشەکانی خۆی دیاریی نەکردبوو. هەرچەندە لە کاتی دەستپێکردنی جەنگ چەند ئابڕوچوونێکی لەم جۆرەش دەستویەخەیان پێ گرت، جۆرج بۆش وا خۆی پیشان دەدا کە بە نیازە شەڕێکی سەلیبی هەڵگیرسێنێت، هەندێك جاریش بە جۆرێك خۆی بە عیسای مەسیح دەبینی.

٢. بۆش هەرگیز بە ئاگاییەوە، بە ئامانجەوە، بە پلان و بەرنامەڕێژیی یاخود بە ئاشکرا خەڵکی بێتاوان و غەیرەسەربازیی، ڕۆژنامەنووس و ئەندامانی ڕێکخراوەکانی فریاکەوتنی قەتڵوعام نەکرد.

٣. ئەو هەرگیز وەك ئێوە بەرنامەی پێ نەبوو بۆ سڕینەوەی مەزهەبەکانی تر، هەوڵی ئەوەشی نەدا تا تەواوی دینە غەیرەمەسیحییەکان لەناو ببات و پاکتاوی واقعییان بکات. ئەو پاکتاوەی، کە دەبێتە مایەی کوشتنی ملیۆنان مرۆڤ. ئێوە خەریکن گەورەترین کۆمەڵکوژیی مێژوویی لە خەیاڵی مرۆڤەکاندا پەروەردە دەکەن، بە جۆرێك تەواوی کردەوە مێژووییەکانی مرۆڤایەتی دەخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە. بۆ ئەم مەبەستە ئێوە بەشێوەیەکی خراپ سوود لە ناوی ئیسلام وەردەگرن. بە ڕاستیی ئەمە کفرە.

٤. ئێوە دیسانەوە بە شێوەیەکی ئاشکرا برەوتان بە کردەوەی کۆیلایەتیی و کەنیزەکداریی داوە، ئەو کۆیلایەتییەی کە پێشتر مرۆڤایەتیی بە درێژایی جەنگە تاقەتپڕوکێنەکان بەسەریدا سەرکەوتن. ئەم مەسەلەیە ڕۆژگارێك بوو لەنێو هەموو کەلتورەکاندا ڕەواجی هەبوو، بەڵام ماوەیەکی زۆرە موسڵمانان و جوولەکەکان و مەسیحییەکان ئەم کردەوە شەرمەزارکەرە، ئەم گۆڕینەوەیەی ئینسان بە کاڵا و بە بچووکتەماشاکردنەی ئینسانیان لەنێو ئایینەکانی خۆیاندا هەڵگرتووەتەوە. ئەگەرچی تا ئەمڕۆش بە شێوەی نهێنیی مرۆڤێلێکی زۆر هەن کە بە شێوەیەکی خراپ هاوشێوەی بەندە و کۆیلە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت. محەمەد(درودی خوای بەسەردا بڕژێت) بە پێچەوانەی ئێوە، هەمیشە لە دوی چەند ڕێگاچارەیەك بوو تا بەندەکان لە کۆیلایەتیی ڕزگار بکات و لە کۆیلایەتیی دەریانبێنێت و بیانکات بە هاووڵاتییەکی خاوەنماف. هەر بەم جۆرەش بوو بیلالی حەبەشی بوو بە یەکەم بانگدەری ئیسلامی.

ئێوە بە پێش چاوی هەموو دنیاوە خەڵکان سەر دەبڕن، بۆ ئەوەی هانی وڵاتەکانیان بدەن لە پێناو تۆڵەکردنەوەیان دەست بۆ لەشکرکێشیی زەمینیی ببەن. بەم کارەش دیسانەوە ژمارەیەکی زۆرتر لە موسڵمانان قوربانیی دەکەن. ئێوە شەڕخوازن، هاوشێوەی بن لادن کە بە هێرشەکانی ١١ـی سێپتەمبەر ئەمریکای خستە داوی شەڕی ئەفغانستانەوە و ئەو وڵاتەی ناچار بە لەشکرکێشیی کرد. ئایا ئەم کارە ئیسلامییە؟ من

بۆ خۆم لە سەردەمی دەستپێکردنی شۆڕشەکانی لیبیاوە جیمز فولی، پەیامنێری بەریتانیی، دەناسم. ئەو هاوەڵێکی خۆشەویست و کەمدوو بوو. چەند ڕۆژ پاش ئەوەی من و دۆستەکانم کەوتینە کەمینی هێزەکانی قەزافییەوە، جیمز فولیش لەلایەن هەمان ئەو کەسانەوە دەستگیر کرا، بەڵام ئەوان سەرەڕای ئەو هەموو توندوتیژییەی کە هەڵگری بوون زۆر چاکتر لە چەکدارە بێبەزەییەکانی ئێوە مامەڵەیان لەگەڵدا کرد .

بەغدادی، من لەگەڵ ژمارەیەك لە چەکدارە بیانییەکانت ئاشنا بووم. چەندین کاتژمێر گفتوگۆم لەگەڵیان کردووە. هەر بۆیە لەم نامەدا ڕووی دەم لەوانیش دەکەم و داوا لە ئەوانیش دەکەم.

داوا لە تەواوی تێکۆشەرە بیانییەکان دەکەم دەوڵەتی ئیسلامیی بەجێ بهێڵن و بۆ وڵاتەکانی خۆیان بگەڕێنەوە، خۆیان بە بەرپرسی وڵاتەکانیان بناسێنن. دڵنیابن کە بە جوانیی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت. بە میهرەبانیی دادگایی دەکرێن و چەند بەرنامەیەکی بەسوودیان بۆ تەرخان دەکرێت، تا ئەوەی جارێکی تر هەست بە ئارامیی بکەن.

من بە دەنگی بەرز بەم چەکدارە بیانیانەی نێو داعش دەڵێم: من قسەی هەندێکتانم پێ قبوڵە، کە لەبەر نەزانیی، سادەیی، بیروباوەڕ، هیواخوازیی، یان لەبەر هەڵچوونێکی کاتیی چوونەتە نێو ڕیزەکانی داعشەوە، بەڵام ئەگەر بە دوو چاوی کراوەی خۆتان سەرنج لە دنیا بدەن دەبینن کە هەموو لاوێکی ٢٠ ساڵە ناتوانێت بە کلاشینکۆفێك یاخود چەقۆیەکی سەربڕینەوە بێڕەحمانە فەرمان بۆ هەموو دنیا دەربکات، یاخود حوکمی هەموو جیهان بکات.

کوشتنی بە ئەنقەستی مرۆڤە بێتاوانەکان و قەڵاچۆکردنی مەزهەبیی مرۆڤەکان هەرگیز قابیلی بەخشین نییە. ئێوە مافی ئەوەتان نییە بە حورمەتی دینی پیرۆزی ئیسلام، بە شێوەی گومڕا و نابەجێ هەوڵی سڕینەوەی مەزهەبەکانی تر بدەن و زیانیان پێ بگەیەنن. هیچ کەس هێندەی تاقمی دوژمنانی ئیسلام لە جیهان بەم جینایەتانەی ئێوە خۆشحاڵ نابێت. ئایا ئیسلام بۆ خۆی دوژمنی زۆر نییە؟ دەتوانم بڵێم کە تەنانەت

(داعش/دژەداعش)(خەلافــــەتی ئیســــــلامی/خەلافەتی دژەئیســــــلامی) دروســــــتکراوی دوژمنەکانتانە .

کەسێك کە بـە ڕاستیی ئاشـقی ئیسـلام بێـت، ئـیتر لـەوە زیـاتر ناتوانێـت لـەم گەمـە کۆمەڵکوژییەی ئێوەدا بەشداریی بکات. ئەبوبەکر بەغدادی بە شێوەیەکی خراپ سوود لـە هیواخوازییەکانی ئێوە وەردەگرێـت. ئەگەر ئێوە موسڵمانی واقعـین دەبێـت کۆتـایی بـەم کابووسە بێنن و دژی ئەو سووکایەتییەی کـە(داعش/دژەداعش) دوژمنـەکانی ئیسـلام بـۆ مرۆڤایەتیی هێناویانە بووەستنەوە و بـەرگریی لـە بەرانبـەردا بکـەن، ئەگـەریش گیانتـان بکەوێتە مەترسییەوە، ئەوکات ئێوە بە قارەمانی واقعیی نێـو ئیسـلام هـەژمار دەکـرێن. دەستهەڵگرتن لە چەوتیی و بەردەوامنـەبوون لەسـەری زۆر گـەورەترە لـە بـەردەوامبوون لەسەر شێتیی و چەوتیی، بە ڕاستیی کاری وەها پێویستی بە دلێریی هەیـە. ئێـوە تـەنها بۆ جیهانی ڕۆژئاوا مایەی مەترسیی نـین، بـەڵکوو بـۆ خـودی جیهـانی ئیسـلامیش مایـەی کێشە و دەردەسەرین.

لە غەزە لە کـاتی شـەڕی هـاوینی ٢٠١٤ پرسـیارم لـە پیـاوێکی فەلەسـتینی کـرد، کـە بۆچـوونی دەربـارەی داعـش چـۆنە. ئـەو پیـاوە هـەموو شـتێکی لەدەسـتدابوو. ئـەو بـە واقوڕماویی تەماشایەکی منی کرد و گوتـی: (ئیتر بەو هۆیەوە دەبێـت بـە هـەردوو دەسـت گوێچکەی خۆمان بگرین).

جەنابی خەلیفە ئیبراهیم، هیوا خوازم کە حیزبە ناکۆکەکانی ئێراق و سـووریا لـە دژی ئێوە یەکبگرن و زەمینەی کاروچالاکییەکانتان لەناو ببەن .

هیواخوازم خوای گەورە بتانوەستێنێـت! بـەڵام هیـوای سـەرکەوتن بـۆ زیـاد لـە یـەك ملیـاردونیو ئیسـلامی ڕاسـتەقینە و میـانڕەو دەخـوازم. ئیسـلامێك، کـە دووربێـت لـە دەمارگیریی و توندوتیژیی، تەنها بۆ ئەڵمانیا سوودی نییە، بەڵکوو بۆ هەموو دنیای ئێمـە سوودمەندە.

له خوارەوە ١٠ ئایەتی نێو قورئان دەخەمە ڕوو کە لە دیدی منەوە جوانترین وەسفن بۆ قورئان، هەروەها زۆر لەو شتانە جوانتر وەسفی قورئان دەکەن، کە ئێوە دەیکەن و دەیڵێن. باشتر وایە پێش ئەوەی مێژوو پشکوێتان بخات، بەلای کەمەوە جارێك ئاوڕ لە مێژوو بدەنەوە.

دە ئایەتی قورئانی پیرۆز، کە پێم وایە ئێوە ئاگاتان لێی نییە، لێرەدا دەخەمە ڕوو:

١. ئەگەر لەگەڵ ئەهلی کتێب دەکەونە وتووێژەوە، بەوپەڕی نەرمونیانیی قسەیان لەتەکا بکەن! مەگین لەتەك ئەوانەیان کە ناهەقیان گوتووە. ئێوە بێژن: بەو قورعانە کە بۆ ئێمە هاتە خوار و بەو کتێبەی بۆ ئێوە هاتۆتە خوارێ، بڕوا دەکەین. خودای ئێمە و خودای ئێوە هەر یەکێکە، ئێمە خۆمان بەو دەسپێرین(٢٩:٤٦).

٢. ئێوە بێژن: ئێمە بە خوا و بەو شتانەی کە بۆمان هاتۆتە خوار و بەوانەی کە ناردراون بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەتەوەکانی و ئەوی بۆ مووساش و عیساش ناردراوە و ئەو شتانەی کە بە پێغەمبەران درا لەلای پەروەردگاریانەوە، باوەڕمان کرد. ئێمە جیاوازیی ناخەینە نێوان هیچ کامێك لەمانە و خۆمان هەر بەو سپاردووە. (١٣٦:٢) لەم دینەدا بەزۆر داسەپاندن نییە (٢٥٦:٢) ئەگەر خودا کەیفی لێ با، دیارە هەرکێ لەم زەمینەن، تێکڕا باوەڕیان دەهێنا. ئاخۆ تۆ دەتەوێ بەزۆر ئەم مەردمە باوەڕ بێنن؟(١٠:٩٩)

٣. ئەگەر خودا مەیلی لێ با، هەمووی دەکردنە یەك ئۆمەت. بەڵام ویستی خودا وا بوو لەو شتانەی کە پێی داون، تاقیتان بکاتەوە. دەسا ئێوەش لە کاری چاك پێکەوە کێ¬بەرکێ بکەن! هەموو لایەکتان دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا و ئەوسا ئاگادارتان دەکا کە لەسەر چی کێشەتان لەناودا پەیدا بوو(٥:٤٨) ئەوانەی خاوەن باوەڕن و ئەو کەسانەش کە جوولەکە و فەلە و سابیی¬مەزەب بوون، ئەگەر بە خوا و ڕۆژی پەسڵان

باوەڕیان بێت و ئاکارچاك بن، لەلای پەروەردگاریان¬ڕا پاداشتی خۆیان پێ دەگا و نە هیچ ترسێکیان لەسەرە، نەخەم دەخۆن. (٢:٦٢)

٤. دەبێت ئێوە باوەڕ بێنن و کردەوەی چاك بکەن! (٢٥:٧٠) خوا بە عەدالّەت و چاکە و بەخشین بە خزم¬ و کەسوکار، فەرمان دەدا و ڕێ نادا بە ئاکاری پیس و خراپە و دەستدرێژیی. ئامۆژگاریتان لێ دەکا بەشکوو پەندی لێ وەرگرن(١٦:٩٠).

٥. لە بەرانبەر خراپەکارییەکانی مەردوم چاکە بکەن! (١٣:٢٢) دەسا ئێوە بۆ چاکە کێ¬بڕکێ بکەن!(٢:١٤٨) پەروەردگار چاکەکارانی خۆش دەوێت. (٢:١٩٥) دەربارەی دایك و بابتان و خزمەکان و هەتیوان و هەژاران و هاوسای دیواربەدیوار و هاوسای دوور و هاوەڵی هەمیشەییتان، ئەوانەی ڕێدا ماون و ئەوانەی بوونەتە موڵکتان، تا دەتوانن چاکە بکەن. ئەو کەسانەی کە لوتبەرز و خۆپەسەندن، خودا هیچکامی خۆش ناوێن(٤:٣٦) ئەوی بە ئێوە دراوە هەر مایەی گوزەرانتانە لە دنیادا و زەمبەریەتی. ئەوەش کە لجەم خودایە، چاکترە و زۆرتر دەمێنێ، ئاخۆ لەوەندەش تێ ناگەن؟(٢٨:٦٠) هەرکەسێ چاکەیەك بکا، دە ئەوەندەی چاکە لەگەڵ دەکرێتەوە. کەسێکیش خراپە بکا، بە ئەندازەی خراپەکەی سزا دەدرێ و کەس ناهەقی لێ ناگرێ. (٦:١٦٠).

٦. عەبدە ڕاستەکانی ڕەحمان ئەو کەسانەن کە بێ دەعیە دەچنە ڕێوە و هەرکاتێکیش نەزانەکان بیاندوێنن، وەڵامی نەرمونیانیان دەدەنەوە(٢٥:٦٣) شێنەیی بەرێدا بڕۆ و بە دەنگی نزم پێبکەنە، چونکە دەنگی هەرە ناخۆش لە کەرانەوە دەردەچێ(٣١:١٩).

٧. هەرکەس کارێکی باش دەکا، بۆ خۆیەتی" هەر کەسیش خراپە دەکات، دژی خۆی کردوویەتی(٤٥:١٥).

٨. لە عەرزا بەدفەڕیی مەکەن(٢:٦٠). لەنێوان خەڵکیدا ئاشتەوایی بکەن(٢:٢٢٤).

٩. سزا بۆ هەر خراپەیەك، خراپەیەكی وەك ئەوە. كێش لە تۆڵە چاو بپۆشێ و كۆشش بۆ ئاشتیی بكا، پاداشتی لەسەر خودایە. بێ سۆ خودا ناهەقكارانی خۆش ناوێن(٤٢:٤٠) ئاشتیی و ئاشتەوایی چاكەیە(٤:١٢٨).

وە ئەمەش ئایەتێك لەسەر ئەو تاوانەی كە ئێوە زیاد لە هەموو كەسێك توشی دەبن:

١٠. هەركەسێ بێتاوانێك بكوژێ وەك ئەمەیە كە گشت خەڵكی سەرزەوی لەناوبردبێ و هەركەسێكیش بێتاوانێك ڕزگار بكا، وەك ئەمەیە كە هەموو خەڵكی سەرزەوی لە مردن ڕزگار كردووە(٥:٣٢) كەسیش مەكوژن كە خودا كوشتنی حەرام كردووە(٦:١٥١).

ئەمە شتێلێكە كە مرۆڤ دەتوانێ بە گوێرەیان لە ژیاندا ڕەفتار بكات نەوەك ئایدۆلۆژیا توندوتیژ و دژەئیسلامییەكەی ئێوە.

دیسان لەبەر میوانداریيەكەتان سوپاستان دەكەم! هەروەها لەبەر ئەو فرسەتەی كە بە منتان بەخشی بۆ ئەوەی سەردانێكی تاڕادەیەك ئازادانە بۆ قەڵەمڕەوییەكەی ژێر فەرمانڕەوایتان بكەم، زۆرم حەز لێ بوو كە ڕۆژێك دەوڵەتێكی ئیسلامیی ببینم. چونكە ئەم دەوڵەتە ئیسلامییە دەیتوانی لە ئارامیدا دژی نادادپەروەریی و خۆبەزلزانینەكانی ڕۆژئاوا بووەستێتەوە. زۆر بەداخەوەم كە دواجار بە حكومەتێكی دژەئیسلامیی ئاشنا بووم.

لەگەڵ ڕێزدا

یورگن تۆدنهۆفەر

# بەشی دەیەم

## دواگوتە بۆ جۆن جیهادی[١٠٣]

پاش چەند ڕۆژ لە گەڕانەوەمان فریدریك زەنگم بۆ لێ دەدات و لێم دەپرسێت: "ئەم دەنگە دەناسیتەوە؟" دەنگێکی نەناس دەبیستم، بەڵام ڕیتم و ئاوازی ئەو دەنگە بۆم ئاشنایە. من دەڵێم:"ئەمە دەنگی شۆفێرەکانە. لەکاتی کامێراوانیدا بە نهێنیی دەنگیت تۆمارکردووە؟" فیردی بە شێوەیەکی جدیی پێم دەڵێت: "ئەمە جۆن جیهادی جەلادە. دەتوانم هەر ئێستا بێم بۆ لات؟"

کەمێك دواتر، لەنێو ماڵەکەی من لە بەردەم لاپتۆکەی فیردی دانیشتووین. فیردی گرتەیەکی ڤیدۆیی جۆن جیهادیم پیشان دەدات، کە تێیدا هەڕەشەی سەربڕین لە دوو ژاپۆنی ڕفێندراو دەکات. من هەستێکی خراپم هەیە، حاڵم وەك ئەو مرۆڤانەیە کە سەریان لێ دەکەنەوە. ڕیتم و ئاوازی قسەکردنی، چاوە نیوەبازەکانی، نیگا زاق و بە برشتەکانی، زمانی جەستەی، ئەمە شۆفێرەکەی ئێمەیە؟ لەگەڵ ئەوەی کە دەنگی سەر گرتەڤیدیۆییەکە بە شێوەیەکی ئەلیکترۆنی گۆڕانکاریی بەسەردا دێت و زۆر ڕوون نییە، بەڵام بۆ من جێگای گومان نییە کە ئەمە دەنگی جۆن جیهادیی جەلادە. ئاخر ئێمە بۆ ماوەیەکی زۆر لەگەڵ شۆفێرەکەماندا بووین. ڕەخنە و فەرمانە توندوتیژەکانی ئەومان هەر لە یاد ماوە. لەپەسا بە سەرسامییەکەوە سەر با دەدەم. ئایا بە ڕاستیی ئێمە چەند ڕۆژ لەگەڵ جۆن جیهادیی جەلاددا بووین؟

فریدریك گرتەیەکی ڤیدۆیی دیکەم پیشان دەدات. ئەم جارەیان کەمێك پێش سەربڕینی جیمز فولی جۆن جیهادیی لە تەنیشت پەیامنێری ئەمریکی جیمز فولییەوە قسە دەکات.. دووبارە هەمان ئەزموون و هەمان یادگاریی ئاشنام دێتەوە یاد. لێرە بە

---

١٠٣-سەربڕی پەیامنێرەکان، ئەو کەسەی کە لە گرتە ڤیدیۆییەکاندا دەردەکەوێت و بەشێوە زارێکی بەریتانی توندوتیژ قسە دەکات.

ئاشکرا شۆفێرەکەی ئێمەیە قسە دەکات. فریدریك هێشتا سوپرایزی دیکەی پێ ماوە. ئەو لە یوتیوب ڤیدیۆیەکی لە ڕێگەی کەسێکی نادیارەوە پەیدا کردووە کە گرتە ڤیدیۆییەکە کاری گروپێکی هاککەری بەناوبانگ و ترسناکە. وەك دەردەکەوێت لەم گرتەڤیدیۆییەدا دەنگی واقعیی جۆن جیهادیی ئاشکرا کراوە. کەسێکی نادیار دەنگی جۆن جیهادیی چاك کردووە و بۆ حاڵەتی واقعیی خۆی گەڕاندویەتییەوە. باوەڕکردنی زۆر سەختە بۆمان: ئەو دەنگەی لەم گرتەڤیدیۆییەدا دەبیسترێت ڕێك هاوشێوەی دەنگی شۆفێرەکەی ئێمەیە .

فریدریك بە ئارامییەکەوە دەڵێت: "یەکەم ڕۆژیش کە لە تۆ توڕەبوو ڕێك بەم شێوەیە قسەی کرد. هەروەها ئەو کاتەی لە موسڵیش کامێراکەی لێ وەرگرتم، لەگەڵ منیشدا هەر بەم شێوەیە قسەی کرد. هەرگیز ئەو دەنگە فەرامۆش ناکەم."

هەروەها ئەو وێنانەی بەم دواییانە لەسەر جۆن جیهادی بڵاوکرانەوە زۆر لە دەموچاوی ئەو پیاوە دەچوو، کە من بۆ چەند ساتێك بەبێ ماسك و ڕووپۆش بینی بووم، ئەگەرچی چەند چرکەیەکی کەمیش بوو بینی بووم. هەروەها ئەو وێنانەی بڵاوکرانەوە زۆر لە سێبەری ئەو پیاوە سەروچاوداپۆشراوە دەچوون، کە چەند ڕۆژ پێش لەنێو ترۆمبێلەکەدا ڕووبەڕووی من دانیشتبوو.

بەڵام ئەمانە ناتوانرێت بە بەڵگەی ١٠٠٪ دابنرێت. منیش ئەمانە بە بەڵگە و سەنەد لەقەڵەم نادەم. هەرچەندە شۆفیرەکەمان مۆڵەتی ئەوەی نەداین کە وێنەی لێ بگرین، بەڵام لە سەرێکیشەوە ناتوانم پێش بە بڵاوکردنەوەی دەرئەنجامە سەیروسەمەرەکانی خۆم لەم سەفەرەدا بگرم .

هەموو ئەم شتانە زۆر جوان لەگەڵ یەك ڕێککەوتوون. بواری ئەوەی کە بە ئاسانیی دەیتوانی پەیوەندیی بکاتە جۆن کانتلی پەیامنێرەوە، توڕەبوونی لەسەر ئەوەی کە من ئامادە نەبووم لە پڕوپاگەندەیەکی داعشدا لەگەڵ کانتلی بەشداریی بکەم، داپۆشینی سەروچاوی بە درێژایی شەو و ڕۆژ، توڕەبوون و هەڵچوونی، کاتێك من بە ڕێککەوت چەند ساتێك بێ ماسك و ڕووپۆش دەیبینم .

فریــدریك راپــۆرتێكی دەزگــای ئێــف، بــی، ئــای، كــه لــه ســێپتەمبەری ٢٠١٤دا بڵاوكراوەتــەوە بــۆ مــن دەخوێنێتــەوە، بــەگوێرەی ئــەو راپۆرتــە جــۆن جیهــادیی پێشــتر ئەندامی گروپێكی تیرۆریستیی بووە بە نــاوی "بیتلــەكان."[١٠٤] بــەگوێرەی وتــەی بارمتــە ئازادكراوەكان كاری جۆن جیهادیی لەو گروپەدا بریتی بووە لە چاودێریكردنی بارمتــەكان و پەیوەندیكردن بە خێزانەكانیانەوە، دەی ئەمە رێك هــەر ئــەو كارەیــە كــە شــۆفێرەكەی ئێمــە دەیویســت ئــەنجامی بــدات، بــۆ نموونــە نــاردنی دوو نامەكــەی جــۆن كــانتلی بــۆ خێزانەكەی و سەرۆكوەزیرانی بەریتانیا و فلیملێگرتنی .

جــۆن جیهــادیی ئەستێرەی نێــو ڤیــدیۆی ســەربڕینەكانی دەوڵــەتی ئیســلامییە، كــە وێنەیــەكی زۆر كاریگــەر و تۆقێنــەری بــە دەوڵــەتی ئیســلامیی لــە سەرانســەری جیهانــدا بەخشــیوە. پــێ دەچــێت جــەلادێكی تــریش هــەبووبێت كــە جارجــارە شــوێنی ئــەوی گرتبێتەوە. رەنگە هەر لە پێناوی ئەوەشدا ئەو دەیویســت لــەم ســەفەرەدا هاورێیــەتیمان بكات، تا لەوە دڵنیا بێت كە ئایا ئێمە وێنە و كارە خوێناوییەكانی ئەوان دروست پیشــان دەدەین یاخود نا .

مــن باســی گفتوگۆیــەكی خــۆم بــۆ فریــدریك دەكــەم كــە دوێــنێ بەرێككــەوت لەگــەڵ كارمەندێكی دژەتیرۆردا ئەنجامم داوە، لەو چاوپێكەوتنەدا سەبارەت بە شێوە و هەیكەلی جۆن جیهادیی پرسیارم كردبوو. ئەو بــەو جــۆرە وەڵــامی دابوویــەوە كــە جــۆن جیهــادیی خاوەنی دوو چــاوی هــەڵۆیی دەرپۆقیــوە كــە لــە چــاوە هەڵۆینــەكانی شــۆفێرەكەی ئێمــە دەرپۆقیوترە، بەڵام باوەرناكەم چاوی لەم جۆرە هەر هەبێت. ئەو هەركاتێك رووی بەرەو لای ئێمە وەردەچــەرخاند، تەنانــەت رووپۆشــەكەی ســەر دەموچاویشــی نەیــدەتوانی ئــەو دەرپۆقینە روونەی چاوەكانی بشارێتەوە. ئەو كەسانەشی كــە جــۆن جیهــادی دەناســن و لەســەردەمی لاویــدا دیتویانــە بــاس لــەوە دەكــەن كــە ئــەو خــاوەنی پرچــێكی لوولــە. شۆفێرەكەی ئێمەش بە هەمانشێوە پرچێكی لوولی لە پشتەوە هەبوو و تا خوار گــەردنی درێژ دەبوو.

---

104 The Beatles

فریدریك زەنگ بۆ مالكولم لێ دەدات و تكای لێ دەكات كە یەكسەر بۆ لای ئەو بێت. نیو كاتژمێر دوای ئەوە فریدریك دوو ڤیدیۆكە بە مالكولم پیشان دەدات، بێ ئەوەی هیچ شتێكی بۆ باس بكات. مالكولم چاوی زاق دەبێت و لە پەسا دەڵێت: "ناكرێت!" كاتێك ڤیدیۆكان تەواو دەبن زۆر بە شپرزەییەوە چاو لە ئێمە دەكات و دەڵێت: "ئەمە ڕاست نییە. ئەمە شۆفێرەكەی ئێمەیە".

بێ ئەوەی یەك وشە بڵێین مات و حەیران لەیەكتر جیا دەبینەوە. حەیرانم، چونكە نازانم لە نێو كتێبەكەمدا ئاماژە بۆ ئەو مەسەلەیە بكەم یاخود نا، مەبەستم ئەو مەسەلەیەیە كە هەموو ڕۆژەكان لە دەوڵەتی ئیسلامیدا لەگەڵ بێڕەحمترین جەلادی دنیادا بووین. لامان ڕوون بوو كە داعش هەموو ئەو شتانە بە درۆ دادەنێت. بەهەرحاڵ جۆن جیهادیی ئەو گەورە تیرۆریستەیە كە لە هەمووان زیاتر بەدواداچوونی بۆ دەكرێت و لە دوی دەگەڕێن.

فریدریك كۆمپیوتەرەكەی قەپات دەكات. ڕۆژێك دوای ئەوە فریدریك ئەو دەنگەی كە لە لایەن كەسێكی نادیارەوە بڵاوكرابوویەوە و گومان دەكرا دەنگی جۆن جیهادیی بێت، بۆ ئەبوقەتادە دەنێرێت و دەپرسێت كە ئەم دەنگە شۆفێرەكەی ئێمەی بەبیر ناهێنێتەوە؟ یەك\ كورت و پوختیی وەڵام دەداتەوە:

"نەخێر"

فریدریك دووبارە دەپرسێت دڵنیای؟

ئەبوقەتادە وەڵام دەداتەوە: بێگومان...

## ڕوونکردنەوەی وێنە و بەڵگەنامەکان

وەرگێڕانی (زەمانەتنامەکەی داعش)

دەوڵەتی ئیسلامیی
بەناوی خوای دەهەندە و دلۆڤان

سوپاس و ستایش بۆ خوای جیهانەکان. درود و سەلامی خوا بڕژێ بەسەر پێشەوای تێکۆشەران پێغەمبەری ئێمە محەمەد (درودی خوای لەسەر بێت) و بنەماڵە و هەموو هاوەڵەکانی...
پاشان..
ئەم نامەیە تایبەتە بە پاراستنی ڕۆژنامەنوسی ئەڵمانی (یورگن تۆدنهۆفەر)، کە لە ڕێگەیەوە دەتوانێت سەفەر بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی بکات و ماڵ و نەفس و هاوەڵەکانی پارێزراو دەبێت، لەسەر سەربازەکانی دەوڵەتی ئیسلامیش پێویستە پابەند بن بەم نامەیەوە و هیچ زیانێک بە مۆڵەتپێدراو و هاوەڵەکانی نەگەیەنن تا ئەودەمەی ناوبراو لێرە دەمێنێتەوە و کارەکانی ئەنجام دەدات و پاشان ئێرە بەجێ دەهێڵێت... خوا پاداشتی خێرتان بداتەوە.

٢٠ ذي الحجة ١٤٣٥ ( ٢٠١٤/١٠/١٩)
نووسینگەی خەلیفە
مۆری خەلیفە

زەمانەتنامەکەی داعش بۆ تۆدنهۆفەر

الدولة الإسلامية

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله ربّ العالمين والصلاة والسلام على إمام المجاهدين نبينا محمّد وعلى آله وصحبه أجمعين...

وبعد:

فهذا كتاب أمانٍ للصحفي الألماني المدعو (يورغن تودن هوفر) يدخل فيه أراضي الدّولة الإسلاميّة آمناً على نفسه وماله مع الوفد المرافق له، فعلى جنود الدّولة الإسلامية الالتزام بهذا الأمان وعدم التّعرض للمستأمن ومن معه لحين إنهاء مهمّتهم وبلوغهم مأمنهم... وجزاكم الله خيراً.

٢٥/ ذو الحجة/ ١٤٣٥

خليفة

ديوان الخليفة

# وێنەکان



یەکەمین هەنگاوەکانمان لەنێو دەوڵەتی ئیسلامیی، لەپشت درەختەکانەوە قاچاغچییەکی زۆر چاوەڕوانن تا من و هاوڕێکانم بپەڕێننەوە.



چەکدارێکی داعش پشتوێنێکی خۆتەقاندنەوەی لە خۆی بەستووە، ئەم پشتێنە دواچەکی داعشەکانە لە بەرەی شەڕکردندا.



چەکداریکی نویی داعش لە کەمپی تازەهاتووەکان.



ئالا رەشەکەی داعش لەسەر خاکی سووریا. لەم ناوچانە یەک وینەی بەشار ئەسەد سەرکوماری سووریا بەرچاو ناکەویت.



فڕۆکەیەکی سووریی کە لەلایەن هێزەکانی داعشەوە خراوەتە خوارەوە. ئاڵا ڕەشەکەی داعشی لەسەر هەڵکراوە و دەشەکێتەوە.




دەروازەی موسڵ، ٥٠٠٠ چەکداری داعش کۆنترۆڵی ئەم شارە دوو ملیۆن کەسییەیان بەدەستە.



له دوکانی بلاوکراوەکانی داعش له موسل ئەم نامیلکانه دانرابوون: چۆن لەگەل کەنیزەکەکان رەفتار بکریت؟ چون ببیته سەربازیکی باش بۆ داعش؟



پولیسی ئەمر بەچاکەی داعش، که سەرگەرمی گەشتی شەوانەی خۆیانن له موسل.



چاوپێکەوتنێک لە درەنگانی شەو لە یەکێک لە شەقامە قەرەباڵغەکان لە ناوەندی شاری موسڵ. ئەو کەسەی سەروچاوی داپۆشیوە کەسێکی ئەورووپییە. پێش ئەوە ماسکی ئیسکی لەسەر کردووە.




لە پێش دەرگای نەخۆشخانەکەی موسڵ هێزەکانی داعش پێشوازیمان لێ دەکەن. وەک دەوڵەتێک، داعش کۆنترۆڵی هەموو نەخۆشخانەکانی لەژێر دەستدایە.



یەکێک لە چەکدارە بریندارەکانی داعش دەیەوێت تەوقەمان لەگەڵ بکات، منداڵیک بە کڵاویکی داعشیی و تیشیرتێکی تیپی ئایسی میلان لە کەناری ڕاوەستاوە.



ئەو چەکدارە داعشەی لاقێکی بڕاوە و چاوەڕێی ئەندامی دەستکردە، دەڵێت:(هەر ئەوەندەی بکەومە سەر پێ، تا دوا هەناسە شەڕ دەکەم!)



زۆر سەیرە، پزیشکی نەخۆشخانەکە بە ئەڵمانی قسە دەکات. لە ترسی ئەوەی سەرێشە بۆ خێزانەکەی دروست نەبێت، ماسکێکی لەسەر کردووە.




لە مزگەوتی گەورەی نورەدین، چوونەژوورەوەمان بۆ نێو مزگەوتەکە لێ قەدەغە دەکرێت، چونکە ئێمە موسڵمان نین.



منارەی(الحبنا)لارترە لە بورجی پیزا. ئیستا ئالای داعش لەسەری هەلکراوە.



ئەو کاتەی ئیمە چوونەژوورەوەمان لی قەدەغە کرا، یەکیک لە چەکدارەکان چووە نیو مزگەوتەکەوە و وینەی بو گرتین.




لەسەر تابلۆی رەشی مارسیدسەکە دروشمی داعش بەرچاو دەکەویت، نووسراوە: دەوڵەتی خەلافەتی ئیسلامیی.



کاتێک منداڵەکە وا دەزانێت من لوتیم هەڵکەندوە، بە سەرسامییەوە دەست بۆ لوتی خۆی دەبات.




دوکانێکی میوەفرۆشتن، ژیان بەشێوەیەکی سادە دەگوزەرێت.




تەنانەت لەنێو دەوڵەتی ئیسلامیشدا ئێف، سی، بایرن مونشن هاندەری هەیە.
ئێمە بە بینینی دریسی ڕیبێری خۆشحاڵ دەبین.



پۆلیســەکانی هــاتوچوی داعــش لە موســڵ بە کڵاشــینکۆفەوە کــۆنترۆڵی هاموشۆی خەڵک دەکەن.



منــداڵێکی ١٥ ســاڵان وەک پولیســێکی داعــش کــار دەکــات:(ئێمە لێــرەین تــا هاوکاری بکەین.)




ئەندامانی هێزێکی پۆلیسی داعش:(ئێمە دەمانەوێت خەڵک ببینێت کە لێرە ئەمن و ئاسایش بەرقەرارە.)






میردمنداڵێک وەک پۆلیسێکی داعش کار دەکات.



پۆلیسی هاتوچۆی داعش، داعشەکان لە هەموو شوێن و قوژبنێک دەیانەوێت خۆیان دەربخەن.



بەڕێوەبەری پۆلیسی موسڵ بۆچوونی وایە: دوای چەندین ساڵ لە کێشمەکێش و پشێویی، ئێستا ئێمە زۆر خۆشویستین.



پیرەپیاوێک لە زیندان: تاوانەکەی هەڵگرتنی بڕێکی زۆر حەبی خەو و دژە خەمۆکیی بووە.

